# خەدیجەی مەزن

# و چوار کچەکەی

زەینەب

ڕوقییە

ئوم کەلسوم

فاتیمەی زەهرا

ئامادەکردنی

عبداللە ابراهیم مەلا عبداللە هەرشەمی

التفسير



# خەدیجەی مەزن و

# چوار کچەکەی:

زەینـــــەب

ڕوقییـــــــە

ئـــوم کەلـــسوم

فاتیمـــەی زەهــراء

# خەدیجەی مەزن و چوار کچەکەی

زەینــــــەب

ڕوقییـــــــه

ئــوم کەلــسوم

فاتیمەی زەهراء

ئامادەکردنی

عبدالله ابراهیم مەلا عبدالله هەرشەمی



ناوی کتێب: خەدیجەی مەزن و چوار کچەکەی

ئامادەکردنی: عبدالله ابراهیم مەلا عبدالله

نەخشەسازیی: کۆمپیوتەری هیوا

خەت: نەوزاد کۆیی

بەرگ: أمین مخلص

نۆرە و ساڵی چاپ: یەکەم ١٤٣٣ك – ٢٠١٢ز

تیراژ: ١٥٠٠ دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان

ژمارەی سپاردنی ( ١١١٠ ) ساڵی ٢٠١١ پێدراوە





# پێشەکی

خەدیجە(خودالێیڕازیبێت)، پێش هاتنی ئایینی پیرۆزی ئیسلام نازناوی پاکیزەبوو، بێگومان ئەوکاتە عەرەبەکان لەناو دەریای ستەم و ڕەفتاری ناشیرین و قێزەون و ناڕێکدا مەلەیان دەکرد، کەچی ئەم شاژنە داوێن پاكو ڕەوشت بەرزو دەروون پاکبووبوێرای ئەمەش هۆشمەندو ژیرو لێهاتوبوو، هەمیشە پلان وسەرنج و بۆچوونەکانی بەتایبەتی لەبواری بازرگانیەتیدا زیرەکانەو سەرکەوتوبو، بلیمەتی و زیرەکیەکەی بەجۆرێکبوو، کاتێ سەرنجی دایە خووڕەوشت و هەڵسوکەوتی موحەممەد(درودی خودای لەسەربێت)، زوو زانی ئەو زاتە پیاوێکی ئاسایی نیە، بەڵکو ئەمە ئەو پێغەمبەرە چاوەڕوان کراوەیە خەڵك باسی دەکەن و دەڵێن خەریکە بەم زووانە پیاوێك لە نیمچە دوورگەی عەرەبی دەبێتە پێغەمبەر، بۆیە خۆی و ماڵ و سامانی لەپێناو ئەم پیاوەو بڵاوکردنەوەی ئایینەکەی بەخت کرد، یەکەم کەس بوو لە ژنان باوەڕی بە موحەممەد (درودی خودای لەسەربێت) پێغەمبەرو هاوسەری هێنا، هەمیشە پشتیوانێکی بەهێزو توانابوو بۆ پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت)، تا ئەو لەژیاندابوو پێغەمبەر(درودی خوای لەسەربێت)خەفەت و پەژارەو دەردەسەری تەنیا تادەرگای ماڵەکەیان لەگەڵیدابوو، چونکە کاتێ پێی دەنایە دەرگای ماڵەکەی و

دەچووە ژوورەوە خەدیجە(خودا لێیڕازیبێت) بەقسەی خۆش و بەڕوویکی گەش و پڕ لەخەنـدەو پێکـەنین و بـەباوەڕێکی تۆکمـەو پـڕ لـە وورەوە پێـشوازی دەکـرد، ئـیتر هەموو ئـازارو مەینەتیـەکانی لـە بیر دەبـردەوە، هـەروەها چوار کچەکەی، زەینـەب، ڕوقییـە، ئومکەلـسوم، فاتیمـە، وێـڕای دایکیـان لەسـەرەتای سـەرهەڵدان و هـاتنی ئـایینی پیرۆزی ئیسلامدا باوەڕیان هێنا، دەرەنجام تووشی چەندین قـەیران و کێـشەو گرفتـی مەزن هاتوون لەپێناو ئەم ئایینە پیرۆزەدا.

ئیتر بۆ پتر ئاشنابوون بەژیانی پڕ لەناسۆر و نەهامـەتی ئـەو خانمـە بەڕێزانـە، دوو کتێبم دەربارەی ژیاننامەیان بەدەستکاریەوە لە زمانی عەرەبیـەوە وەرگێڕاوەتـە سەر زمانی شیرینی کوردی و لەناو یەك بەرگدا کۆمکردوونەتەوە، ئەم دوو کتێبـەش ئەمانەن :

١ـ خدیجە بنت خویلد، لەدانانی هەردوو مامۆستایان(عەبدولسەلام ئەلعوشری و موحەممەد عەبدولغەنی حەسەن ) ە لە وڵاتی میسر بەچاپ گەیاندراوە.

٢ـ بنات النبی، لـەدانانی(دکتـۆرە عائیـشە عەبدولڕەحمانـە)مامۆسـتای خوێنـدنی بـاڵای قورئانـە لـەزانکۆی ئـوم ئـەلقورەویین لـەوڵاتی مـەغریبی عـەرەبی، لـەلوبنان لەساڵی ١٩٧٩ چاپ کراوە.

ئیتر باتاوێك بـچینە خزمـەتیان وگەشـتێك بـەناو خاڵە دیارەکـان و شـاراوەکانی ژیانیاندا بکەین، بزانین سەرگوزشتە و بەسەرهاتی ژیانیان چۆن بووە .

عەبدوڵلا ئیبراهیم هەرشەمی

٢٠٠٩/٥/٢

## یەکەم

## دایکی بڕواداران
# خەدیجەی کچی خوەیلد
## خودا لێیڕازیبێت



# کچە بەسۆز و نەشمیلەکە

خەدیجە کچێکی نەشمیل و نێسك سووکبوو، سەرجەم خزم و دۆست و ناسیاوان خۆشیاندەویست، بەتایبەتی هەژاران و نەداران و کەنیزەکانی ماڵی باوکی، لەسایەی سۆز و هەستی ناسکی ئەم کچە خۆشی و شادی و کامەرانی باڵی بەسەر ماڵی خومیلدی باوکیدا خشاندبوو، بایەخێکی زۆری بەمیوانانەدەدا و ڕێزی تایبەتی بۆ دەنواندن، بۆیە خەڵك هەمیشە بەچاوی پڕ لەڕێزو خۆشەویستی سەیری ئەم کچەیان دەکرد، تەنانەت دەستوپێوەندو کەنیزەو کارکەرانی ماڵی باوکی لەئاست ئەم سۆزو خۆشەویستیەی خەدیجە بۆی دەنواندن، هەمیشە ئاواتەخوازبوون فەرمان و داخوازیەکانی ئەو زووبەزوو جێبەجێ بکەن.

خانەوادەی خەدیجە لە بنەماڵەیەك و ڕەچەڵەکێکی کۆن و ناسراو و شکۆمەندی شاری مەککە بوون، خومیلدی باوکی یەکێکبوو لەپیاو ماقوڵانی قوڕەیش، خاوەن دەسەڵات و پلەو پایەبوو، ڕیش سپی بنەماڵەکەی خۆیانبوو، خزم و کەسوکاری گوێڕایەڵی بوون و لەژێر فەرمانیدا بوون و هەمیشە پشتیوانی بوون.

سەرەڕای ئەوەش بە پیاوێکی زۆر بەسۆزو بەزەیی ناسراوبوو، بەتایبەتی بۆ نەدارانو هەژاران، بۆیە ماڵەکەی هەمیشە شوێنی حەوانەوەو دالدەدانی بێنەوایان و کەم دەرامەتانبوو، ئالەم ماڵە مەزنەو دەرگا کراوەو فراوانەدا، خەدیجەخانی کچیان لەسەر بنەمای بەخشین و دڵ فراوانی گەشەی کردو پەروەدەبو، بە دەوڵەمەندی لووت بەرز و لەخۆبایی نەبوو بوو، بەڵکو هەستێکی سەیرو نامۆی هەبوو سەبارەت بەماڵ و سامان، پێیوابوو ئەم بەخششە و ژیانەی هەیانە، پێویستی بە سوپاس کردن هەیە بۆ ئەو پەروەردگارەی ئەم ژیانە و گوزەرانەی پێ بەخشیوون، بۆیە هەمیشە یارمەتی نەدارانی دەدا، تەنانەت هەرکەسێك بهاتبایە دەرگاکەیان بێ ئومێدی نەدەکردو یارمەتی دەدا، زۆر حەزی بە هاتنی هەژاران دەکرد، بۆیە خومیلد

خۆشەویستییەکی بێپایان و تایبەتی بۆ ئەم کچە هەبوو، سەرەڕای ئەوەش کچێکی زیرەك و تێگەیشتوبو، فەرمانی باوکی جێبەجێ دەکردو کارەکانی خۆی بەشێوەکی سەرکەوتووانەو ڕێکوپێك بەڕێوەدەبرد، ئەمەش هۆکارێکی تری پەرەسەندنی خۆشەویستیەکەی بوو لەدڵی باوکیدا، ئیتر ئەم کچە نەشمیلە جێگای خۆی لەسەر تەختی دڵی باوکیدا کردبوەوە.

بۆیە کاتێ خەدیجە بەگورج و گۆڵی کارەکانی ڕادەپەڕاند و چالاکانە لە ناو ماڵدا دەهات و دەچوو، سەرنجی خومیلدی باوکی ڕادەکێشا، لە دڵی خۆیدا دەیگوت چۆن خەدیجە وەك شادەمارەکانی خوێنبەری لەش ئاسا شادی و کامەرانی بەناوماڵەکە بڵاو دەکاتەوە، ئیتر لەخۆشیانا بزەیەك بەسەر لێوی خومیلدا دەهات، دوایی دەیگوت چەند ستەمکارن ئەوانەی ڕقیان لەکچ دەبێتەوە، بۆچی ئەوەندە دڵڕەقن لەئاست کچان؟ ئایا ئەوانیش وەکو خەدیجە نین؟، چۆن گوڵ ئاسا جوانی و بەختەوەری بەم ماڵە بەخشیوە، بەڵکو بووەتە مایەی کامەرانی خێزانەکەمان.

چەندین کەس ئاواتەخوازبوون ببنە هاوسەری ئەم کچە جوان و خانەدان و دەوڵەمەندە، تەنانەت ڕۆژێکیان باوکی بانگی خەدیجەی کرد، بۆ مەبەستی ڕاوەرگرتنی سەبارەت بەم گەنج و کوڕوکاڵانەی ڕۆژانە خوازبێنی دەکەن، بەڵام لەبەرئەوەی کچە ئەوەندە شەرمن بوو، بۆیە باوکی نەیتوانی ڕاستەوخۆ لە دەرگای دڵی بدات و ڕای وەربگرێت.

ئەگەرچی خەدیجەش ناوەناوە لەڕێگای کەنیزەو کارکەرو دراوسێ و دەستە خوشکانی بەچپە هەندێ باسوخواسی بەبن گوێدا دەهات، دەیزانی چەندین لەکوڕە دەوڵەمەندەکان و خاوەن جێگاو ڕێگای بەرزو ناودار هاتوونەتە خوازبێنی، بەڵام شەرم وئابڕوو ڕێگربوون لە بایەخدانی بەم بابەتە، بۆیە هەرگیز خۆی پێوە سەرقاڵ نەدەکرد، وێڕای ئەوەش دڵنیابوو کەباوکی هەمیشە بەرژەوەندی ئەوی دەوێت و پیاوێکی شیاوو گونجاوی لەئاستی خۆی بۆ هەڵدەبژێرێت، چونکە زۆر جار

کاتێ باوکی باسی هاوسەرگیری و پیاوانی بکردبوایە، باسی هاوسەری باش و کردەوەچاك و خەسڵەتی پیاوانە و ڕەفتاری بەرزو جوانی دەکرد.

جگە لەوەش باوکی پیاوێکی زیرەك و دانابوو، هەموو کارو ڕەفتارێکی خەڵکی هەڵدەسەنگاند و لێکدانەوەی بۆ دەکرد، تا لەمیانەی هەڵسوکەوت و ڕەفتاریان زیاتر شارەزایان بێت و پتر ئاشنایان بێت ، زۆر جار باوکی دەیگوت پەیوەندی پیاوان لەگەڵ خەڵك و دەوروبەری وێنەیەکە لە پەیوەندی لەگەڵ ئەندامانی خێزانەکەی، چونکە ئەوەی باش بێت، دڵ و دەروونی چاك بێت، بێگومان ئەم جۆرە کەسە لە هەموو بارووداۆخێکدا هەرگیز ناگۆڕێت.

ئێوارەیەك کۆمەڵێ پیاوانی ( بەنی مەخزوم ) میوانی ماڵی خوەیلد بوون، تا درەنگی شەو دانیشتن، دوای ڕۆیشتنیان خوەیلد چووە ژووری تایبەتی خۆی هەندێ وتووێژی لەگەڵ فاتیمە کرد، پاشان بەیەکەوە هاتنەدەرەوە لە ڕەنگ و ڕوخساریان نهێنییێك بەدیدەکرا، هەروەها لەبزەی سەر لێویان ڕەزامەندی ئاشکراو دیاربوو، هۆڵێکی گەورە لە ناوەڕاستی ماڵەکەیان بوو، مافوورێکی نەخشین و ئەستووری تێدا ڕاخسترابوو، خوەیلد لەسەر مافوورەکە پاڵکەوت و فاتیمەی هاوسەریشی بالیفێکی بەئاوریشم نەخشێندراوی خستە ژێر شانیەوە، خۆیشی لەتەنیشتیەوە دانیشت، پاشان هەردووکیان بانگی خەدیجەیان کرد، خەدیجە بەخێرایی و بەشەرمەوە چوو لەپێش باوکی وەستا، سەری دانەواندو سەیری نەخشی مافوورەکەی دەکرد، باوکی بەخەندەوە سەیری کردو پێیگوت؛

کچم دانیشە، دەمەوێ پرسیارێکی تایبەتت لێبکەم، تا بزانم ڕات چیە؟، بۆیە دەبێ بەڕاشکاوانە وەڵامم بدەیتەوە.

خەدیجە لەبەردەم باوك و دایکی دانیشت.

خوەیلد سەیری خەدیجەی کردو بەدەنگێکی هێمن و پڕ لەسۆزەوە گوتی:

بەڕای تۆ ئەم کاروانەی بۆ شام ئامادەمان کردوە چۆنە؟.

کچە بەشەرمەوە گوتی:

پێموایە کاروانێکی سەرکەوتوو دەبێت، چونکە کاڵاو کەلوپەلەکانی لە وڵاتی شام بەهادارن و خەڵکی ئەم وڵاتە ئارەزووی دەکەن.

باوکی گوتی:

ئەی سەبارەت بە کرێکارو پیاوەکان ڕات چۆنە؟ ئایا پێتوایـە لـەکاری بازرگانیـدا لێزانو شارەزان؟.

کچە هەندێ سەرسامی لەڕوخساریەوە دیاربوو، گوتی:

هـەموویان کەسـانی لێـزانن و کارامـەن، شـارەزاییان لـەم بـوارەدا هەیـە، وێـڕای ئەوەش جێگای متمانەن و لە کارەکانیاندا دڵسۆزن.

خوەیلد سەیری فاتیمەی کرد، پاشان بە بزەیەکەوە سەیری خەدیجەی کـردەوەو گوتی:

پێتوایە ئەمڕۆ لەشاری مەککەدا کێ بازرگانێکی لێهاتو و بەتواناو لێزانە؟.

کچە ناوی چەند بازرگانێکی ناوداری هێناودوایی بێدەنگبوو.

باوکی سەیرێکی دایکی کرد، دوایی بەهێمنی گوتی:

ئەی خەدیجە سەبارەت بە عەتیقی کوری عابد ڕات چیە؟، پێتوایـە بازرگـانێکی چۆنە؟. لەوەڵامدا گوتی:

پیـاوێکی شـارەزاو کارایـە لـەبواری بازرگانیـدا، بگـرە لەهـەموو پیـاوانی بـەنی مەخزوم شارەزاترە، هەروەها دەوڵەمەندە هەمیشە هەوڵـدەدات سوودو سـامانی پـتر بەدەست بێنێت، سـەرەڕای ئـەوەش پیـاوێکی ئـازاو بـوێرو دڵفراوانـە، لای سـەرجەم دۆست و خزمانی ڕێزدارو خۆشەویستە، بەڵام باوکە بـۆ ئـەو پرسـیارەم لێدەکـەیت؟، ئایـا دەتـەوێ جڵـەوی کـاروانی بازرگـانی ئـەمجارەمان ڕادەسـتی عـەتیق بکـەیت و بەوبسپێریت؟.

خوەیلد بێدەنگبوو، بەووردی سەیری کچەکەی کرد، دوایی گوتی:



نەخێر، بەڵکو دەمەوێ کارێکی لەوە مەزنتری پێ بسپێرم، شتێکی بەهادارو بێ هاوتای لادادەنێم، ئەم شتە بەماڵ و سامان بەهاکەی مەزەندە ناکرێت، ئالێرەدا کچە بیری بۆ هەمووڵایەك و بۆچوونێك چوو، میوانەکانی بیرکەوتەوە،وێڕای ئەوەش لەقسەکانی باوکی و دایکی، لەم شەونخوونیەیان تا درەنگی شەو، تێگەیشت و زانی چۆن هەموو کچێك ئەوە دەزانێت مەبەستی باوك لەم جۆرە گفتوگۆیەدا چیە، ئیتر لە شەرمان ڕەنگی سوور هەڵگەڕا، سەری دانەواندو بێ دەنگبوو، نەقسەی کردو نەوەڵامی دایەوە.

دایکی بێ دەنگیەکەی بڕی و بەخەندەیەکی شیرینەوە گوتی:

خەدیجە ڕات چیە، پێمان بڵێ، عەتیق پیاوێکی چۆنە؟.

کچە ڕەنگی پتر سوور هەڵگەڕا، سەری بەرز نەکردەوە و جوولەی نەکرد، پاش ماوەیەك خەریکبوو بێتە ئاخاوتن وقسەبکات، بەڵام وشەکان لە دەمیدا خنکان و دەرنەچوونە دەرەوە، باوك و دایکیشی سەیریان دەکردو چاوەڕوانی وەڵامی ئەوبوون، کاتێکی زۆری خایاند کچە هەر بێ دەنگبوو، بەڵام باوکی پرسیارەکەی دووبارە کردەوە.

خەدیجە ئەمجارەیان هەموو هێزو توانای خۆی کۆکردەوە، لەکۆتاییدا توانی بەدەنگێکی کزو لاوازو باریك و پڕلەشەرمەوە بڵێ:

ئایا دوای ڕای باوکم هیچ بۆچوون و ڕاییێکی تر هەیە؟.

کاتێ باوکی گوێی لەم وەڵامەبوو، هەڵسایەوە نێوچاوانی ماچکرد و بەسۆزەوە گوتی:

من عەتیقم هەڵبژاردووەو پێم پەسندە بۆ تۆ، ئێوە بۆ یەکتری شیاوون، داواکارم خودا ئەم پەیوەندیەتان پیرۆز بکات، هیوادارم عەتیق بەگوێرەی گومانی من بێت، پشت بەخودا هەرواش دەبێت.

دوای ئەوە دایکی چەندجار گۆنای ماچکرد، پاشان ئاوڕی دایەوە لە خومیلدی

هاوسەری گوتی:

بەڵام نابێ پەلە بکەن لەگواستنەوەی، پێویستە دەرفەت و ماوەیەکی زۆرمان پێبدەن تابتوانین وەکو خەڵکی تر و وەکو دەستە خوشکەکانی کەلوپەلی ناوماڵ و جیازەکەی بۆ ئامادەبکەین.

خومیلد لەوەڵامدا گوتی:

هەوڵدەدەم ماوەی مانگێک تا دوومانگ چاوەڕوان بن و ڕاوەستن، تاوەکو کاروانەکان لەیەمەن وشام دەگەڕێنەوە، هەرچەندە کۆگاکانیشمان پڕن لەکاڵاو کەلوپەل، بەڵام سەیرکەو بزانە چیتان دەوێ بە کاروانچیەکانمان بڵێ تا بۆتان بێنن، چۆنکە ئێمە هەموو سامانمان پێشکەشە بەخەدیجە.

پاش ئەوە بە پێکەنینەوە گوتی:

بەڵام من ناتوانم لەوەپتر دوای بخەم.

فاتیمەش پێکەنی، کچەش سەری کوڵمەی سوور هەڵگەڕا، دوای ئەوە هەریەک بەرەو جێگای خۆیان ڕۆیشتن، باوک و دایکی بیریان لە دوارۆژی کچەکەیان دەکردەوە، چۆن ڕووبەڕووی ژیانێکی نوێ دەبێتەوەو دەچێتە ماڵێکی نوێ و جێگاو ڕێگایەکی تر، بێگومان زۆر جیاوازە لەوشوێنەی تێیدا ڕاهاتووەو پەروەردەبووەو گەشەی کردوە، کچەش وێڕای ئەوان بیری لە هاوسەرو هاوبەشی ژیانی داهاتووی دەکردەو

# بووك گواستنەوە

بازرگانان لەیەمەن و شام گەڕانەوە، ئەو کەلوپەلانەی خومیلد و عەتیق بۆ خەدیجەیان بەڕادان دابوو کە بریتیبوون لەچەندین پۆشاك و جل و بەرگ و بۆن و بەرام و پێداویستی ناوماڵی گرانبەهاو نایاب گەیشتەجێ.

ئیتر سەرجەم خەڵکی شاری مەککە، بەهەموو چین و توێژێکەوە، چاوەڕوانی ڕۆژی بووك گواستنەوەبوون، هەژاران و نەداران بەپەلەبوون بۆ هاتنی ئەم ڕۆژە، چونکە چەند ئاژەڵی جۆراوجۆری تێدا سەر دەبڕاو گۆشتێکی زۆریان بەردەکەوت، چێشتێکی چاك و زۆریان دەخواردو بەشی ماڵ و منداڵەکانیشیان دەبردەوە.

هەروەها لاوان چاوەڕوانی ئەم ڕۆژەیان دەکرد، چونکە لەم ڕۆژەدا چەندین یاری و پاڵەوانێتی جۆراوجۆر ئەنجامدەدرا، هەمیشە شمشێرو تیرو ڕم لە ئاهەنگی بووك گواستنەوەدا دەهاتنە سەما، کێبڕکێی زۆران بازی و ڕمبازی لەنێوان گەنجان و لاواندا سازدەکرا، هەریەکە ئازایەتی و سوار چاکی و لێهاتوویی خۆی لەم ڕۆژەدا نمایش دەکرد و دەنواند.

دەوڵەمەندەکان لەشەوی ئاهەنگدا، لە ئێوارەوە بەدەم خواردنەوەو گۆرانیدا دادەنیشتن و شەونخوونیان دەکرد تا بەیانی، پێیانوابوو بەم کارەیان لەناخەوە گوزارش لە هەست و نەستی شادی و کامەرانی خۆیان لەم بۆنەیەدا دەردەبڕن، تەنانەت پیاوانی پیرو بەساڵاچووش خۆیان بە قەرزاری خومیلد دەزانی، چونکە ئەویش لەم جۆرە ئاهەنگەی منداڵەکانیان ئامادەبوبو، بۆیە دەبوایە ئەوانیش ئامادەبن.

بێگومان چۆن پیاوان چاوەڕوانی ڕۆژی ئاهەنگەکەبوون، ژنان بە گڕوتینێکی زیاترو بەدڵێکی پڕ لەجۆش و خرۆشەوە چاوەڕوانی ڕۆژی ئاهەنگەکەبوون، بەهادارترین و چاکترین و جوانترین جل وبەرگ و پۆشاکیان بۆ ئەم ڕۆژە ئامادەکردبوو، تا بەجوانترین و ڕازاوەترین شێوە بەدەربکەون و هەست بەکەموکوڕی نەکەن.

لەلایەکی تر فاتیمە سەرقاڵی ئامادەکردن و ڕێکخستنی کەلوپەل و پێداویستیەکانی ماڵی نوێی کچەکەی بووسەرجەم کەلوپەلەکان بەهادارو نایاب بوون، شایان بەکچی خومیلدی بازرگان و دەوڵەمەندی مەککە بوون، هیچ شتێکی

لەبیر نەچووبوو، نەوەك یەكێك بلێ جیازی خەدیجەی، یان ماڵەکەی کچی خومیلد لەئاست ماڵی دەستە خوشکەکانی نیەو بەهادارنیە.

خەدیجەش وەك هەر کچێك، بێگومان هەمیشە بیری لە ژیانی نوێ و ئایندەی دەکردەوە، ئاخۆ لەمەودوا چ ئەرکێکی قورسی دەکەوێتە سەرشان، بیری لە ناستەنگو گیرو گرفتەکانی ژیانی هاوسەرگیری و خێزانداری دەکردەوە، بەڵکو لە ئایندەدا خۆی لەم هەڵانەو گیرو گرفتانە دوورخاتەوە، تابتوانێت لە میانەی ئەوەدا ڕێگایەکی ڕاست و دروست بگرێتەبەر، بۆ بەدیهێنان ودابین کردنی ژیانێکی هاوسەری ئاسوودەو بەختەوەر، کاتێ سەیری خان و تەلاری ماڵی باوکی دەکرد، یەکسەر ماڵە نوێیەکەی خۆی دەهاتە پێشچاو، کە هێشتا هیچ شارەزاییەکی دەربارەی نەبوو، تەنانەت نازانێت ئایندەی چۆن دەبێت، بەڵام وێڕای ئەمەش لەدڵی خۆیدا دەیگوت:

بۆ لە هاوسەرگیری بترسم، ئەی مانای بەیەکەوە ژیان نیە؟، ئەگەر من بۆ هاوسەرەکەم ببم بەکەنیزە و نۆکەر، بەنەرمونیانی و هێمنی ڕەفتاری لەگەڵدا بکەم، گوێڕایەڵ و ملکەچی فەرمانەکانی ئەوبم، دەرئەنجام بەم ڕەفتارەم دەتوانم بیکەمە بەندەی خۆم، ڕێزی خزم و کەسوکاری دەگرم، ماڵ و سامانی دەپارێزم، هەمیشە ژیانێکی ئاسوودەو بەختەوەرو پڕ لەشادی و کامەرانی بۆ فەراهەم دەکەم.

ناوەناوە چەندین ژیانی هاوسەرێتی سەرنەکەوتووی بیردەکەوتەوە، خەریکبوو گومان لەدڵدا پەیدابکات، بەڵام دوایی دەیگوت:

دیارە ئەم ژنانە هۆشمەند نەبووینە، بۆیە نەیانتوانیوە دڵی هاوسەرەکانیان بلاوێننەوە و بەختەوەریان بکەن، تەنانەت نەیانزانیوە بۆچی شوویان کردوە.

جگە لەوەش دایکی هەمیشە بەئامۆژگاریەوە باسی ئەرکەکانی ژنانی بۆ دەکرد، تەنانەت کچەکەی بۆ دواڕۆژ شارەزابێت چی بکات و چی نەکات، کچەش بەوتەکانی دایکی دڵی ئۆقرەترو ئارام تر دەبوو، چونکە ئەوەی ئەو بۆی باس دەکرد، ئەمیش

ئـەوەی بـۆ خـۆی دانـابوو، بۆیـە بـە ئامۆژگاریـەکانی دایکـی وورەی بـەرزتر دەبـوو، دەیگوت دیارە شارەزاییم هەیەو دەزانم.

ئیتر لەڕۆژی بووك گواستنەوەدا چەندین ئاژەڵی جۆراجۆر کوژرایـەوە، زۆربـەی خەڵکی مەککە بانگ کرابوون بۆ سەر خوانی ماڵی خومیلد، پۆڵ پـۆڵ کچان و ژنـانی خزم، دەستەخوشکان، ناسیاوان، ڕویان لەماڵی خومیلـد کـرد، وێـڕای ئـەوانیش ژنـانی بەنی مەخزوم چەندین دیاری و کەلوپەلی گرانبەهایان لەگـەڵ خۆیـان هێنـاو بـەرەو ماڵی خومیلد هاتن.

گـۆرانی بێـژان بـەدەنگی ناسـك و زوڵاڵیـان گۆرانیـان دەگـوت، لـە لایـەکی تـر کۆمـەڵێك ژنـی کارامـەو لێـزان شـانەیان بەدەسـتەوەبوو، لـە چـواردەوری بـووك کۆببوونەوە بەجوانترین شێوە جوانکاریان بۆ دەکرد و ئارایشیان دەکرد.

ئەم ڕۆژە کەشوهەوای مەککە لەباربوو، شنەبایێکی فێنك هەڵیکردبوو، جموجۆل و هاتووچۆ لەماڵی خومیلدوەو بۆ ئـەویش تـا ئێـوارە بـەردەوامبوو، دوای خۆرئـاوابوون پیاوان بەچواردەوری ( کەعبە ) دا سوڕانەوە و دەستیان کرد بە نزاو پاڕانەوە.

لـە لایـەکی تـر ناوەنـاوە دەنگـی چـریکەی(هەلهەلـەی)ژنـان لـەماڵی خومیلـدەوە تێکەڵاو بەخۆشترین ئاوازو گۆرانی و چەپڵەڕێزان دەبوو، کزەبای ئێـوارەش بـە چـپە بە گوێی ئازیزان و دۆستانی دەگەیاند، شادی و خۆشی بەدڵ دەبەخشی.

پاش نانخواردن بەشێوەی بازنەیـەکی گـەورە هـەموویان دانیـشتن، لـەلای سـەروو سەرۆك و سەرکردەو ڕیشسپیان و پیاو مـاقوڵانبوون، دوای ئـەوان لـەلای خـوارەوە خـەڵکی تردانیشتن، پاڵەوانـەکان لەناوەڕاستی کۆڕەکـەدا بـەدوای یـەکتر دەسـوڕانەوە، گـەڵێك زۆران بـازی و جلیـت و تەقلـەبازی و گاڵتـەو یـاری و کێبڕکێیـان ئەنجامـدا، خـەڵکانیش چـەپڵەیان بۆسـەرکەوتوان لێـدەداو ئافـەرین و دەستخۆشـیان لێـدەکردن، ئەوانەی ژێرکەوتوو دۆڕاوبوون ڕاوەستابوون، ئارەقەی شەرمەزاریان ووشك دەکردەوە، چاویان بڕیبووە ئەوکەسانەی بۆیان نیگەرانبوون، خۆیـان ئامـادە دەکـردەوەو هێـزو

توانایان دەهێنایەوە بەرخۆیان بۆ هەڵێکیتر، بەڵکو بتـوانن شـەرمی بـەزین و شکست لەسەر ڕوویخۆیان لابەرن.

گـۆرانی بێـژان بـەدەنگی زوڵاڵ و خـۆش هەستونەسـتی خـەڵکانیان دەهێنایـە جۆش، بۆیە هەموویان هاتبوونە سەماو خـەریکی بـەزم و شـادیبوون، تـەنیا پیاوێك نەبێت کپوبێدەنگ بۆخـۆی لـەلایێك دانیـشتبوو، هەمیـشە سـەیری ئـەم لاو ئـەو لای دەکرد، بانگیـان دەکـرد بـۆ مـەی خواردنـەوە کەچـی ئـەم پیـاوە نەدەچـوو، تەنانـەت سەیری گۆرانی و هەڵپەرکێ و سەمای نەدەکردو گوێی بۆنـەدەگرت، لـەناکاو خوەیلد هەستا چووەلای پێیگوت:

وەرەقە تۆ دەزانی ئەم شەو شەوی شادیە، ئاهـەنگی خەدیجەی ئامۆزاتـە، بۆچـی لـەم شـادی و بەزمـەدا بەشـداریمان لەگـەڵ ناکـەیت، دەهەسـتە وەرە لێمـان نزیـك بەرەوەو بەشداریمان لەگەڵدابکە.

وەرەقەی کوڕی نەوفەل بەهێمنی و لەسەرخۆ گوتی:

مامی خۆم تۆ دەزانی من دوورم لەم جۆرە ئاهەنگە، چونکە ئەوەی ئێوە دەیکەن من حەزم لێینیە و ئارەزووی ئەمجۆرە گاڵتەو بەزمەم نیە.

یەکێك لەنزیك ئەو دانیشتبوو ئاوڕێکی لێدایەوە بەگاڵتەوە پێیگوت:

ئەرێ وەرەقە تۆ هێشتا لە سەر ئەم بیروڕایەیت؟ چاکتر وایە تـۆ کۆچـبکەیت لـە مەککە، چونکە من پێموایە تۆ چوویتە سەر ئاینێکی تر.

یەکێکی تر بە پێکەنینەوە گوتی:

وەرەقە وابزانم تۆ هەندێ ڕێچکەی ئاینی فارس و ڕۆمـەکانت گرتۆتەبـەر، بۆیـە باوەڕت بەخواکانی ئێمە نەماوە، بەڵام سەیرکە چۆن خواکانی ئێمـە لـە چواردەوری (کەعبـە) هێـت وەسـتاوون، هەمیـشە ئێمـەو کەعبـە دەپـارێزن، هـەروەها ئـازار و مەینەتیمان لەسەر لادەدەن و بەخشش و چاکەمان بەسەردا دەبارێنن، دوایـی دەنگـی پتر بەرزکردەوەو گوتی:

ئەی تۆ ئەم هەموو چاکە و بەخششی خوا بەهێزو تواناکانمان نابینیت، چۆن لەسایەی ئەواندا ئەم شەو لێرە کۆبووینەتەوە تا خەدیجە بۆ عەتیقی کوری عابد بگوازینەوە، ئەی نابینیت خواردن و خواردنەوەکانمان چەندە بەتام و چێژن؟، دیارە خواکان لەم ئاهەنگە خۆشەدا لەگەڵمان بەشدارن، دەتۆش وەرە واز لەم شتە پڕوپووچانە بێنە، وەرە تۆزێك بۆخۆت ڕابوێرەو بەشداریمان بکە لە خواردن و خواردنەوەدا ئەگینا ئەم خۆشی و شادی و ئەم تاموچێژەت لەدەست دەچێت.

یەکێکی تر گوتی:

وەرەقە دوای ئەوەی سەردانی گەلێ وڵاتت کرد، دەرئەنجام هەڵخەڵەتای و لەسەر ئاینی باوك و باپیرانت نەمای، چیە ئێستاش دەڵێی خەریکە ببیتە ڕەبەن؟ دەتەوێ ژیانی ئێمەش تێك بدەیت و لەخۆشی ژیان قەدەغەمان بکەیت؟.

ئیتر بەهۆی بیرو باوەڕی جیاو لادانی لە بتپەرستی زۆرکەس وەرەقەیان سەرکۆنەکرد، وەرەقەش بەبێدەنگی گوێی لە قسەکانیان گرتبوو، تەنانەت کۆتاییان بەقسەکانیان هێنا ئینجا بەدەنگێکی بەرز گوتی:

ئەگەر ئەمڕۆ ئێوە ئاوا گاڵتە بەمن دەکەن، ئەوا دڵنیابن سبەی پێغەمبەرێك لە نێو ئێوەدا سەرهەڵدەدات، بتەکانتان ووردو خاش دەکات،ڕێگای چەوتتان لێ قەدەغە دەکات، ئەوکاتە من گاڵتە بەئێوە دەکەم.

کاتێ گوێیان لەم ووتەیەبوو هەموویان لەقاقای پێکەنینیاندا، بەدەم پێکەنینەوە هەندێکیان گوتیان:

وەرەقە ئەو پێغەمبەرە کێیە، تۆی؟ یان ئەویش یەکێکی وەك تۆیەو ڕقی لە ئاینی باوك و باپیران دەبێتەوە؟.

ئیتر دەرفەتیان نەدا وەرەقە وەڵامیان بداتەوە، یەکێکی تر گوتی:

بۆ لەم وڵاتانەی ئەم بیرو باوەڕەیان تێدا هەبوو گەڕایتەوە، هەروەها چۆن بەم ئاینانە ڕازی بوویت، کە تێیان ناگەیت، وێڕای ئەمەش هەندێ لەم ئاینانە تائێستا



ناکۆکی زۆریان لەنێواندا هەیە، تەنانەت هیچ ڕێگا چارەیەکیان بۆ ئەم ناکۆکی و گرفتانە نەدۆزیوەتەوە.

قسەو دەمەتەقەی زۆر کرا، پاشان یەکێك پرسیاری کرد گوتی:

وەرەقە، ئەم پێغەمبەرە لەناو چ میللەتێك سەرهەڵدەدات؟، ئاینەکەی چیە؟.

وەرەقە خێرا بەدڵنیاییەوە گوتی:

هەموو ئەو کتێبانەی لە ئاسمان دابەزیوون. مزگێنی ئەم پێغەمبەرەیان بەخەڵکداوەو دەڵێن هاتنی نزیکبۆتەوەو لە نێو عەرەبەکاندا دەبێت.

یەکێك بەگاڵتەوە گوتی:

کەواتە وەرەقە تۆخۆت ئامادەبکە تاکو فریشتە بەسروش ئایینە نوێکەت بۆ بێنێت، هەروەك چۆن دەڵێی بەسەر پێغەمبەرەکەدا دادەبەزێت:

یەکێکی تر خێرا قۆزتیەوەو گوتی:

بەڵام ئاگاداربە ئەوکاتە ئێمە ڕێگات پێنادەین دەستدرێژی بکەیتە سەر خواکانمان، خەڵکی مەککە هەموومان دارکاریت دەکەین،ئیتر ئەوکاتە دەزانیت و دەبینی جێهێشتنی ئاینی باوکوباپیران ئاکامەکەی چۆنە.

یەکێك لەگەورە پیاوان هەڵسایە سەرپێ بەتوندی گوتی:

بیبڕنەوە بەم قسە پڕوپووچو بێ سوودانە دانیشتنی ئەمشەوتان لێتێکداین، هەروەها بەگۆرانی بێژەکانی گوت دەستکەن بەگۆرانی گوتن، ئیتر دەنگوئاوازیان تێکەڵ بەدەنگی دەف و تەپڵ و چەپڵەبوو دووبارە گەڕانەوە سەر بەزمی خۆیان.

عەبدوڵلای کوڕی عەبدولموتەلیب لەهەرەتی لاویەتیدابوو، پاش ژنهێنانی بەماوەیەکی کەم مردبوو، ئیتر لەدوای مردنی ئەم کوڕە عەبدولموتەلیبی باوکی گەورەپیاوی شاری مەککە بەشداری هیچ ئاهەنگێکی نەکردبوو، کەچی لەم ئاهەنگەدا بەشداربو، چونکە خوا لە بری کوڕە مردوەکەی کوڕێکی بە ئامینەی خێزانی عەبدوڵلا بەخشیبو ناویاننابو (موحەممەد)، بۆیە ئەم شەوە زۆر شادو

بەختەوەربوو، تەنانەت خەڵك لەم ئاهەنگەدا بەبۆنەی لەدایكبوونی موحەممەد پیرۆزباییان لە عەبدولموتەلیب دەكرد، دەیانگوت هیوادارین تەمەن درێژبێت و بژیت، تا ئەو ڕۆژەی ژن بۆ موحەممەدی كوڕی عەبدوللا دێنیت.

ئیتر دانیشتن و ئاهەنگ گێڕان و شەونخوونی بەردەوامبوو تا بەیانی، بووك گواسترایەوە بۆ ماڵی عەتیقی بەنی مەخزوم، لەگەڵ كازیوەی بەیان خەڵك هەریەكەو بۆماڵی خۆی چووەوە، بێگومان خەدیجەش بەهیواو ئومێدێكی زۆرەوە بۆ ئایندەو پاشەڕۆژی خۆی چووە ناو ماڵ و ژیانێكی نوێوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ترسێك لە دەروونیدا خۆی حەشاردابوو، پێیوابوو هەستێكی نهێنی لە ناخەوە گومان لە دوارۆژی دەكات.

خەدیجە لەسەرەتاو دەستپێكی ژیانی نوێیدا زۆر بەژیری و هۆشمەندی هەڵسوكەوتی لەگەڵ هاوسەرەكەی كرد، هەمیشە بەچاوی پڕ لەرێزو خۆشەویستی سەیری یەكتریان دەكرد، عەتیق لەسایەی سۆز و خۆشەویستی خەدیجەدا هەمیشە هەستی بە شادی و بەختەوەری و ئۆقرە و ئارامی دەكرد، بۆیە بەهەمان شێوە ئەویش دڵی خۆی بۆ ئەم كردەوەو لە هەموو كاروبارێكی خۆیدا ڕاوێژی بە خەدیجە دەكرد، ئیتر خەدیجەو عەتیق ببوون بە نموونەی هاوسەری ڕێكوپێك و خێزانی ئاسوودەو پڕ لەشادی و كامەرانی، هەرگیز دەنگی قڕەو بۆڵە لەماڵە خنجیلەكەیاندا نەدەبیسترا، چونكە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ خۆشەویستیان پەرەی دەسەندو ژیانیان ئاسوودەتر دەبوو.

خومیلد كاتێ سەردانی كچەكەی دەكرد، دەیبینی چۆن گوێڕایەڵی هاوسەرەكەیەتی و ماڵێكی ئارام و ڕێك و بەختەوەری هەیە، خەدیجەی بە كاراو لێهاتوو دەهاتە بەرچاو، كاتێ گوێی لە عەتیق دەگرت هەستی دەكرد چۆن خەدیجە دڵودەروونی داگیركردوەو جێگای خۆی لەسەر تەختی دڵی عەتیق كردۆتەوە، ئیتر زۆر شادو بەختەوەر دەبوو، بەسوپاسەوە ماڵئاوایی لێدەكردو جێیدەهێشت، فاتیمەی دایكیشی كاتێ دەیبینی كچەكەی وێڕای تەمەن بچووكی ئەوەندە زیرەك و لێهاتوە،

توانای هەیە دڵی باوك ودایکی و هاوسەرەکەی خۆشبکات و ببێتە نموونەی بەختەوەری لە شارەکەیاندا.

ساڵێك بەسەر ژیانی هاوسەرێیەتیان تێپەربوبو، کاتێ گزنگی خۆری شادی و کامەرانی پرشنگ و تیشکی هیواو ئاواتی بەم ماڵە بەختەوەرە بەخشی بەهاتنی کۆرپەلەو نۆبەرەی ژیانی هاوسەرایەتیان، چۆن کچێکی چاوگەش و خنجیلانە پەیوەندی خۆشەویستی بەهێزی ئەم خێزانەی تۆکمەترو بەهێزتر کرد، شێوەی زۆر لە خەدیجەی دایکی دەکرد، بۆیە عەتیقی باوکی تا ئەوپەڕی خۆشەویستی ئەم کچە نۆبەرەیەی خۆشویست .

# سەرەتای ژیانی ناسۆری

تەمەنی کچە نۆبەرەکەیان نزیکەی چوارمانگ دەبوو، کاتێ لەپڕ بای پایزی مەرگ هێلانە ئاسوودەو بەختەوەرەکەی هەژاند، بەرۆکی عەتیقی گرت و لە خانەوادەکەی دابڕاند، خۆشەویستی خەدیجەو کچەکەی لەگەڵ خۆیدا بردە ژێرگڵ، مردنی ناوەختی عەتیق کاریگەری زۆری هەبووئازارێکی زۆرو برینێکی یەکجار قوڵی لەدڵی خەدیجەدا جێهێشت، هێشتا خونچەی هیوای ژیانی تەواو نەپشکوتوبوو زوو هەڵوەری، بۆیە تووشی نائومێدی و خەفەت و بێ هیوایی بوو ، هەرچەندە عەتیق لەدوای خۆی ماڵ و سامانێکی زۆری بۆ دایك وکچە جێهێشت، بەڵام خەدیجە خۆشەویستی و سۆزو وەفای لەدەست دابوو، بۆیە هیچ شتێك لەدڵی ئەودا جێگای عەتیقی نەدەگرتەوە.

زۆربەی قورەیشیەکان بە پیاوو ژن باسی ماڵ و سامانی جێماوی عەتیقیان دەکرد، لەبەر ئەوە گەلێك لە پیاوان چاویان بڕیبووە جوانی و سامان و ڕەچەڵەکی ئەو ژنە، هەمیشە ئاواتەخوازبوون ببێتە هاوسەریان، ماوەیەکی کەم بەسەر مردنی عەتیق تێپەڕیبوو، ناوەناوە دەوڵەمەندەکان و پیاوماقوڵانی مەککە دەهاتنە لای خوەیلدی باوکی خوازبێنی خەدیجەیان دەکرد، خوەیلد حەزی دەکرد خەدیجە شوو

بکاتەوەو بەتەنیا نەمێنێتەوە، چونکە کاتێ کۆستی کەوت هێشتا لە سەرەتای ڕێگادا بوو ڕێگای ژیانی تەواو نەبڕیبو، بەڵام باوکی نەیدەتوانی پێیبڵێ و ڕازی دڵی خۆی بۆ بدرکێنێت، لە بەرئەوەی خەدیجە دڵ بریندارو زامدار بوو، تەنانەت فاتیمەی دایکی نەیدەتوانی بۆ ئەم مەبەستە بیدوێنێت وباسی داخوازیەکانی بۆ بکات، چونکە دەیزانی کچەکەی هێشتا پێویستی بەدڵ نەوایی و سەرەخۆشی کردنە نەك باسی شووکردنێکی تر، هەروەها دەیزانی خەدیجە نایەوێ شووبکاتەوە، بەڵکو دەیەوێ کچەکەی تەنیا لەباوەشی خۆیدا پەروەردەبێت و گەشەبکات نەك هەردووکیان بچنە باوەشی پیاوێکی نامۆ.

چەندین ڕۆژ ومانگ تێپەڕبوو، کەچی خەدیجەی کۆستکەوتو هەمیشە غەمگین و خەفەتباربوو، ژیانی لە بەر چاو تاڵ بوو، تاکە ڕۆشنایی ژیان و چاوی هیواو ئاواتی بڕیبوە کچەکەی، هەرگیز لەماڵ دەرنەدەچوو، بەشداری هیچ ئاهەنگێك و شادیێکی نەدەکرد، قوڵپی گریانی هەمیشە ئامادەبوو، تەنانەت گوێی لەهەواڵێکی ناخۆش و دڵ تەزێن ببوایە لە پرمەی گریانی دەدا، جگە لەمەش لەگەڵ هەر هەواڵێکی خۆش دڵتەنگ و نیگەران دەبوو، چونکە ڕۆژانی ڕابردووی بیردەکەوتەوە ئەوڕۆژانەی کە خەونێکبوون لەگەڵ عەتیقدا بۆ چەند چرکەیەك بەیەکەوە ژیان و دوایی بۆ هەتاهەتایە دەستبەرداری یەکتربوون و ماڵئاواییان لەیەکتری کرد.

خومیلد کاتێ کچەکەی بە پەرێشانی و نیگەرانی دەبینی، هەستی بریندار نەدەکرد، بەڵکو ویستی تاماوەیەك خەدیجە لەگەڵ خەم و خەفەتەکانی بژیت و بەتەنیا ژیان بباتەسەر، دوایی ڕۆژێکیان سەردانی کرد بەڵام ئەمجارەیان لە سەردانانەکانی پێشوو پتر لەلای مایەوە، دوای دانیشتنێکی زۆر، بەخەندە و ڕوێکی گەشەوە گوتی:

ئەرێ خەدیجە ئەم جلە ڕەشانەت تاکەی لەبەرناکیتەوە؟، کچەکەم ئەوا ماوەیەکی زۆر بەسەر مردنی عەتیقدا تێپەڕبوەتۆ هەمیشە بۆهاوسەرەکەت وەفاداربوویت بەزیندوویتی و دوای مردنی ڕێزت گرتووە، خۆ هەرگیز نەبووە

زیندوو دوای مردوو بمرێت و خۆی بفەوتێنێت.

خەدیجە کاتێ ئەمەی بیست فرمێسك لەچاوەکانی قەتیس وەستا، سەیری باوکی کردو بەدەنگێکی باریك و پچڕ پچڕ گوتی:

پـاش دابڕانـی خۆشەویـستان ژیـان چ بـەهایێکی هەیـە؟ گەرچـی ڕاسـتە عـەتیق مردووە بەڵام یادەکانی لەدوای جێماوون.

پاشان دەستی بەسەر سەری کچە بچکۆڵەکەی داهێناو فرمێـسك بەسـەر کوڵمـەی سووری بەتاو هاتەخوارەوە و گوتی:

ئەوە یادی عەتیقە جێیهێشتووە دەمەوێ هەر بۆ ئەوە بـژیم نامـەوێ لـە بـەر و کۆشی کەسێکیتر دایبنێم و نایخەمە بەر ڕقوتوڕەیی و ڕەزامەندی کەسێکیتر.

خومیلد زۆر دڵپەستبوو فرمێسکی چاوەکانی خەریك بـوو بێتـە خـوارەوە، بـەڵام خۆی گرتوو دوایی گوتی:

بەڵام تۆ بەتەنیا دەژیت، کچەکەم بۆتۆ چاکتر وایە لە سایەی پیاوێك بژیت نەك بەتەنیا دەرگا لەسـەر خـۆت دابخـەی، تـۆش یەکـەم ژن نیت هاوسـەرەکەت مردبێت، ئێمـەش هـەر هـەمووەمان هیچمان لەدەست خۆمـان نیـە هەرچیەکمان بەسەر بێت ئەوادێت، پاشـان نـاوی ژمارەیـەك ژنـانی بێوەژنی هێنـا کـە پیاوەکانیـان مردبـوون و دوایـی شـوویان کردبـوەوەو هـەموویان لـەژیانێکی بەختـەوەریش دابـوون، خەدیجـە سەری شۆڕکردو قسەی نەکرد، باوکی دوای ئەوە بەهێمنی پێیگوت:

خەدیجە ڕۆژگار زۆر خێرا دەڕوات، منیش بەتەمەنم و پیربوویمە، بەرەو نـەمان دەڕۆم دەترسـم لـەدوای مـن تـۆ بەتـەنیا بـێ چـاودێرو سەرپەرشـتیار بمێنیتـەوە، دەترسم سبەی یان دوو سـبەی کـۆچ بکـەم و ژیـان جێبهێلم بەئاهونالەو کەسـەرەوە غـەمی تـۆ ببەمـەژێر خـاك، ئـەرێ کـچەکەم بۆبـەگوێی باوکـت ناکـەیت کـە هـەردەم چـاکەی تـۆی دەوێ، خۆتـۆ هـەرگیز سـەر پێـچیت لـە قـسەی باوکـت نـەکردوە و فەرمانەکانت هەموو کات جێبەجێ کردووە؟.

خومیلد نەختێك بێدەنگبوو، دوایی بەزەردەخەنەیەکەوە گوتی:



پیاوێـك هاتۆتـە خوازبێنیـت، بـەڕای مـن شـیاوە بـۆ تـۆ، ئەگـەر تـۆش ڕات لەسەربێت، حەزدەکەی بزانیت کێیە؟.

ئەو پیاوە ئەلنەباش کوڕی زرارەی ئەلتەمیمیە، پیاوێکی دانـاو چاوتێرە خـەڵك هەمووی ناوبانگی ئەو پیاوەیان بیستوە، کەسێکی ئازاو زیرەك و بەجەرگە، لە قسەم دەرمەچەو بەگوێم بکە، خەدیجە دڵت بۆ باوکت بسووتێ، چونکە ترسم لـە دواڕۆژت هەیە کاتێ کەمن دەمرم تۆ بەتەنیا دەمێنیتەوە.

خەدیجە سەری شۆڕکردو ئەوەڵامدانەوەی هەبوو نەپرسیار، بـەڵام خویلد زۆر هەوڵیدا تەنانەت لەکۆتاییدا بۆی سەلماند و ڕازی بوو.

## خێزانێکی نوێ

خەدیجە دڵی باوکی نەڕەنجاند، بۆیـە شووی بەئەلنەباشی تـەمیمی کردەوە، دوای تێپەڕبوونی ماوەیەکی کورت لـەژیانی هاوسـەرایەتیان، بـەپێی ئـەزموونی ڕابـردووی توانی دڵی ئەلنەباش بکاتەوەو دڵی خۆیشی بۆئەو کردەوە، خۆشەویستی لەنێوانیاندا هاتەکایـەوە، هەریەکـەو جێگـای خـۆی لـەناو دڵـی ئـەویتریان کـردەوە، ئەلنـەباش پیـاوێکی زیـرەك و دانـاو هۆشمەنـدبوو، خـاوەنی مـاڵ و سـامانێکی زۆر و بازرگـانی فـراوان بـوو، زۆر چـاوتێرو دەسـت کـراوە بـوو، متمانـەی بەخەدیجـە هـەبوو، بۆیـە لەهەندێ بیرو بۆچووندا ڕای وەردەگرت بۆچوونەکانی بەلاوە پەسندبوو، خەدیجەش ژنێکـی وەفـادار بـوو بـۆ هاوسـەرەکەی، ماڵەکـەیان هەمیـشە شـوێنی بەخـتـەوەری و خۆشـی بـوو، خۆشـگوزەرانی و ئـارامی بـاڵی بەسـەردا کێـشابوو، ئـەم ئاسـوودەیی و بەختەوەریە کاردانەوەی هەبوو لەسەر ژیانی ڕۆژانەی ئەلنەباشداتەنانەت لـەبواری بازرگانیەتیـدا زۆر سـەرکەوتووتربوو لـەجاران، بۆیـە ئەگـەر باسـی بەختـەوەرترین خێزان بکرابوایە، ئەوا ئەو ماڵە وەك نموونەیەك دەهێنرایەوە.

بێگومـان عەرەبـەکان کوڕیـان بـەلاوە زۆر گـرنگ و خۆشەویـستبوو، تەنانـەت

کاریگەری لەسەر باری خێزانیش هەبوو، چونکە یەکێك بوو لە هۆکارەکانی فرمێسـکی، ئەوەی کوڕی نەبوایە هەمیشە غەمگین و بێ هیوادەبو لەژیانـدا، بۆیـە هاتنی( هالـە )دوای سالێك لە تەمەنی هاوسەرێتی خەدیجەو ئەلنەباشدا فاکتەرێکی بـەهێزبوو بـۆ پەرەسەندنی خۆشەویستی و تۆکمەکردنی پەیوەندی نێوانیان.

ئـیتر خەدیجە بـەباوکی (هالـە) نـاوی ئەلنەباشی دەهێنـا، ئـەویش کـەگوێی لـەم نازناوە دەبـوو شـانازی پێوەدەکردو پێیدەگەشـایەوە، هالـە هیـواو ئـاواتی دواڕۆژێکـی پرشـنگداری لـەدڵی دایکوباوکیـدا نایـەوەو بـوە هانـدەرێك بۆیـان، بـەڵکو پـتر بایـەخ بـەژیان و دواڕۆژیـان بـدەن، خەدیجـە زۆر بـەجوانی و بـەرێکی کۆرپەکـەی بـەخێو دەکـردو پـەروەردەی دەکـرد، ئەلنـەباش کاتـێ لـەبازاڕدا بـەباوکی هالـە بانگـدەکرا، کـاراترو گورجوگـۆڵتر کـاری ڕۆژانـەی بازرگانیـەتی ڕادەپەڕانـد، تەنانـەت شـەکەت و ماندوو بوونیەتی لەبیر دەچووەوە، بۆیە دەسکەوت و سوودو قازانجی لـەجاران زیـاتر و داهاتی پتر بوو.

سـاڵی دووەم کـوڕێکی تریـان بـوو، ئەلنـەباش بـە لـەدایکبوونی (هنـد) زۆر شادمانبوو، بۆیـە چـەندین هـەزارو کەمدەرامـەتی خـەڵات کـرد، بـە دەوری کەعبـەدا سووڕایەوەو سوپاسـی خواکـانی کـرد، ئەلنـەباش لـەژیانێکی زۆر شـادو بەختـەوەردا دەژیـا، ماڵەکـەی خۆشـترین هێلانـەی ژیـانیبوو، کاتـێ لـەماڵ دەردەچوو بەپەلـەبوو تازوو بگەڕێتەوە ماڵەوە، بـەلام خەدیجـە چۆن نهێنییێـك لـە نەسـتیدا خـۆی مـەلاس دابێـت، هەمیـشە ترسـێك بەدوایـەوەبوو، زۆرجـار لـە دڵـدا دەیگـوت ڕەنگـە ئـەم بەختەوەریە تا سەر نەبێت، لەناخەوە هەستێکی شاراوەو نادیار ناوەنـاوە پێیـدەگوت ڕەنگـە ئـەم نـازو خۆشـیەتان لێ تێکبـچێت، ئـیتر هەرچـەند خۆشـگوزەرانترو ئاسوودەتردەبوون ترسی لەدڵدا زیاتر دەبوو.





# کۆستێکی تر

خەدیجەو هاوسەرەکەی لەبەهاری تەمەنی هاوسەرێتیدابوون، لەناکاو ڕۆژێک لافاوی ڕەشی مەرگ هێرشی کردە سەر ئەم خێزانەو لە ناوەڕاستیاندا، باوکی هالەی خستە ژێر چەپۆکی شەپۆڵەکانی و بۆهەتاهەتایە وونی کرد و ئەم خۆشەویستانەی لەیەکتر دابڕاند.

خەدیجەی دڵناسک و ڕەنجەڕۆ هێشتا برینەکانی ئازارو ژانیان لێدەتکایەوە، فرمێسکی چاوەکانی ووشک نەبوبوەوەکەچی دووبارە کۆستی کەوتەوەئیتر ئەم کۆچە ناوەختەی باوکی هالە دووبارە قەتماغەی زامەکانی کۆن و نوێی ئاڵآکردەوەو خەدیجەی هێنایەوە هەژان، ئیتر بەهەناسە ساردی لەگەڵ منداڵەکانی دانیشت، هیچ هیواو ئاواتێکی بەژیان نەما، بەڵکو ژیانی لەبەرچاو تاریک و تاڵبوو، تەنانەت ئەو ماڵوسامانە زۆرەی لە دوای باوکی هالە بۆیان مابووەوە، هیچ بەهاو بایەخێکی نەبوو، بەڵکو دەیگوت:

ماڵ و سامان و ژیان هیچ نیە، بەڵکو شتێکی کەمەو مایەپووچە، هەمیشە شادی و بەختەوەری تیایدا نامێنێ و تاسەر نیە، ئایا ئەم هەموو ماڵ و سامانە زۆرە بۆ باوکی هالە هیچ سوودێکی هەبوو، توانی لەمردن ڕزگاریبکات؟، یان توانی عەتیق لەژێر چەپۆکی مردن ڕزگار بکات؟

کاتێ سەیری کچ وکوڕەکانی دەکرد، چۆن بەهەتیوی ماونەتەوەو لەخۆشەویستی باوکیان بێبەشن، دەکەوتە ناو دەریای خەم و پەژارە، پەست و نیگەراندەبوو، یادەوەریەکانی ڕابردووی بۆتەنیا ساتێك بەرۆکیان بەرنەدەدا، بۆیە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ ڕەنگ زەردو لاواز تردەبوو، تەنانەت زۆر بێهێز بوو، توانای جوولەی نەماو کەوتە ناو جێگا، ئەو ماڵەی جاران نموونەی خۆشی وشادی و بەختەوەریبوو، ئێستا باڵی خەم دایپۆشیوە بزەو خەندەی سەرلێویان بوەتە هەنسک و قوڵپی گریان.

کاریگەری ئەم کارەساتەو کۆستەمەزنە لەسەر دڵی خوەیلد کەمتر نەبوو لەدڵی خەدیجەو دایکی، چونکە لەڕوخساریەوە خەموپەژارە بەدیدەکرا، ڕۆژانە سەردانی خەدیجەی دەکرد، بەڵام لای خەدیجە دانی بەخۆی دادەگرت تا هەست نەکات ئەویش یەکجار دڵ تەنگ و خەفەتبارە، سەرپەرشتیماڵەکەی دەکردو کاروباری بازرگانی بۆ هەڵدەسوڕاند، یاری لەگەڵ منداڵەکانی دەکرد، گەڵ قسەو باسی لەگەڵ خەدیجە دەکرد، تانەختێك ئازارو کارەساتەکەی لەبیربەرێتەوە و کەمکاتەوە، بەڵام خەدیجە زۆر خەفەتبارو نائارام بوو، تەنانەت نەخۆش کەوت، خوەیلد لەوە دەترسا لە نەخۆشیەکە چاك نەبێتەوە، لەگەڵ دایکی هەمیشە داوایان لێدەکردو ئامۆژگاریان دەکرد، بەڵکو بەخۆیدا بچێتەوەو ئەوەندە خەموخەفەت نەخوات، بەزەیی بەمنداڵە بچکۆڵەکانی بێتەوە، تەنانەت ڕۆژێکیان دایکی پێیگوت:

کچە شیرینەکەم خۆتۆ دڵسۆزیت بۆ هەردوو هاوسەرەکانت لەڕادە بەدەر بوو، بەڵام دیارە ویستی خودا وابووە تۆ جێگای ئەوان بگریتەوەو کارەکەی ئەوان ڕاپەڕێنیت، بۆیە تۆ ئێستا ئەرکێکی قورست کەوتۆتە سەرشان، پێویستە منداڵەکانت پەروەردە بکەیت و سەرپەرشتیان بکەیت، تاهاوسەرەکانت بە ئارامی لە نێو گۆڕەکانیان ڕاکشێن و گیانیان ئاسودەبێت و لێترازیبن، هەروەکو لە ژیانیاندا لێترازیبوون، کچەکەم تۆ حەز دەکەیت منداڵەکانت بێ باوك ودایك بمێننەوە؟، پێمناڵێیت لەدوای تۆ و باوکیان کێ بەخێویان دەکات؟.

ئیتر دوای چەندین قسەی بەپێزو کاریگەر، دایکی توانی هەستێك لەدڵی خەدیجەدا بێنێتەکایەوەو دروستبکات، پێیگوت ئەو ئێستا لە شوێنی هاوسەرەکانیەتی، بۆیە ئەوکارەی کەوتۆتە سەرشانی دەبێ جێبەجێی بکات، ئیتر دوای هەوڵێکی چڕوپڕی باوك ودایکی، پاش چەند ڕۆژێك لەجێگادا، هاتەدەرو هەڵسایەوە سەر پێ، خوەیلدی باوکی دەردی پیری هاڕی بووی، تەنگی پێهەڵچنیبوو، سەرەڕای ئەمەش هەمیشە خەدیجەی جێینەدەهێشت و سەرپەرشتی کارەکانی دەکرد

و بۆی بەڕێوە دەبرد.

بەڵام ڕەشەبای پایزی مەرگ، لەپڕ ڕۆژێ هەڵیکردو گەڵای تەمەنی خومیلدی هەڵوەراند، ئیتر ئەو تروسکە خۆرەی ڕۆشنایی بەماڵی خەدیجە دەبەخشی، بەهەوری ڕەش داپۆشرا، خەدیجەی کۆستکەوتو دوای لەدەستدانی باوکی ئەوەندە ڕەشبینبو هیوای بە ژیان نەما، بەڵام وێڕای ئەوەش هەمیشە لەبیرکردنەوەدابوو ئاخۆ لەمەودوا چیبکات چۆن ئەو منداڵانەی بێ سەرپەرشتیار بەخێوبکات؟.

ڕۆژێکیان ئەو خانمەی بیرکەوتەوە ئەوەی ماڵەکەیان لەنزیك ماڵی ئەوانە، ناوی ئامینەی کچی وەهەبە، چۆن لەسەرەتای بەهاوسەربوونیدا هاوسەرەکەی مرد، کۆرپەڵەیەکی بەهەتیوی لە سکی دایکیدا جێهێشت، کەچی ئامینەخان هەرگیز شووی نەکردەوە، بەڵکو خۆی لەپێناو موحەممەدی جگەرگۆشەکەیدا بەختکرد، ئەوەتا کوڕەکەی ئەمڕۆ تەمەنی نزیکەی شەش ساڵە ئامینەی دایکی تاکە هیواو ئاواتی لەم ژیانەدا تەنیا ئەوەیە موحەممەدی کوڕی تەمەن درێژبێت، ئاواتەخوازە تەنیا لەپێناو جگەرگۆشەکەیدا بژیت، ئیتر لەم ژیانەدا هیچ هیوایێکی تری نیە.

خەدیجە ئەم ڕەفتارەی ئامینەخانی زۆر بەلاوە پەسندو بەدڵبوو، بۆیە بەڵێنیدا وەك ئامینەخان ئارامگربێت و لەپێناو هەرسێ منداڵەکانیدا خۆی بەخت بکات، ئیتر چەندجار لەلایەن گەورەپیاوان و لاوانی قوڕەیش خوازبێنی کرا ، بەڵام وەڵامی نەدانەوە، بەڵکو ئەوەی بیری لێنەدەکردەوە شووکردنەوەبو، چونکە هەموو بیرو هێزو توانای خۆی لەبواری بەڕێوەبردنی بازرگانی و بایەخدان بەپەروەردەکردنی منداڵەکانی خستەگەڕ.

# خۆری هیوا

خەدیجە وەك کەسێکی کارامەو لێزان هاتەناو کاری بازرگانی، وەك هەموو بازرگانەکانی تری مەککە کارەکانی زۆر بەووردی و دانایی بەڕێوەدەبرد، پالەو کرێکارێکی زۆر لە کۆگاو کاروان و بازاڕی بازرگانیەتی ئەو کاریان دەکرد، بێ ئەوەی هەست بەکەموکوڕی بکەن، بەڵکو شانازیان بەوەوە دەکرد کە لەلای ژنێکی لێزان و ژیرو هۆشمەند کاردەکەن، بنەماکانی بازرگانێتی و ووردەکاریەکانی چاك شارەزایە، دەزانێت چ کالایێك و کەلوپەلێك داواکاری لەسەر زۆرەو چ شتومەتێك داواکاری کەمە، تەنانەت ئەوەندە لێزان و شارەزابوو لە بواری بازرگانیدا خەڵك دەهاتنەلای بیروڕایان وەردەگرت و ئامۆژگاری دەکردن لەم بوارەدا.

ئیتر ماڵی خەدیجە بوو بەماڵی یەکێك لەگەورە بازرگانەکانی مەککە، کۆگاکان و عەمبارەکانی ناودارترین و فراوانترین کۆگابوون، ماڵ و سامان و بازرگانیەکەی ناوبانگی دەرکردبوو کەبەڕێگای ڕاست و ڕەواو دروست کۆکراوەتەوە، چونکە لەپێوان و کێشاندا کەموکوڕی نەبوو، وەك نەریتێکی تایبەتی و خوێکی خۆی بەبەردەوامی یارمەتی هەژاران و داماوانی دەدا، بەڕوویێکی گەش و دڵێکی فراوانەوە ماڵەکەی خۆی دەبەخشیەوە، کۆسپ و تەگەرەی لەبەردەم هەژاران لادەدا، هەستی دەکرد هەرچەند پتر دەیبەخشیەوەو دابەشی دەکرد سوودو قازانجی زیاتر دەبوو، بۆیە دەیزانی هۆی زیادکردنی سامانەکەی پەیوەستە بەم بەخشینەی بەسەر هەژاران و نەدارانـدا، تەنانەت لەپیاوە دەوڵەمەندەکان و ناودارانی مەککە زیاتر یارمەتی هەژارانی دەدا، خەڵك سەریان لە کەسایەتی بەهێزی ئەم ژنەو کارەبازرگانیەکەی سوڕمابوو، چونکە ئەوەندە شارەزاو کارامەبوو تەنانەت بوبوو بەیەکێك لە هەرەشارەزاکانی بواری بازرگانیەتیبەڵام وامەزانە لەم کارەدا بەر تیرو توانج و گاڵتەی خەڵك نەکەوتبێت، چونکە بێگومان بازرگانی پیشەیەکی تایبەت بەپیاوان

بوو، بەتایبەتی لەنیوە دوورگەی عەرەبدا، چجای ئەوەی پێش هاتنی ئایینی ئیسلام ڕەگەزی مێ هیچ بەهایێکی کۆمەڵایەتی و مرۆڤایەتی نەبوو، بۆیە زۆرجار براو خزم و کەس و کاری ئامۆژگاریان دەکرد تا شوویکاتەوە و چیتر خۆی سەخڵەت نەکات و واز لەم کارە بێنێت، بەڵام لەوەڵامدا دەیگوت:

هیچ جیاوازی نیە لەنێوان ژن و پیاودا هەمان تواناو هێزی هەیە، ئەگەر بیەوێ دەتوانێت وەکو ئەو کاربکات، ئیتر گوێی نەدایە قسەو تیرو توانجی ئەم و ئەو بەڵکو ڕێگای خۆی گرتەبەر، کارەکەی زۆر خۆشدەویست و تاموچێژی تایبەتی پێ دەبەخشی، ئەوەندە سەرقاڵبوو بەکارەکەیەوە تەنانەت ژیانی هاوسەرێتی بەتەواوەتی لە بیر بردبووەوە، ئیتر دەرەنجام توانی پلەوپایە لەناو کۆمەڵگاکەیدا بەدەستبێنێت و خەڵك بەچاوێکی پڕ لەڕێزەوە سەیریبکەن و بەگەورەو ڕێزدار ناوی بێنن، هەرچەند ڕۆژگار تێپەڕدەبوو ئەو پتر ڕێزی دەگیرا پلەوپایەی لەناو خەڵکدا بەرزتردەبووەوە، تەنانەت بایەخدان و سۆزو خۆشەویستی بۆ منداڵەکانی هۆکارێکی تری ڕێزگرتنی بوو.

سەرەڕای ئەوەش خەدیجە لەهەموو کارێکی خێرخوازی و چاکەدا، وەکو سەرۆك و پیاو ماقوڵەکان بەشداری دەکرد، بۆیە ژنان لای هاوسەرەکانیان شانازیان بە خەدیجەوە دەکرد، چونکە سەلماندبووی کەژن خاوەن هێزو توانایە وەك پیاوان هیچی لەوان کەمتر نیە.

بێگومان خەدیجە هەرچەند سامان و ناوبانگیەکەی پتر پەرەی دەسەند پیاو ماقولانی مەککە تەنانەت گەنجەکانیش زیاتر ئارەزووی خوازبێنی و هاوسەرێتیان دەکرد، هەروەها هەرچەند تەمەنی زیادی دەکرد شیرینترو جوانتر دیاردەبوو، زۆر جار پیاوان هەوڵیاندەدا کەڕازی دڵیخۆیان لای ئەو بدرکێنن، بەڵام هیچ کەسێك نەیدەتوانی خۆی لە قەراغی ئەم باسە بدات، چونکە خەدیجە خاوەن کەسایەتییەکی مەزن وگران وسەنگین بوو، پیاوان لە بەرامبەر ئەودا زمانیان دەگیراو بەحەپەساوی

دەوەستان، بگرە گەورەپیاوان لەبەردەم ئەودا خۆیان بەبچووك دەهاتە بەرچاو، بۆیە پەنایان دەبردە بەر خەڵکانی تر، بەڵام خەدیجە هیچ بیرو هۆشی لای شووکردن نەبوو بۆیە هەرگوێی پێ نەدەدان.

شەوێکیان تانیوەی شەو نەخەوت، خەریکی نرخی کەلوپەل و قازانج وسەرمایە ژماردن بوو، چەندی ناردوە بۆ وڵاتی یەمەن و سوود و قازانجی چەند دەبێت و چەندی ببەخشێ بەهەژاران، پاش ئەم ماندووبوون و سەرقاڵیە چووە سەر جێگاکەی زوو دەستی لەملی خەوکردو نووست.

بەڵام خەوی ئەم شەو لەهەموو شەوانی تری جیاوازبوو، چۆن خەوێکی زۆر سەیری بینی لەم خەوە بینی ئاسمان سازگارو بێ گەردە، خۆر تێیدا پرشنگدارە، جیهان سەرتاپای جوان و ڕازاوەیە، دوایی بینی خۆر لەئاسمان هاتەخوارەوە دابەزی بۆسەرزەوی، تا دەهات خۆرەکە گەورەتر دەبوو تیشکی زیادی دەکرد، پرشنگی رووناکترو پتر دەبوو، تا گەیشتە سەر زەوی، خۆرەکە ئیتر هاتەناو خانوو ماڵی ئەو، ماڵەکەی پڕکرد لەڕووناکی، دوایی رووناکیەکەی بەدەورو بەری مەککەدا بڵاوبووەوە، دوایی سەرتاپای زەوی داپۆشت.

لەخەوەکەی ڕاپەری چاوی بەهەموو لایەکی خانووەکەیدا گێڕا، بینی وەك خۆیەتی و نەگۆڕاوە، سەیریکرد کەنیزەو دەستوپێوەندەکانی هەموویان لە خەوێکی قووڵدان، شەو کپ و بێ دەنگ و هێمنە، لە ناو جێگاکەیدا دانیشت بیری لەو خۆرە کردەوە، چۆن هاتە ناو خانووەکەی ئەو، لە دڵیخۆیدا دەیگوت ئەمە دەبێ چیبێت، ئیتر لەبەر بیرکردنەوە خەو لە چاویا زڕا، بۆیە کاتێ بەیان ڕوونی کرد، لەگەڵ کازیوە خێرا هەڵسا جلەکانی لەبەرکردو هەندێ لە کەنیزەکانی ئاگادار کردەوەو خێرا بەرەوماڵی ئامۆزاکەی وەرەقەی کوڕی نەوفەل چوو، وەرەقە بە حەپەساییەوە گوتی:

چیە خەدیجە چیبووە بەم بەیانیە زووە هاتوویتە ئێرە، خۆ خەڵکانی

دەوڵەمەندی وەکو تۆ تاکاتی نیوەڕۆ لە خەو هەڵناستن؟!.

خەدیجە نەختێ سەرسامی پێوە دیاربوو گوتی:

وەرەقە تۆ خەونامەت هەیە؟.

وەرەقە گوێی بۆ شلکردو ئەویش بەسەر هاتەکەی بۆ گێڕایەوە، چۆن خۆر گەورەبوو پرشنگیدا، ڕوخساری وەرەقە لەگەڵ باسەکە دەدرەوشایەوە، هەرچەند باسەکە بەرەو کۆتایی دەهات، وەرەقە پتر دەگەشایەوە، تەنانەت خەدیجە خەونەکەی تەواو گێڕایەوە، وەرەقە بەشادمانییەوە گوتی:

پیرۆزە!، پیرۆزە!، خەدیجە شوودەکەیت ئامۆزا!.

خەدیجە حەپەسا، پاشان بەتوڕەییەوە گوتی:

وەرەقە ئەوە تۆ دەڵێی چی؟ تۆ زۆر چاك دەزانی من وازم لەپیاوان هێناوە، من خۆم بۆ منداڵەکانم وبازرگانی بەخت کردووە، ئەرێ بەڕاستیتە؟، ئەگەر گاڵتە ناکەیت جارێکی تریش سەیری خەونامەکە بکەرەوە، بەڵکو واتایێکی تری هەبێت، چونکە من هەرگیز شووناکەم.

بزەی سەر لێوی وەرەقە فراوانتربوو، دوایی بەهێمنی گوتی:

خەدیجە تۆ شارەزای منی و دەزانی ڕێبازەکەم چۆنە، من حەزم لەگاڵتە نیە، بەڕاستی تۆ شوو بەم خۆرە دەکەیت، پرشنگەکەی تاریکی لادەدات وجیهان ڕۆشن دەکات، خەڵك بەرەو ڕێگای چاکە دەبات، خەدیجە تۆ شوو بەپیاوێك دەکەیت وەك پیاوانی ئاسایی نیە، تۆ شوو بە پێغەمبەرێك دەکەیت!.

خەدیجە بەم قسەیە چۆن لە خەودابێ و هوشیاربێتەوە ڕاچڵەکی، نەختێك بێدەنگبوو سەیری وەرەقەی کرد، وەرەقە دیسان گوتی:

خەدیجە هەروەکو لەکتێبەکان خوێندومەتەوەئەو پێغەمبەرە لە نێو عەرەبەکان دێتەدی و پەیدادەبێت، هاتنی نزیکبووە، خودا ژنێکی چاکی بۆ هەڵدەبژێرێت، یارمەتی دەدات و دژی خوانەناسان خەبات دەکات.ئەرێ خەدیجە تۆ

ئامادەی بۆ ئەم خەبات و تێکۆشانە؟ هەر لە ئێستاوە خۆت ئامادەبکە، چونکە دیسان دەڵێم خەونەکەت گوزارش لەوەدەکات تۆ دەبیتە هاوسەری ئەو پێغەمبەرە چاوەڕوانکراوە!.

ئیتر خەدیجە بەدوو دڵیەوە هەڵسا بەرەو ماڵ گەڕایەوە، نەیدەزانی نەباوەڕبکات نەباوەڕ نەکات، بۆیە لەدڵی خۆیداو بەدەم ڕێگاوە دەیگوت:

ڕەنگە ئەو قسانەی وەرەقە ڕاستبێت!.

بەڵام نا لەوانەیە گوزارشی خەونەکەی بەپێی بۆچوونی خۆی لێکدابێتەوە!.

پەیوەندی چیە لە نێوان ئەو خۆرە گەورەیەو پێغەمبەرەکە؟!.

وەرەقە چۆن دەزانێت ئەو پێغەمبەرە لەعەرەبەو منیش دەبمە هاوسەری؟!.

ئیتر تاگەیشتەوەماڵەوە سەرقاڵی شیکردنەوەی قسەکانی وەرەقەبوو، لای کەس ئەم خەونەی نەدرکاند، بەڵام بۆ یەك چرکەش خەونەکەو واتاکەی لە بیر دەرنەدەچوو.

# پێشنیار

کاروانی بازرگانی گەشتی زستانەی یەمەن لە گەڕانەوەدابوو، نزیك کەوتبووەوە، چەند ڕۆژێکی مابوو بگاتەوە شاری مەککە، ئیدی زۆری نەخایاند دوای چەند ڕۆژێك هەواڵ و مزگێنی گەیشتنی کاروانەکە بەگوێی خەڵکدا زرنگایەوە، جموجۆڵ و جوولەو هاتووچۆ لەناو خەڵکدا دەستیپێکرد، خەدیجە وەك هەر بازرگانێکی تر، کرێکارەکانی ڕاسپارد کۆگاکان ئامادە بکەن بۆداکردنی کاڵاو کەلوپەلی نوێ، خەڵك پۆل پۆل دەهاتن بۆ ئەوێ، بەتایبەتی ئەو کەسانەی هەمیشە مامەڵەیان لەگەڵدا دەکردو سوودبین بوون، کارکەر و کەنیزەکان چالاکانە دەهاتن و دەچوون، بەخەدیجەیان دەگوت بەڵێنتداوە ئەمجارە پارچە قوماشێکی بەهاداری یەمەنمان پێ

ببەخشێت، کاروان گەیشتەجێ، کەلوپەلەکان گواسترانەوە بۆ کۆگاکان، خەدیجە لەگەڵ سەرکارەکانی دانیشت، گوێی لەدەنگوباسی گەشتە بازرگانیەکە گرت، پرسیاری لێ دەکردن ئەوانیش وەڵامیان دەدایەوە، پاشان سڵاوی بازرگانەکانی یەمەنیان پێراگەیاند، گوتیان زۆر ئارەزووی بینینی دەکەن، ئەویش خەندە بەسەر لێوەکانی دادەهات، دوای ئەوەی قسەو باسیان تەواوبوو، ئیتر ئەو کرێیەی لەگەڵ کاروانچیەکان لەسەری ڕێککەوتبوون، هەمووی بۆ جێبەجێکردن، بەڵکو بەزیادەوەش کرێیەکەی پێبەخشین، کرێکارەکان بەدڵێکی خۆش و ڕەزامەندیەوە سەبارەت بەچاکەو ڕەفتارە مرۆییەکانی سوپاسیان کرد.

پاشان خەدیجە چوو چاوێکی بەکۆگاکاندا خشاند، هەندێ شتی نایابی هێنا پێشکەش بەکەنیزە و دەستو پێوەندەکانی کرد، ئەوانیش لە خۆشیانا دەستیان کرد بە سەما.

خەدیجە دوای گەیشتنی کاروانی یەمەن خەریکی خۆئامادەکردن و سازدانبوو بۆگەشتی هاوینە، تا کەلوپەلی بازرگانیەتی یەمەن بنێرێت بۆ وڵاتی شام، بۆ ئەم مەبەستەش پۆل پۆل پیاوان دەهاتن بۆکارکردن و سەرپەرشتی کاروانەکە، کرێکاران خەریکی بەستنی کەلوپەل و ئامادەکردنی ووشتر و کوندەی ئاو و توورەگەی نان و خواردەمەنی بوون، خەدیجە خۆیشی سەرپەرشتی هەموو شتەکانی گەورەو بچووکی دەکرد، پێیدەگوتن چی بکەن و چی نەکەن.

ڕۆژی گەشتەکە نزیك بووبووە، گەورە پیاوی شاری مەککە (ئەبوطالب کوڕی عبدالمطلب کوڕی هاشم)چووەلای خەدیجە، ئەویش زۆر بەڕێزەوە پێشوازی کرد، بەیەکەوە دانیشتن باسی کاروانی بازرگانیان کرد، باسی سوودو قازانج و زیانیان کرد، خەدیجە باسی کرێکارانی کرد، چۆن هەندێکیان بەڕێکی کاردەکەن و سوودبەخشن، کەچی هەندێکیان بەپێچەوانەوە زیانبەخشن، هەندێ کرێکار بێ

کەمتەرخەمی کاردەکەن ئەویش پارەتی چاکیان دەدات، ئیتر قسەو باس لەبوارێك دەگوازرایەوە بۆ بوارێکی تر،لەلایەك بۆلایێکی تر، لە جۆرە کەلوپەلێك بـۆ جـۆرێکی تر، لە پیاوێك بۆ پیاوێکی تر، ئالێرەدا ئەبوطالب هەلی بۆڕەخسا تـا ئـەو مەبەسـتەی بۆی هاتبوو باسی بکات.

برازاکـەی موحەممـەدی کـوڕی عەبـدوڵلا تەمـەنی ببـووە بیـست و پێـنج سـاڵ، هێـشتا ژنــی نــەهێنابوو، چــونکە هــیچ ســامانێکی نــەبوو تابتوانێــت ئــەوکارەی پێبەنجامبدات، هەرچەنـدە نـەوەی (عبـدالمطلب)ی گـەورەی مەککەبوو، بـەڵام شـوان بوو، مەڕی بۆ خەڵکی مەککە بەخێو دەکرد، هەمیشە نەدارو هـەژاربوو، بۆیـە مـامی بـیری لـەوە کـردەوە کـارێکی تـری بـۆ بدۆزێتـەوە باشـتربێت لـە شـوانکاری، بـەڵکو سـامانێك کۆبکاتــەوەو بۆخـۆی ببێتـە خـاوەنی مـاڵ و خێـزان، بـۆ ئـەم مەبەسـتە چووبووە لای خەدیجە بەڵکو کارێك بە برازاکەی بسپێرێت، جا کاتێ هـەلی بۆڕەخـسا بە پێکەنینەوە گوتی:

خەدیجە من بۆ موحەممەدی کوڕی عەبدوڵلای برام هاتوومەتەلات، بـەڵکو لـەو کاروانەی ئامادەتان کردوە بەرەو وڵاتی شام بڕوات، کارێکی پێبسپێریت.

خەدیجە، ناوبانگی موحەممەدی بیـستبوو، چۆن لاوێکـی ئـەمین و ڕاسـتگۆو بـێ فرووفێڵە، هەروەها خاوەن ڕەوشـتێکی بـەرزە، نموونـەی پاکـژی وداوێـن پاکیـە، دوورە لـەو ڕێگایانـەی لاوانـی مەککـە لەسـەری دەڕۆن، بۆیـە خەدیجـە بەزەردەخەنەیەکەوە گوتی:

یـەکێکی وەکـو موحەممــەد جێگـای متمانەیـەو کـاری پێدەسـپێردرێت، بـەڵام شارەزایی نیە لەڕێگاوباندا، چونکە پێش ئێستا بۆ ئەم ڕێگایانە نەچووە.

ئەبوطالب دڵنیای، کرد کە موحەممەد شارەزایەو ڕێگای شام پێدەزانێت، چونکە لە تەمەنی دەساڵیدا جارێك لەگەڵ خۆی بردوویەتی بۆ شام، ئەوکاتە ئەوەنـدە چاك سەرنجی دابوە ڕێگاکە، ئیدی زۆر باش شارەزابووە، تەنانەت ئەوانـەی لـە موحەممـەد

گەورەتربوون بەم جۆرە وەکو ئەو شارەزا نەبوون، وێڕای ئەوەش لاوێکی بەهێزو توانایەبەرگەی گەشت و ڕۆیشتن و ئازارو ئەشکەنجەکانی ڕێگا دەگرێت، لە ژمارەو پێوان زۆر زیرەکە بۆ بازرگانیەتی سوودی دەبێت، لە شوانکاریش ووردبینی و ئارامگری و خۆڕاگری فێربووە، زۆر بەلێکدانەوەیە لە هەموو بوارێکدا.

خەدیجە هەرچەندە گوێی لەقسەکانی ئەبوطالب گرتبوو، بەڵام لەلایەکی تر لە نێو یادەکانی ڕۆژانی ڕابردوودا مەلەی دەکرد، بیری کەوتەوە ئەو ڕۆژەی موحەممەد لە دایکبوو عەبدولموتەلیبی باپیرەی چەند دڵخۆشبوو، ئەوسات ئەو تەمەنی پازدە ساڵ بوو، لەگەڵ خەڵکی مەککە بەشداری کرد لەو خۆشیەو شادیەدا ، بیری لەو ڕۆژە دەکردەوە چۆن عەبدولموتەلیب ویستی عەبدوڵلای کوڕی بکوژێتەوە، بیکاتە قوربانی لەپێناو دۆزینەوەی ئاوی زەمزەمدا، وەکو خەو هاتەوە بەرچاوی، چۆن ناویان لەو ڕۆژە نابوو(ڕۆژی قوربانی گەورە).

ئاهەنگی شووکردنی خۆی بیرکەوتەوە، چۆن ماوەیەکبوو خەڵکی مەککە لەبەر مردنی عەبدوڵلا ئاهەنگیان نەدەگێڕا، بەڵام بەهۆی لە دایکبوونی موحەممەد یەکەم ئاهەنگ بوو عەبدولموتەلیب تیایدا بەشدار بوو، چونکە شاد و دڵخۆشبوو بەهۆی لە دایکبوونی ئەم کوڕە ئازیزەی، بیری لە موحەممەد کردەوە چۆن بە هەتیوی گەورەبووەو تەمەنی شەس ساڵ بوو دایکی سەرینایەوە، دوای ئەوەی باوکی خۆی نەبینیبوو، وێڕای ئەوەی هەتیوێکی بێ باوك و دایکیشە، ڕێگای ڕاست و دروستی گرتۆتەبەر، خاوەن ڕەوشتێکی بەرزو پیرۆزە، ئیتر لە ناو ئەم بیرکردنەوەیەدابوو لێوەکانی بەشادیەوە گوتی:

ئەبوتالیب تۆ ئەگەر بۆ یەکێکی دووریش داوات بکردبایە ڕازی دەبووم، کەچی ئەوە خزمێکی نزیکەو خۆشەویستە.

ئەبوتالیب بەم وەڵامە گەشایەوە تۆزێك بێدەنگبوو، سەیری خەدیجەی کرد خەریکبوو دەم بکاتەوە، خەدیجە زوو تێگەیشت مەبەستی چیە، بۆیە بە زەردەخەنەیەکەوە خێرا گوتی:

ئاواتەکەت دەهێنمەدی، کرێی موحەممەد وەکو کرێی هاوڕێکانی دانانێم، بەڵکو

دوو ئەوەندەی ئەوانی پێ دەدەم، چونکە ئەو زۆر شکۆدار و گەورەو رێزدارە، بۆیە دەبێ کرێیەکەی لە ئاست خۆی بێت، دووبارە ئەبوتالیب سوپاسی کرد، دوای ئەوە ماڵئاوایی کردو گەڕایەوە لای برازاکەی تامزگێنی پێ بدات، بۆیە بەخێرایی رۆیشت بۆ ماڵی موحەممەد.

# دیـــدار

ئەبوتالیب باسەکەی بۆ موحەممەد(درودی خوای لەسەربێت)گێڕایەوە،بەم قسانەی مامی دڵخۆش و شادبوو، دوایی مامی پێیگوت:

ئێستا برۆ بۆماڵی خەدیجە بزانە چ کارێکت پێدەسپێرێت؟.

ئەویش بەرەو ماڵی خەدیجە کەوتەڕێ،کاتێ گەیشتە ئەوێ، لەدەرەوە چاوی بەخانووێکی فراوانی دوو نهۆمی گەورە کەوت، دەرگایەکی گەورەی هەبوو، ئەوەی سەیری بکردبایە یەکسەر بیری لەفراوانی خانووەکەو گەورەیی دانیشتوانەکەی دەکردەوە، راوەستاو سەیری کرد، خەڵکێکی زۆر گەورەو بچووک پیاو و ژن دەچنەژوورەوەو دێنەدەرەوە، هەندێك شتومەکیان پێبوو، هەندێك دەست بەتاڵبوون، کەنیزەو رەنجبەران و دەست و پێوەندەکان لە جموجۆڵدابوون، بەجل وبەرگی خاوێن، بەڕووێکی گەش، لەناو خەڵکەکە دەهاتن و دەچوون.

موحەممەد(درودی خوای لەسەربێت) لەیەکێکیان نزیکبوەوە، داوای لێ کرد ئایا رێگا هەیە بچێتە لای خەدیجە؟، لەوەڵامدا گوتی:

فەرموو رێگا هەیە.

لەدەرگا گەورەکە چووەژوورێ، بووە حەوشێکی یەکجار فراوان، خزمەتکارێك بە یاوەرێتی بردیە ژوورێك، گوتی لێرە چاوەڕوانبە، ژوورەکە فراوانبوو چەندین مافووری گرانبەهای تێدا راخسترابوو، مافورەکانی زۆر رەنگین و سەیربوون،

دیوارەکانی ژوورەکە وێنەی جوان و قەشەنگی لەسەر دروست کرابوو، ئیتر لەلایەکی ژوورەکە دانیشت و چاوەڕوان بوو، زۆری نەخایاند ژنێکی دەم و چاو خڕ، چاو گەورە، پرچ ( قژ ) درێژ، سپی پێست و چاو تیژ هاتە ژوورەوە، لێوەکانی بەزەردەخەنەیەکی فراوان کرابووەوە، کراسێکی ئاوریشمی بە گوڵ چنراوی جوانی لەبەردابوو، پێلاوێکی پێستی زۆر بەنرخی لەپێدابوو، ملوانکەیێکی گەوهەری جوان بەملیدا سووڕا بووەوە، گوارەیەکی مرواری لە گوێدابوو، لە دەرگایەکی تایبەت هاتە ژوورەوە.

موحەممەد(درودی خودای لەسەربێت) هەڵسا سڵاوی کرد، ئەویش وەڵامی دایەوە، پاشان ژنە گوتی:

دانیشە، ئەمیش چوو لەدووری ئەو دانیشت.

ئەو خەونەی چەند ساڵ لە مەوبەر خەدیجە بینیبووی، کاتێ ئامۆزاکەی وەرەقەی کوڕی نەوفەل پێیگوت تۆ شوو بەپێغەمبەرێك دەکەیت، هەرگیز لە یادی نەمابوو، چونکە چەندین ساڵبوو تێپەڕیبوبوو، بەڵام شتێکی سەیرە ئێستا واهەست دەکات لەناو خەونەکەدایە، دەبیینی وا خۆر دێتە ماڵەکەی و پڕشنگی ڕووناکیەکەی ماڵەکەی ڕۆشن کردووە، پاشان مەککەو پاشان سەرجەم جیهانی گرتەوە، خەدیجە هەستی کرد لەبەردەم لاوێکی زۆر گران و سەنگین و بەسامە، خاوەن کەسایەتییێکی یەکجار بەهێزو خووڕەوشتێکی زۆر بەرزە، لەبەر ئەوەی ئەم کوڕە گەنجە یەکەم جاریبوو دەهاتە ناو کاری بازرگانی، بۆیە خەدیجە باسی کاروان و بازرگانی و جۆری کاڵاکان و کەلوپەلەکانی کرد، کە چ سوود و قازانجێکیان هەیە، باسی مەترسیەکانی ڕێگاو تاڵانکردنی کرد، باسی سوودو قازانجی کاروانەکانی پێشووی کرد، باسی قۆناغەکانی ڕێگای کرد، ئەوشوێنانەی تێیدا دەوەستن و ئالیك و ئاو و خواردنی لێ وەردەگرن، لەگەڵ ئەو هۆزانەی بە درێژایی ڕێگاکە بازرگانیان لەگەڵدا دەکەن، هەروەها باسی ئەو بازرگانانەی بۆکرد پێیی پەسندە لە وڵاتی شام و مامەڵەیان



لەگەڵدابکەن.

موحەممەد(درودی خوای لەسەربێت) چاوی بڕیبووە زەوی و سەری دانەواندبوو، گوێیدابووە قسەکانی خەدیجە تا کۆتایی هات، دوای ئەوە هەڵساماڵئاوایی کردو بەرەوماڵی خۆی گەڕایەوە.

دوای ئەوە خەدیجە هەمیشە بیری لە موحەممەد دەکردەوە، دەیگوت ئەوەی خەڵك باسی لێوەدەکات، ئەو کوڕە نەرمونیانە خووڕەوشت بەرزە هێشتا زۆر لەوە زیاترە، بۆیە ئەو ڕۆژەی کاروانەکەی بەڕێکرد پارەو ماڵ وسامانی خۆی بە موحەممەد سپارد، هەروەها چەند ئامۆژگاریەکی کرد،(مەیسەرە)ی خزمەتکاری تایبەتی خۆی خستە ژێر فەرمانی، پێیگوت هەرگیز لە فەرمانی موحەممەد دەرناچیت و گوێڕایەڵ و ملکەچی دەبیت، پاشان وەکو کاروانەکانی پێشوو بەڕێیکردن.

کاروانەکە بەرەو باکووری شاری مەککە ڕۆیشت، موحەممەد(درودی خودای لەسەربێت) لەسەر پشتی وشترێك بوو، مەیسەرە لە تەنیشتیەوە لە سەر پشتی وشترێکی تربوو، خەدیجە ڕاوەستا سەیری کاروانەکەی کرد، ئیتر بەرەبەرە بە دوورکەوتنەوە، تا لەتواناو بازنەی بینینی چاو چوونەدەرەوە.

کاروانەکە ڕێگای دەبڕی بەنێو چیاو لم و بیاباندا دەڕۆیشت، موحەممەد(درودی خودای لەسەربێت) بەم گەشتە دڵخۆش و شادبوو، شەوان سەیری ئاسمانی دەکرد، بیری لە توانای خودا دەکردەوە، چۆن ئەم ئاسمانە فراوانەی ئاوا ڕێکوپێك دروستکردوەو داناوە، ئەو هەموو ئەستێرانە چرا ئاسا، چۆن لەوێ و لەوێ دەدرەوشێنەوە و پرشنگدارن، لە ڕۆژیشدا بیری لەو هەموو دەشتە پان و فراوانانە دەکردەوە، لە بیابان و لمی وردی و لە چیاو و چۆڵ دەکردەوە، کاروانەکەش خێرا بەرەو ئامانجەکەی بەڕێوەبوو.

لەلایەکی تر خەدیجە بیری هەمیشە لەو خۆرە دەکردەوە هاتبووە ماڵەکەی،

بیری دەهاتەوە وەرەقەی ئامۆزای چۆن باسی ئەو پێغەمبەرەی دەکردو دەیگوت خاوەن دەروونێکی پاك و بەهێزە، ڕەوشت بەرزو ڕاستگۆ و ئەمینە، بیری دەکردەوە ئەم ئاکارو خەسڵەتانە هەمووی لە موحەممەدا(درودی خودای لەسەربێت) دێتەدی، وێڕای ئەمەش ئەو ڕۆژەی موحەممەد هاتەماڵەکەی وەك خۆری خەونەکە وابوو، ئیدی چەند جار بەتەنیا دادەنیشت، بیری لەبەسەرهاتەکە دەکردەوە، هەندێ جار وای بەلاوە پەسندبوو ئەم باسە لای خۆشەویستانی بدرکێنێ، بەڵام دوایی دەیگوت واچاکە باس نەکەم تا بە تەواوی شارەزای ئەو پیاوە دەبم، بەڵام ڕۆژ لەدوای ڕۆژ زیاتر بیری دەکردەوە، هەرچەند کاروانەکە پتر بەرەوپێش دەچوو بۆ شام، خەدیجە زیاتر بیری دەکردەوە، هەستی دەکرد شتێك کەوتۆتە ناو دڵ و دەروونیەوە، بۆیە لەدڵی خۆیدا دەیگوت:

خۆمن وازم لەپیاوان هێناوە، شووکردنەوەم لەبیر چۆتەوە، ژیانم ئاسوودەو خۆشە، سەرجەم سەرۆك و پیاو ماقوڵانی مەککەم ڕەتکردەوە،چەند دەوڵەمەندو گەورە پیاوان و ناوداران بۆ خوازبێنیم هاتن، لەوەڵامدا گوتم شووناکەمەوە، کەچی ئێستا دەڵێی خەریکە دڵم بۆ ئەم گەنجە دەچێت !؟.

تەنانەت ڕۆژێك بەخۆی داچووەوەو خۆی سەرکۆنەکرد، بەڵام دوایی سەرنجیدا ئەم سۆزەی نێو دڵ و دەروونی ئەو جیایە لە سۆزی ئاسایی دڵی ژنان، چونکە ئەوەی ئەو دەیەوێ خەسڵەتی ڕەووشت بەرزی و دەروون پاکیە، سازگاری گیان و بێ گەردیە، ئیتر نازانێ سەرچاوەو چاووگی ئەم هێزە هەڵقوڵاوەی ناو دەروونی چیە بەمجۆرە دەیەوێت ئەم لاوە بۆ خۆی ڕابکێشێت.

هەر چەند قسەی ئامۆزاکەی بیردەکەوتەوە کاتێ پێیگوت تۆ شوو بە پێغەمبەرێك دەکەیت، بەسەرسامیەوە لەخۆی پرسیار دەکردو دەیگوت:

بەڕاست من شوو دەکەم و هاوسەرەکەشم دەبێتە پێغەمبەر!؟.

دوایی لەناو پرسیارەکان دەیگوت:

دەبێ ئەم لاوە پێغەمبەرەکەی وەرەقە مزگێنی پێدام ئەو نەبێت؟ ئەی ئەگەر ئەوە نەبێت دەبێ پێغەمبەرەکە کێ بێت؟!.

لەگەڵ ئەوەشدا زۆر هەوڵیدەدا ئەم شتە لە دڵ دەربکات و شووکردنەوە لە خۆی دووربخاتەوە، بیست ساڵە بەدیار منداڵەکانی دانیشتوە نەی ویستووە شووبکاتەوە، تازە چۆن شووبکاتەوە؟.

بەڵام کاتێ ئەم باسەی لە بیر خۆی دەبردەوە، دەچووە لای کەسانی تری ناوکاروانەکە یان بیری لە کەلوپەلەکان دەکردەوە، ئیتر لەناکامدا بەرەبەرە دەگەڕایەوە بیرکردنەوەی پێشوتری، چونکە لە کاروانەکە دەگەیشتە موحەممەد( درودی خودای لەسەربێت )، ئیتر ئەم جارەیان لە پێشوو پتر بیری دەکردەوە، ئاخۆ چی دەهێنێت لە شام، یان کاتێ هاتەوە ئەو چی بکات.

## گەڕانەوەی کاروانەکە

گەڕانەوەی کاروانەکە نزیکبووەوە، مەککە خەریکی خۆ ئامادەکردنە بۆ پێشوازی کردن، خەدیجە هەرچەندە دڵ و دەروونی لای موحەممەدە(درودی خودای لەسەربێت)، وێڕای ئەوەش بیری لە ماڵ و سامان و بازرگانیەکەی دەکردەوە، لەناکاو یەکێك هەواڵی نزیکبوونەوەی کاروانەکەی هێنا، ئیتر خەڵك کەوتنە جوولە، بەتایبەتی بازرگانەکان و کرێکارەکان، کەوتنە خۆسازدان بۆ گواستنەوەی کەلوپەلەکان، هەروەها خەڵکی هەژارو نەداریش چاوەڕوانی گەیشتنی کاروانەکانبوون، چونکە بازرگانە بەبەزەییەکان بەخشش و چاکەیان لەگەڵدا دەکردن بەتایبەتی کاتێ قازانجی چاکیان بکردایە، دایکان سۆزیان بۆ کوڕەکانیان هەڵسابوو، هەروەها ژنان بۆ هاوسەرەکانیان، سەرەڕای ئەوەش نەیاندەزانی لەم گەشتەدا کێ دەگەڕێتەوەو کێ مردووە و ناگەڕێتەوە.

ڕۆژی دواتــر لەگــەڵ گزنگــی خــۆر، شــەقام و کۆڵانــەکان جوولــەی زۆرتــری بەخۆیەوەدیت، زۆرکەس چوونە دەرەوەی مەککە، لەسەر شوێنی بەرز وەستان، تازوو پێـشوازی لەکاروانەبکـەن و مزگێنــی گەیشتنیـشی بەخـەڵك ڕابگەیـەنن، بێگومـان خەدیجەش وەکو خـەڵك خۆی ئامـادە کـرد، کـەنیزەکانی دڵخۆش و شـادمان بـوون، هەموویان بەهیوای دیاری جوان و بەهاداربوون.

کاتی نیوەڕۆبوو، قرچەی گەرمابوو، خەدیجەو هەندێ کەنیزەی، سەرکەوتن بـۆ نهۆمی دووەمی خانووەکە، زۆر بە پەرۆشـەوە چاودێری ڕێگایـان دەکـرد، کـەنیزەکان زۆر چاك چاویان بڕیبوە ڕێگاکانی باکووری مەککە، تا مزگێنی گەیشتنی کاروانەکەی پێبدەن، هەر یەکەو دەیویست پێشی ئەوەی تریان کاروانەکە ببینێت.

لــەناکاو لەئاســۆی دووری بیابــانی بــاکوری مەککــەوە تارمــایی کاروانەکــە بەدەرکەوت، خەدیجە هەستی کرد لەگەڵ بەدیکردنی کاروانەکە خەریکە نزمی دڵی خێراتر لێدەدات، هەرچەندە زۆر دووربوو، بەڵام زۆر بەوردی سەیریدەکرد، هەوڵیدا بـەڵکو چـاکتر ببینێـت، ئـیتر بەرەبـەرە تـا نـزیکتر دەبوونـەوە بێگومـان چـاکتر دیـار دەبوون، لە پڕ یەکێك لە کەنیزەکان بانگی کرد گوتی:

خانمەکەم، موحەممەد، ئەوەتا ئەوە موحەممەدە، مەیسەرەش لـە تەنیـشتیەتی، موحەممـەد (درودی خـودای لەسـەربێت) لەسـەر پـشتی ووشـترەکەی بـوو، مەیـسەرە لەتەنیـشتیەوەبوو، سـەرجەم ووشـترەکانی کاروانەکـەش بەدوایانـدا دەهـاتن، بـەڵام خەدیجە شتێکی سەیری بینی! کاروانەکە هەمووی لـە ژێـر تیـشکی گـەرمی خۆرەتـاو بــوون، تــەنیا موحەممــەد نــەبێت (درودی خــودای لەســەربێت)، پەڵــە هــەورێك بەسەریەوەبوو، تـەنیا سێبەری لـە ئـەو دەکـرد، کـەس بـۆی نـەبوو بـچێتە ژێریـەوە، تەنانەت مەیسەرەش بۆی نەبوو بچێتە ژێر ئەو سێبەرەوە، خەدیجە پێیوابـوو تـەنیا ئەو ئاگاداری ئەم شتە سەیرەیە و دەیبینـێ، کەچـی لـە پـڕ کەنیزەیـەك لەنزیکیـەوە وەستابوو بەسەرسامیەوە گوتی:

خانمەکەم، تۆ نابینیت چۆن موحەممەد لە ژێر سێبەر دایە، خەڵکیش هەمووی لەبەر خۆرەتاوون، سێبەرەکەش لەگەڵ ئەو دێت و دەچێت، تەنانەت لەگەڵ ئەو لار دەبێتەوە.

بەڵام خەدیجە وەڵامی نەدایەوە، بەڵکو سەیری کاروانەکەی دەکرد تا گەیشتە ناوشاری مەککەو لەشوێنی تایبەتدا ڕاوەستا، ووشترەکان دەستیان کرد بە یخبوون، ئیتر خەڵك بەپەرۆشەوە بەرەوپیری کورو باوك و براو هاوسەرانیان چوون، پرسیاریان کرد کێ ماوەو کێ نەگەڕاوەتەوە.

موحەممەد(درودی خودای لەسەربێت) لەگەڵ مەیسەرە چوونە ماڵی خەدیجە، زۆر بەگەرمی و ڕوویێکی گەشەوە پێشوازی کردن، بەڵام کاتێ موحەممەد(درودی خودای لەسەربێت)نزیکبووەوە، خەدیجە سەرسام بوو، زۆر بەلایەوە سەیربوو چۆن لەڕوخساری موحەممەدا( درودی خودای لەسەربێت) هەمان خۆری خەوەکەو ڕووناکی بەدی دەکات، ئیتر سڵاوی کردو وەڵامی دایەوە، بەڵام موحەممەد(درودی خودای لەسەربێت) لەوێ نەمایەوە، بەڵکو زوو چووەوە بۆ ماڵی خۆی و لەوێ پێشوازی لە مامەکانی و خزم و خۆشەویستانی کرد، دوای داگرتنی کاڵاکان، خەدیجە چووەلای کۆگاکان، کاڵاو کەلوپەلە بازرگانیەکەی پشکنی، بەڵام حەپەساو بەسەرسامیەوە سەیری کردو گوتی:

ئەم هەموو کەلوپەلە چیە موحەممەد هێناویەتی؟،

ئەو هەموو سوودو قازانجەی چۆن کردوە؟،

چۆن ئەو هەموو شتوومەکەی کڕیوە، پارەی لە کوێ هێناوە؟.

جگە لەوەش جۆری کاڵاکان و نرخەکەی سەرسامی کردبوو، بۆیە بانگی مەیسەرەی کردو گوتی:

ئەوەچیتان کردوە مەیسەرە؟، ئەو هەموو قازانجە چیە ؟، چۆن دەستتان کەوتوە؟.

مەیسەرە خێرا گوتی:

خانمەکەم ئەوە خێرو بێری موحەممەدە، هەر ئەوەبوو ئێمە گەیشتینە شاری بوسرا (بصری)، چووینە ناو بازاڕەکەی، کڕیارەکان تێکڕا لەسەر ئێمە کۆبوونەوە، کاڵاو کەلوپەلی ئێمە وا لەبەر چاویان پوخت و ڕێك و چاك دیاربوو، چۆن بڵێی بازاڕ لە کاڵاو شتوومەکی ئێمە بەملاوە هیچی تری لێ نەبێت، بەڵام موحەممەدیش لەفرۆشتن زۆر کارامەو لێزانبوو، تەنانەت بەماوەیەکی کەم هیچمان نەما، بازرگانەکانی چوار دەورمان سەریان سوڕمابوو زۆر لایان سەیر بوو دەیان گوت:

ئەوە چیە مەیسەرە کاڵاو کەلوپەلی ئێوە جیایە، یان پێش ئەوەی ئێمە بێینە ئێرە دیارە ئێوە لەگەڵ بازرگانەکانی شام ڕێککەوتوون.

خەدیجە بەلایەوە سەیر بوو گوتی:

بەڵام بەهای کاڵا فرۆشراوەکان زۆر کەمترە لەوەی کڕیوتانە، ئەگەر بێتوو بەدوو بەسێ بە چوار جار گرانتریش فرۆشابێت، هێشتا ناکات بەهای ئەم کەلوپەلانەی هێناوتانە.

مەیسەرە گوتی:

خانمەکەم، موحەممەد لەفرۆشتن و لەکڕیندا خودا یاوەریبوو، زۆر سەیربوو کاتێ بچووبایە بۆ هەر کۆڵانێك لە بازاڕەکە، هەر فرۆشیارەو بۆلای خۆیان بانگیان دەکرد، کەلوپەلەکانیان دەخستە پێش دەستی، وابزانم ئەگەر بێ پارەش داوای بکردبایە پێیاندەدا، چونکە هەر نرخێکی بیگوتبایە نەیاندەگوت نا، خەڵك هەموو حەپەسابوون، دەیانگوت ئەم بازرگانە کێیە دەستی لە هەموویان سەندوە، سەرەڕای ئەوەش ڕوخسارێکی وای هەیە دڵی خەڵك بۆخۆی ڕادەکێشێت و خەڵك خۆشی دەوێت، تەنانەت بازرگانەکانی خۆمان بەلایانەوە زۆر سەیرە، چۆن موحەممەد لەوان گرانتر شتەکانی فرۆشت و هەرزانتریش کڕیەوە، تەنانەت جارێکیان پێیانگوتم:

ئەوە چیە مەیسەرە؟، گوتمان لەگەڵ کڕیارەکان ڕێککەوتوون، بەڵام خۆ لەگەڵ

فرۆشیارەکانیش هیچتان لە نێواندا نیە؟!.

خەدیجەزۆر دڵشادبوو، بەهێمنی گوتی:

مەیسەرە باسی قسەکانتان بکە، لەرێگادا باسی چیتان دەکرد، چونکە هیچ نەماوە بۆم باس نەکەیت، وادیارە موحەممەدت زۆر بەلاوە گرنگ و سەیرە؟.

مەیسەرە پێکەنی و گوتی:

خانمەکەم، ئەم موحەممەدە پیاوێکی زۆر سەیرە، بۆم باسکردی لەکڕین و فرۆشتن چەند سەرکەوتوو بوو، لەوانەیە هەندێ کەس بڵێن ئەوە بەخت یاوەریبووە و زۆرکەس ئاوای بۆ ڕەخساوە، یان بڵێن لەم بوارەدا شارەزابووە ئیتر دەرفەت و هەلی بۆ هاتووە، بەڵام لە شتێکی زۆر سەیر و نامۆ سەرمەسوڕماوە!، کەشوهەوا زۆر گەرمبوو، تیشکی هەتاو وەك بڵێسەی ئاگر گڕی بەر دەدایە ڕووی ئادەمیزاد، کاتێ ئێمە لە مەککە دەرچووین، چەفیەیەکمان کرد بە دووان و سییان بۆ داپۆشینی سەرو مل و ڕوخسارمان، هەروەها بۆ خۆپاراستن لە خۆرەتاو ئەوەی لە بەردەست بوو لە تواناماندابوو کردمانە سێبەر و چەتری سەرمان، تەنیا موحەممەد نەبێت ئاسمان سێبەری بۆ دەکرد، سێبەرێك قەبارەکەی هێندەی ئەم و ووشترەکەی بوو هەمیشە بەسەر سەریەوەبوو، هەرگیز لەو جیانەدەبووەوە، تەنانەت گەیشتینە شام، ئێوارە ڕۆژئاوا دەبوو سێبەرەکە نەدەما، ڕۆژی دواتر خۆر هەڵدەهاتەوەو بەرزدەبووەوە دووبارە سێبەرەکە بە شێوەی جاران دەگەڕایەوە سەرسەری موحەممەد، مەیسەرە کەمێك بێ دەنگبوو، سەیری خانمەکەی کرد بینی حەپەساوە، دوایی گوتی:

خەڵك هەموویان بەلایانەوە زۆر سەیربوو، ئەم پەڵەهەورە ئاوا سێبەر لە موحەممەد دەکات، لەوەش سەیرتر، ئەگەر یەکێك بچووبایە ژێر سێبەرەکە، هەورەکە بەدوور دەکەوتەوە، ئەگەر موحەممەد بڕۆشتبایە ئەوا هەورەکە لەگەڵ ئەو دەڕۆیشت، سەرەڕای ئەوەش موحەممەد هەمیشە لەخەڵك دابڕاوبوو، زۆر بیری دەکردەوە، ئەگەر پرسیاری لێ نەکرابا قسەی نەدەکرد، کاروانچیەکان لەکاتی

پشوودانیدا بۆ ئەوەی تۆزێك ماندووبوون و ئەشكەنجەو ئازار و تەنیایی ڕێگایان سووك بكەن و لەبیریان بچێتەوە، دەستیان دەكرد بەگاڵتە و ئاهەنگ گێڕان، كەچی موحەممەد هەرگیز بەشداری نەدەكرد.

پاش ئەوە خەدیجە لەبیركردنەوەدا هوشیار بووەوەو گوتی:

ئەری مەیسەرە! موحەممەد لە وڵاتی شام چی دەكرد؟، ئایا دڵی دارو باغ و خەڵك و هەموو شتێكی خۆش كرد؟.

مەیسەرە خێرا گوتی:

موحەممەد لەوێ بەشداری بازرگانەكانی نەدەكرد، هیچ حەزی لەو شتانە نەبوو ئەوەی ئەوان حەزیان لێیبوو، بەڵكو دیمەنەكانی شامی زۆر بەلاوە سەیر بوو، دەیگوت خودا چی دروست كردوە بۆ ئادەمیزاد، چ جۆرە ڕووەكێكی لەسەر زەوی رواندوە، لە ڕووەك و گیای زۆر ووردو بچووكەوە بگرە، تا دەگاتە دارو درەختی زۆر گەورە، چۆن ئەم جۆگەو ڕووبارانەی پیادا دەڕوات، هەروەها بیری لەوە دەكردەوە چۆن خودا ووڵاتی ئێمەی كردووە بەبیابان، ئەئاوو ئەڕووەكی تیادا نیە، كەچی ووڵاتی شام بەهەشتی سەر زەمینە، داری خورما و زەیتوون و ترێ و هەموو جۆرە دانەوێڵەیەك و چیمەن و باخچەی فراوان كەش و هەوایەكی فێنك و خۆشی هەیە، كەچی لای ئێمە ئاوهەواكەی گەرمە، خەڵكی شام لە ژیانێكدان و ئێمەش چۆن دەژین، ئیتر هەمیشە بیری دەكردوە، خەڵك بۆ خۆیان دەڕۆیشتن، كەچی ئەو لەلای كەلوپەلەكان جێدەما، هەمیشە بیری دەكردەوە تیاڕامان و سەیركردنی هەبوو بۆ سروشت و هەموو بوونەوەر، تەنانەت هاتینەوە ئێرە.

مەیسەرە كەمێك بێدەنگبوو، پاشان بە حەپەساویەوە گوتی:

باوەڕبكە خانم، ڕەنگە ئەو پیاوە پێغەمبەرە چاوەڕوان كراوەكەبێت، كەخەڵكی باسی دەكەن و دەڵێن لەوسات و سەردەمەدا دێت.

خەدیجە بەپەرۆشەوە گوتی:

مەیسەرە ئەوە چ دەڵێی، تۆچۆن گەیشتوویتە ئەم ڕاستیە؟.

مەیسەرە بەسەرسوڕمانەوە گوتی:

خانم، ئێمە کاتێ گەیشتینە بوسرا( بُصری )، موحەممەد لەژێر دارێك دانیشت، دارەکە هیچ جیاوازێکی نەبوو لەگەڵ دارەکانی دەوروبەری، لە نزیك ئەو دارانە ژوورێکی بچووك هەبوو، ڕەبەنێك واتە(ڕاهیبێکی مەسیحی) تێیدا دەژیاو خەریکی خواپەرستیبوو، هەر ئەوەبوو ڕەبەنەکە سەری لە کولانکەی ژوورەکەی دەرهێنا، کاتێ موحەممەدی بینی خێرا زۆر بە پەرۆشەوە پرسیاری لەمن کردو گوتی:

ئەم پیاوە کێیە لەژێر ئەودارە دانیشتووە؟.

منیش پێمگوت پیاوێکی قوڕەیشیە.

ئەمجارە لەجاران بە تووندترو بەپەرۆشتر گوتی:

چۆن ئەو پیاوە ناردراوەو هاتووە؟!

منیش بەسەرسامیەوە گوتم:

تۆ چیت دەوێت، مەبەستت لە ناردن چیە!؟.

ڕەبەنەکە گوتی:

ئەگەر پیاوەکە تائێستا نەناردرابێت و نەهاتبێت، ئەوا بەدڵنیاییەوە دەڵێم ئەو پیاوە دەبێتە نێردراوی خوداو پەیامی خودا بۆ سەرجەم خەڵك دێنێت،چونکە ئەوەی پێغەمبەر نەبێت لەژێر ئەم دارە دانانیشێت!!!.

خەدیجە ئەم هەواڵەی زۆر بەلاوە سەیربوو، ئیتر دیسان خەونەکەی لە سەرەتاوە، تا کۆتایی بیرهاتەوە، دیسان قسەکانی وەرەقە کوڕی نەوفەلی کەوتەوە یاد، هەروەها شێوەی موحەممەدی(درودی خودای لەسەربێت)هاتە پێشچاو، لەدڵدا دەیگوت ئەو پیاوە زۆر لەوەدەچێت ئەوەی خەڵك باسی دەکەن، ڕەنگە پێغەمبەرە چاوەڕوان کراوەکەبێت، دوایی بەدڵنیاییەوە دەیگوت:

باشە ئەگەر ئەو پێغەمبەرەی باسی دەکەن، ئەو نەبێت ئەی دەبێ کێ بێت؟، لە



کۆگاکانی گەڕایەوە جلەکانی گۆڕی، خێرا بۆ ماڵی وەرەقەی ئامۆزای ڕۆیشت بەسەرهاتەکەی چۆن بیستبوو، ئەوەی خۆیشی بینیبووی هەمووی بۆ گێڕایەوە، وەرەقە بەلایەوە سەیربوو بۆیە گوتی:

خەدیجە! ئەوەی تۆ باسی دەکەیت دیارە ئەو پیاوە پیاوێکی ئاسایی نیە!.

خەدیجە خێرا گوتی:

تۆ بڵێی پێغەمبەری چاوەڕوانکراوبێت؟.

وەرەقە پێکەنی و گوتی:

لەوانەیە، چونکە خەسڵەتەکانی ئەم پیاوە لەگەڵ ئەوانەی من لە کتێبە پیرۆزەکان خوێندوومەتەوە یەك دەگرێتەوە، بەلام سەرەڕای ئەوەش کێ دەزانێ خودای بالاو کاربەجێ چی دەکات، تەنیا خودا خۆی دەزانێت ئەو ڕێزو بەخششەو پلەوپایە بەرزو پیرۆزە بەکێ دەبەخشێت و لەناو خەڵك بەرزی دەکاتەوە.

خەدیجە گەڕایەوە ماڵەوە، بەدەم ڕێگاوە نیازی ئەوەی لەدڵدابوو پیرۆزی و شکۆمەندی پێغەمبەرایەتی لەدەست خۆی نەدات، شوو بەم لاوە بکات، چونکە هەموو نیشانەکان ئەوە دەسەلێنن ئەوە پێغەمبەری چاوەڕوان کراوە، ئەو هیوایەی لەودا بەدی دەکرێت، لەکەسی تردا نیە.

## بیرکـردنەوە

خەدیجە لەوەرەقە و لەخەڵکی تریش بیستبووی بەم زوانە پێغەمبەرێك دێت، لە سایەی ئەودا زەوی پڕ دەبێت لە دادوەری، هەموو ڕەفتارێکی خراپەکاری لە ناودەبات، خەڵك بەیەکسانی و بەیەك چاو سەیردەکرێن، ستەمدیدەکان لە چەوسانەوەو ستەمکاری ڕزگار دەکات.

بە نزیکبوونەوەی هاتنی ئەو پێغەمبەرە خەدیجە زۆر دڵشادبوو، وێڕای ئەوەش



بیری لە شکۆمەندی و گەورەیی ئەوژنە دەکردەوە بە هاوسەرێتی ئەم پێغەمبەرە شاد دەبێت، چۆن دەبێ یارمەتی هاوسەرە پێغەمبەرەکەی بدات، تەنانەت خەریکی پەیامی خودا بێت و سەرقاڵی کاری لاوەکی نەبێت، ئاخۆ خودا لە بری ئەوە چ پاداشتێکی پێدەداتەوە، ئیتر دەرەنجام سامان و بازرگانی خۆی بەکەم هاتە بەرچاو لە ئاست هاوسەرێتی پێغەمبەردا،لەمیانەی ئەمەدا بیری لە موحەممەد دەکردەوە(درودی خودای لەسەربێت)، حەزیدەکرد ئەم گەورەیی و شکۆمەندیە بەر ئەو بکەوێت، چونکە هەرچەند ئەو دەبینێت خۆرەکەی دێتەوە یاد، چۆن هاتە ماڵەکەی و ڕۆشنی کرد، دوایی تیشکی بەرەو هەموو جیهان ڕۆیشت.

ئیتر دەرەنجام کەوتە بیرکردنەوە چۆن شوو بەموحەممەد بکات، ئەو پیاوە بەسام و گران و سەنگینە، دەروونێکی زۆر بەهێزی هەیە، تەنانەت ناتوانێت سەبارەت بەکاری بازرگانی و ئاسایی بیدوێنێت، چجای ئەم بابەتە چارەنووس سازە!.

ئەی ئەگەر وەك پێشنیارێك پێیگوت شووت پێدەکەم، بەڵام موحەممەد گوتی نا!، ئەوکاتە چی بکات؟.

بە چ ڕووێك وەڵامی خەڵك بداتەوە!؟.

ئەی خەڵك چی دەڵێن، گەر بزانن ئەو پێیگوتوە شووت پێ دەکەم و ئەمیش گوتویەتی نا، ناڵێن ئەی پێشتر بۆچی ئەم هەموو دەوڵەمەندو پیاو ماقوڵانی قورەیشی بە نائومێدی ناردۆتەوە!؟.

ئیتر بەبەردەوامی بیری لای پێغەمبەری چاوەڕوان کراوبوو، بەدڵنیایی و بێ گومانیش پێیوابوو موحەممەد(درودی خودای لەسەربێت) دەبێتە ئەو پێغەمبەرە، لە ئاکامدا بیرۆکەیەکی بۆهات ورێگا چارەیەکی دۆزییەوە، بانگی ژنێکی دڵسۆزی خۆی کرد، ئەم ژنە جێگای متمانەو پاراستنی نهێنیەکانی ئەو بوو، هەرگیز دەرگای نهێنیەکانی دڵی خۆی بۆ کەس نەدەکردەوە، تەنانەت بەرامبەرەکەی نەیدەزانی دڵی ئە ژنە چی تێدا حەشاردراوە، دیارییێکی نایابی پیشکەش کرد، لەو کاڵایانەی موحەممەد لە وڵاتی شام هێنابووی، ئینجا بەچپەو زۆر بەهێمنی پێیگوت:

نەفیسە ئەم دیاریەت بەلاوە چۆنە!؟.

نەفیسە بەسەرسامیەوە سەیری دیاریەکەی کرد، دەستی دایێ و چاوی پێیدا خشاند پاشان گوتی:

خانم ئەم شتەمان پێشتر نەبینیوە، دیارە ئەو کەسەی کڕیویەتی زۆر لێزان و کارامەو ڕەوشت بەرز بووە!.

خەدیجە پێکەنی و گوتی:

ئەمە نیشانەی خوو ڕەوشتی بەرزو جوانە، وانیە نەفیسە؟.

نەفیسە لەجاران بەپەرۆشتر گوتی:

بەڵکو بەڕای من ئەو کەسە خاوەنی بەرزترین ڕەوشت و جوانترین هەڵبژاردن بووە!. پاشان ئاوڕی لە خەدیجەدایەوەو گوتی:

ئەمە ڕەوشتی موحەممەدە، وانیە خانمەکەم؟، چۆن خۆی جوانە، شتی جوانیشی خۆش دەوێت!.

خێرا خەدیجە گوتی:

داوێنی پاکە نەفیسە.

نەفیسە گوتی:

خەڵکی مەککە نەیانبینیوە وەك گەنجان هەڵسوکەوت بکات، جگە لەئەمینی و ڕاستگۆیی و هەموو خەسڵەتەکانی بەرزی مرۆیی بەملاوە هیچی تریان لێی نەزانیوە، وێڕای گەنجیەتی خۆی پیاوێکی بەتوانایە،جوانە ڕێ و ڕەچەڵەکی ماقووڵە،لە نێو بەدڕەووشتی و خراپەکاری مەککەدا دەژی، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا ئەمینە دەستو دامێنی پاکە.

نەفیسە کەمێك بێدەنگبوو، سەیری خەدیجەی کرد پاشان بەزەردەخەنەیەکەوە گوتی:

کارێکی چەند چاکە گەر موحەممەد لە کاری بازرگانیەتی تۆدا بەردەوام بێت.

تۆزێ بێدەنگبوو دوایی هاتەوە ئاخاوتن و گوتی:

خانمەکەم، موحەممەد لاوێکی بەتواناو رەوشت بەرزە، دەتوانێت لـەنێو سـەرۆک و ریش سپی و پیاوماقوڵانـدا جێگای خـۆی بکاتـەوە، ئـای چەند بەختـەوەر دەبێت ئەوەی شووی پێ بکات!.

خەدیجە هەستی کرد بەم قسەیە نزمی دڵی خەریکە زیاد دەبێت گوتی:

هاوسەرێکی چاکە، ها نەفیسە؟.

ژنە هەستی کرد خەدیجە چی لەدڵدایە، بۆیە خێرا گوتی:

هەموو کچێك ئاواتەخوازە ببێتە هاوسەری ئـەم پیـاوە، گەرچـی ئـەمرۆ نـەدارە، بەڵام ئەم جۆرە پیاوانـە بەئاسـانی دەوڵەمەنـد دەبـن و سـامان کۆدەکەنـەوە، چـونکە چالاکە دڵسۆزە هۆشمەندە دوورە لە شەڕو ئاژاوە، ئەم جۆرە خەسڵەتانەش لەپیاواندا گونجاوو لەبارن بۆ سەرکردەیی و سامان پەیداکردن.

نەفیسە کەمێك بێدەنگبوو، سەیری خەدیجەی کردو گوتی:

خانم بـەڕای تـۆ ئـەم لاوە کـە تائێستا ژنـی نـەهێناوە، دەبـێ لەبـەر ئەوەنـەبێت ژنێکی چاکی بەدڵی خۆی دەست نەکەوتبێت؟، مـن پێموایـە ئـەو خەسـڵەتانەی ئـەو دەیەوێت لە خەدیجەی چاکترین ژنی مەککەدا هەیە، جوانی دەوڵەمەنـدی پـاکیزەیی زیرەکی ئارامگرو نەرم و لە سەرخۆ دڵفراوان و دەستبڵاو لەوە زیاتر چی دەوێت؟.

تۆزێك بێدەنگبوو دووبارە گەڕایەوە سەرباسەکە، گوتی:

خـانم بـیرو ڕای موحەممـەد لـە گـەنجانی تـر جیایـە بـۆ ژنهێنـان، وەکـو ئـەوان بیرناکاتـەوە، چـونکە ئـەو خـۆی خـاوەن دڵێکـی گـەورەیـە، ئیـدی بـیر لـە ژنێکـی دڵ گەورەش دەکاتەوە!.

خەدیجە خێرا گوتی:

نەفیسە! گەورە، یان بچووك؟.

نەفیسە گوتی:

خانم لای موحەممەد جیاوازی تەمەن گرنگ نیە، بەڵکو ئەوەی بـەلای ئـەمجۆرە کەسانەوە گرنگە، تـەنیا دڵسۆزی و دەروونـی پـاکی و ڕەفتـاری چاکە، جگـە لەمـەش

جیاوازی نێوانتان چەندە؟، تەنیا پازدە ساڵە!!، هیچ کاتێك تەمەن بۆ ژنان پێوەرنیە ناخۆ گەورەیە یان بچووکە، چونکە هەندێ ژن هەیە ئەگەر بەتەمەنیش بێت بەڵام جوانی و قۆزی و ڕێکی هەر دەمێنێت و پێیەوە دیارە، نەختێ بێدەنگبوو دوایی گوتی:

خانم گومانم وایە موحەممەدیش لەوکاتەی تۆی بینیوە بیر لەتۆ دەکاتەوە، بۆیە ئەگەر حەزدەکەیت بە نهێنی، دوور لە چاو و گوێی خەڵك ئەو شتەی پێدەڵێین، ئەگەر ڕازیبوو زۆرچاکە، ئەگەر ڕازیش نەبوو ئەوا کەس بەم کارە نازانێت وهیچ زیانێکمان پێناگات.

خەدیجە بەم بیرۆکەیەدڵشادبوو، سەیری نەفیسەی کرد بەهێمنی و لەسەرخۆ گوتی:

حا نەفیسە کێ بەم کارە هەڵدەستێت؟.

نەفیسە بەبزەیەکەوە خێرا گوتی:

خانمەکەم من! من خۆم ئەم فەرمانەت بۆ جێبەجێ دەکەم.

خەدیجە بەم کارەی نەفیسە زۆردڵخۆش و شادبوو، کە ئەم ڕازە بە موحەممەد(درودی خوای لەسەربێت) بگەیەنێت.

ئیتر دوای ئەوە خەریکی قسەکردنبوون، لەمیانەی قسەکانیدا خەدیجە خەونەکەی بۆ نەفیسە گێڕایەوە، چۆن خۆر گەورەبوو هاتە ناوماڵەکەی، هەروەها وەرەقەی ئامۆزای چۆن ماناکەی بۆ لێکداوەتەوە، مەیسەرەش لەگەشتەکەدا چی بینیوە، چ قازانجێکی زۆری کردوە لەم کاروانەی دواییدا، تا ئێوارەهات خەدیجە هەموو ئەم باس و خواسانەی بۆ نەفیسە گێڕایەوە.

ئیتر نەفیسە بەدڵنیاییەوە پێیوابوو موحەممەد دەبێتە ئەو پێغەمبەرەی خەڵك باسی دەکەن، هەروەها سەبارەت بەم کارەی پێی سپێردراوە سەرکەوتوو دەبێت و مزگێنی سەرکەوتنەکەی بۆ خەدیجە دێنێتەوە.

# دركاندنی ڕازی دڵ

کاتێ تاریکی شەو باڵی بەسەر مەککەدا خشاند، نەفیسە بەهێمنی لەماڵی خەدیجە هاتەدەرەوە، تا خەڵك هەست بەم سەردانەی نەکەن و پەی پێنەبەن، بەرەو ماڵی موحەممەد(درودی خودای لەسەربێت) کەوتەڕێ، دوای ڕێگا وەرگرتن چووە ژوورەوە، بینی موحەممەد(درودی خودای لەسەربێت) سەری دانەواندوەو لەناو دەریای ئەندێشەدا بیردەکاتەوە، نەفیسە واهەستی کرد بۆ یەکەم جارە لە ژیانیدا ئەم پیاوە دەبینێت، لەوە پێشتر هەرگیز نەیبینیوە، پیاوێکی ڕوخسار ڕێك و شێوەجوان، چوارشانە، بالا مامناوەندی نەکورت نەدرێژ، قژی سەری زۆر ڕەش و درێژبوو، هەردوو برۆکانی گەیشتبوونەوە یەکتری، چاو گەورەو ڕووناکی ڕوخساری پرشنگی دەداو دەدرەوشایەوە، سلاوی کرد ئەویش سەری بلندکردو وەلامی دایەوە، کاتێ زۆر لە سەر خۆ و بەشەرمەوە فەرمووی:

نەفیسە خێرە بەم شەوە هاتووی؟.

نەفیسە هەستی بە سام و گەورەیی ئەو پیاوە کرد، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا بۆ ئەوەی هەست بەهیچ نەکات بە زەردەخەنەیەکەوە گوتی:

بۆ ئەوە هاتووم بەخێرهاتنەوەت بکەم.

نەفیسە چاوی بە چوار دەوریا گێڕا، بینی جگە لە(ئوم ئەیمەن) کەسی تر لەوێ نیە، ئەویش سەرقاڵی جێبەجێ کردنی کاروباری ماڵەکەیە، بۆیە یەکسەر گوتی:

ئەرێ موحەممەد لەم ماڵەدا هەست بەتەنیایی ناکەیت، چونکە تەنیا تۆو ئوم ئەیمەنن؟.

موحەممەد(درودی خودای لەسەربێت) بزەیەك کەوتە سەر لێوانی، فەرمووی:

نەفیسە پێم ناڵێیت چۆن ئەو تەنیاییەم چارەبکەم، خۆ من کابرایێکی هەژارم،

ئەوەی تۆ مەبەستتە من پێم جێبەجێ نابێت، سەرەڕای ئەوەش هەموو ژنێك گونجاو نیە بۆ ژیانی هاوسەرگیری، ژن هێنانیش یاری نیە، بەڵکو کارێکی گرنگ و پیرۆزە، ئەگەر هۆکارەکانی هەمووی بەدەست نەیەت و فەراهەم نەبێت مەبەستەکانی نایەتەدی، جاهەرکاتێك خودا گوزەرانم باش بکات و مارەیی ژنێکی چاکی پێ بەخشیم، ئەو کاتە پەنابەخودا ئەم کارە ئەنجام دەدەم.

نەفیسە بەم وەڵامە زۆر دڵشادبوو،چونکە زۆر زوو گەیشتە نیازو مەبەستی سەردانەکەی، بۆیە خێرا گوتی:

ئەگەر ژنێکی چاك و داوێنپاك و شکۆمەندو خاوەن سامان و زۆر دەوڵەمەند ڕێکبکەوێت دەتەوێت؟.

پێکەنی و فەرمووی:

نەفیسە ئەوکاتە مارەییەکەی زیاترە، تۆش دەزانی مارەیی دەوڵەمەندان چۆنەو چۆن باری پیاوان گران دەکەن، تەنانەت دەوڵەمەندەکانیش زۆربەیان ناتوانن داواکاریەکانیان جێبەجێ بکەن، جا من لە کوێ بێنم؟.

نەفیسە هێندەی تر دڵخۆش و شادبوو، هەستی کرد لە ئامانجەکەی زۆر نزیك بوومتەوە، بۆیە قۆزتیەوەو بەهێمنی گوتی:

ئەگەر ژنێکی دەوڵەمەند، چاك و جوان و شکۆمەند، بارت قورس نەکات، کارەکەت بۆ فەراهەم بکات و داوای مارەیی زۆر نەکات، دەتەوێت؟.

پێکەنی و فەرمووی:

خۆزگە! ئەم ژنە کێیە؟:

تۆزێ بێدەنگبوو خەریکبوو وشەکان لەدەمیدا بخنکێن، پاشان هەموو توانای خۆی کۆکردەوە، ئینجا توانی بەدەنگێکی نزم و باریك بڵێ:

موحەممەد ئەو ژنە خەدیجەیە، خەدیجەی کچی خوەیلد!.

موحەممەد(درودی خودای لەسەربێت) سەیری نەفیسەی کرد بێدەنگبوو،

هەستی کرد لە دڵەوە دەیەوێت خەدیجە بهێنێت، بەڵام حەزی دەکرد وەکو ئەو دەوڵەمەندبوایە ئینجا خوازبێنی بکردایە، بەڵام لەگەڵ ئەو قسەیەی نەفیسە،هەستیکرد خەسڵەتەکانی خەدیجە بەلایەوە مەزن و شکۆدار دیارە، بۆیە بەدەنگێکی پڕ لەهیواوە فەرمووی:

ئینجا کێ هەیە بتوانێت بەم کارە هەڵبستێت؟.

نەفیسە بەشادییەوە گوتی:

موحەممەد من بەمکارە هەڵدەستم، تۆ چاکترین هاوسەری بۆ یەکێکی وەك خەدیجە، تۆ ئەم کارە بەمن بسپێرە، بزانە چۆن هەوڵدەدەم واز لەم بیرو بۆ چوونەی پێشووی بهێنێت و ڕازی دەکەم شووبکاتەوە، ئیتر کاتێ لەم بیرۆکەیە لایدا، ئینجا یەکسەر داخوازی تۆی پێدەڵێم، باوەرناکەم ڕەتی بکاتەوە و پشت گوێی بخات!.

دوای ئەمە نەفیسە هەڵسا بەخێرایی و بەدڵێکی پڕ لەهیواو سەرکەوتوانە بەرەو ماڵی خەدیجە گەڕایەوە،کاتێ لەدەرگا چووە ژوورێ، خەدیجە پێشوازی کرد، نەفیسە مزگێنی ڕەزامەندی موحەممەدی(درودی خودای لەسەربێت) پێڕاگەیاند، خەدیجە لەخۆشیانا ماچی کرد، دوایی چوو هەندێ دیاری گران بەهای بۆهێناو پێشکەشی کرد.

ئیتر ئەو شەوە خەدیجە زۆر شادو بەختەوەربووبیری لەم بەخششە گەورەیە دەکردەوە چۆن دەبێتە خێزانی گەورەترین پێغەمبەرو خودا ئەوی بۆ ئەم هەڵبژاردوە.

بەیانی زوو کاتێ گزنگی خۆر لە لووتکە شاخەکانی مەککەیدا، خەدیجە یەکێکی بەشوێن مامیدا نارد، بۆ ماوەیەکی کەم مامەکەی هاتە ماڵی خەدیجە، دوای دانیشتن بەمامی گوت:

مامە بیرو ڕات چیە سەبارەت بە من و کاروبارەکەم؟.

مامی گوتی:

من بەلامەوە کارێکی چاك نیەو بەپەسندی نازانم، ئەگەر خومیلدی باوکیشت ئێستا لەژیان بوایە ئەویش بەوە قایلنەدەبوو، ژنێکی وەکو تۆ ئەو هەموو ماڵ و سامانەت کۆکردۆتەوە، کەچی شووناکەیتەوەو دەتەوێ بەتەنیا بژیت، چەندین پیاو ماقوڵی مەککە خوازبێنیان کردوویت، ئاواتەخوازن ببن بەهاوسەرت، بەڵام چی بکەین تۆ شەو و ڕۆژ خەریکی ماڵداری و کاروباری بازرگانیت، ئەگەر هاوسەرت هەبوایە ئێستا ئەو لە جیاتی تۆ کارەکانی هەڵدەسوڕاند.

خەدیجە گوێی لەقسەکانی مامی گرت تاتەواوبوو، پاشان بە زەردەخەنەیەکەوە گوتی:

باشە ئەگەر خەدیجە ئێستا بیەوێت شووبکات تۆ دەڵێی چی؟.

مامی زۆر بەووردی سەیری کردو گوتی:

ئەوە کارێکی زۆر چاکە، کەواتە تۆ ئێستا گەڕایتەوە هۆش خۆت، بەڵام پێویستە شوو بەپیاوێك بکەیت لەتۆ بوەشێتەوە، یەکێك لەناو قورەیشدا هەڵبژێریت لەپلەو پایەی تۆدابێت.

خەدیجە گوتی:

پێتوایە کێ پیاوێکی چاکە و تۆ کێت بەلاوە پەسندە؟.

مامی نەختێك بیری کردەوە دوایی گوتی:

ئەگەر بزانن تۆ شوودەکەیتەوە، ئەوا خەڵکێکی زۆر لەدەرگای ماڵەکەت دەدەن، بەڵکو لێتدەپاڕێنەوەو خۆیان دەخەنە ژێر پێت، بەڵام من ئەو کەسەم بەلاوە پەسندە، ڕێزی ژن بگرێت و بۆ خێزانەکەی بژیت و بزانێ مانای خێزانداری و هاوسەرێتی چیە، پێموایە ئەمجۆرە پیاوەش ئەمڕۆ لە مەککەدا دەگمەنە، ئەگەر هەبێت تەنیا سەرۆکەکان و پیاو ماقوڵەکانن.

خەدیجە گوتی:

ئەگەر پیاوێك مانای هاوسەرێتی بزانێت و ڕێزی خێزانەکەی بگرێت، بەڵام

هەزار بێت، تۆ ئەو کاتە ڕات چیە؟.

مامەکەی بەدەنگێکی بەرز گوتی:

هەزار ، هەزار !!.

دوای ئەختێك بێدەنگبوون و بیریکردنەوە، بەڕەزامەندیەوە گوتی:

ئەگەر پیاوێك لە مانای هاوسەرێتی بگات، ڕێـزی بگرێـت و مـافی پێبـدات، ئـەوە پیاوێکی چاکە، چونکە پیاوی ژیرو جەسوور، گەر هەوڵبـدات و تێبکۆشـێت بێگومـان زوو پێـدەگات، سـەرەڕای ئـەوەش تـۆ خـۆت زۆر دەوڵەمەنـدی، ئـەریَ نـەمزانی ئـەو پیاوەی باسی دەکەیت کێیە؟.

خەدیجە گوتی:

دەمەوێ بزانم سەبارەت بە موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵا ڕات چۆنە؟.

مامی گوتی:

بەڕاستی پیاوێکی گەورەو مەزنە، بەڕای من چاکترین هاوسەرە، خەدیجە ئەکەی پێیبڵێیـت نـا، خۆزگـە ئـەمکارە دوا نەکەوتبوایـەو زوو جێبـەجێ دەبوو، بـەڵکو زوو شووت پێیبکردبایە.

خەدیجە بەم وەڵامەی مامی زۆر دڵشادبوو گوتی:

دوێنێ شـەو موحەممـەد یـەکێکی ڕاسـپاردوە بـۆلای مـن داوای لێکـردووم شـووی پێبکەم، مامە ئایا تۆ بە موحەممـەد ڕازیـت؟، چونکە بـەبێ پـرس و ڕای تـۆ هـەرگیز وەڵامی نادەمەوە؟.

قسەکانی خەدیجە کاریگەریان کردەسەر دڵی مامی بۆیە گوتی:

ماوەیەکی دوورو درێژ دانیشتبوویت و خۆت گرتبـوو لـە شـووکردن، ئێـستا خـوا چاکترین دیاری بۆ ناردوویت، پیاوی وەك موحەممـەد زۆر دەگمەنـە، خۆزگـە باوکـت لەژیاندا دەبوو ئێستا بەچاوی خۆی دەیبینی خوا چ بەخششێکی لەگەڵ تـۆدا کـردوە، خوابەرەکەت بخاتە ئەمکارە، بەڵێ من ڕازیمە، ڕازیم.

موحەممەد(درودی خودای لەسەربێت) بەیانی هەڵسا چوو بۆماڵی ئەبوتالیبی مامی، تا لەم باسە ئاگاداری بکات و ڕای وەربگرێت.

مامی بە سەرسامیەوە گوتی؛

جا خەدیجە ڕازی دەبێت؟.

موحەممەد(درودی خودای لەسەربێت) فەرمووی؛

مامە ڕازی بووەدوای ئەوەی چەندین گەورەو دەوڵەمەندی نائومێدکرد، چەندین سەرۆکی ڕەت کردەوە، ئێستا بەهەژارێکی وەکو من ڕازی بووە!.

ئەبوتالیب سەری هەژاندو گوتی؛

ژنێکی ژیرو زانایە، پیاوان دەناسێت، تۆی بەهەژار دانەناوە، بەڵکو زانیویەتی تۆ دڵو دەروونێکی دەوڵەمەندو تێرت هەیە، بۆیە بایەخی بەماڵ نەداوە، بەڵکو لە ئاستی دڵ و دەروونی تۆ ماڵی بەکەم زانیوە و بەهای بۆدانەناوە.

پیرۆز بایی لێیکردو گوتی؛

ئەوە خودا ئەم ژنەی بۆ تۆی دانابوو، بۆیە تائێستا شووی نەدەکردەوە.

ئیتر ئەوەندەی نەخایاند هەواڵی شووکردنەوەی خەدیجە بەناو سەرجەم شاری مەککەدا بڵاوبووەوە، بووە بنێشتە خۆشەی سەرزاری خەڵك، هەموویان زۆر بەلایانەوە سەیربوو، کەچی خەدیجە زۆر دڵشادو بەختەوەربوو.

## هاوسەرگیری

خەدیجە کەوتە خۆئامادەکردن تا پێشوازی لەرۆژی پڕ لەهیواو شادی و بەختەوەری بکات، بنەماڵەی ئەسەدیەکانیش کەوتنە خۆسازدان تا لەئاست بنەماڵەی هاشمیەکان بێ کەموکوڕی وجوان و ڕێکبن لە ڕۆژی ئاهەنگەکەدا، هەردوولا ئاگاداری خۆشەویستان و ئاشناو دۆستانی خۆیان کردەوە، ئەوێ شەوێ سەر لەئێوارە، هەردوو



بنەماڵە لەحەوشەی ماڵی خەدیجە کۆبوونەوە، چەندین ڕایەخی ڕازاوەو بەهادار ڕاخسترابوو، سەرین وپاڵپشتی نەخشین بەڕیز دانرابوو،پیاوان عەبای سورمەییان بەسەر شانداداابوو، مەندیلی زۆر زلیان لەسەر نابوو، پیرەکانیان هێندەی شاهان گەورەو ڕێزدار دیاربوون، قسەی نەستەق و ڕێك و پڕ مانایان دەکرد، ناوەناوە دووکەڵی بۆن وبەرام لەبەردەمیان بڵاودەبووەوە، کوڕو وبراکانیان بەدەوریاندا دانیشتبوون، نوکتەو بەسەرهاتی خۆشیان دەگێڕایەوە، موحەممەدیش(درودی خودای لەسەربێت) لە ناوەڕاستیان دانیشتبوو، ڕوخساری وەك مانگی چواردە پڕشنگی دەداو دەدرەوشایەوە، ئەبوتالیبی مامیشی وەڵامی سڵاوو پیرۆزبایی خەڵکی دەدایەوە، مامی خەدیجەش بەخەندەوە بەخێرهاتنی میوانانی دەکرد، لەلایەکی ماڵەکە ناوەناوە چریکەی ئاوازو گۆرانی بەرزدەبووەوە.

گەنجان شەوێکی شادو خۆشیان گوزەراند، تەنانەت پیرەکانیش نوکتەیان بۆ دەگوتن، لەناکاو ئەبوتالیب هەستایەوە سەرپێ سەیری خەڵکەکەی کرد زۆر بەڕێزەوە گوتی:

سوپاس بۆ خودا چۆن ئێمەی کردۆتە نەوەکانی ئیبراهیم و ئیسماعیل، پارێزگارانی ماڵی پیرۆز و خزمەتکارانی ئەم شوێنە پیرۆزە، ئێمە واڕاهاتووین هەمیشە کار بەئەمینی و بەهەق بکەین، ئەی کۆمەڵانی قوڕەیش، ئەوە برازای من موحەممەدی کوڕی عەبدوڵلا نیازو ئارەزووی وایە ببێتە هاوسەری خەدیجەی کچی خوەیلد، دیارە خەدیجەش هەمان نیازو ئاواتی هەیە، ئەگەرچی برازای من ماڵ و سامانی نیە، بەڵام ماڵ و سامان شتێکە دێت و دەڕوات، ئەگەر موحەممەد هاوکێش بکرێت لەگەڵ هەر پیاوێك، ئەوا لەبەر هۆشمەندی و ژیری و شکۆمەندی پای تەرازووی موحەممەد دادەکەوێت.

خەڵکەکە هەموویان گوێیان بۆ قسەکانی ئەبوتالیب گرتبوو، بە ڕەزامەندیەوە سەریان بۆی دەهەژاند، خەڵك بەچاوی پڕ لەسۆزو خۆشەویستی وبەدەمی پڕ



لەخەنـدەوە سـەیری موحەممـەدیان دەکـرد، تەنانـەت تیـشکی چاوەکانیان وشـەی پیرۆزبایيـان دەردەبـڕی. کـاتێ ئـەبوتالیب کۆتـایی بەوتارەکـەی هێنـا، لـەدوای ئـەو لـەوەڵامی ئەبوتالیبـدا، وەرەقـەی کـوڕی نەوفـەل هەسـتایەوەو وتـارێکی بـەناوی بنەماڵەی ئەسەد پێشکەش کرد، تیایـدا ستایـشی موحەممـەدو ئاکارو خەسڵەتەکانی کرد، هەروەها ڕێزێکی یەکجار زۆرو بێپایـانی بـۆ موحەممـەد هێنایـە وروژان، دوای ئـەوانیش عـەمری کـوڕی ئەسـەد مـامی خەدیجـە، لەبـەردەم ئامـادەبوان ڕایگەیانـد کەبەخۆشـحالیەوە بـرازای خـۆی خەدیجـەی کـچی خومیلـدی پێـشکەش کـردوە بـە موحەممەدی کوڕی عەبدوللا.

لەلایەکی دیکە دەنگی چریکەی (هەلهەلـەی) ژنـان تێکەڵبوو بـەگۆرانی گـەروی کەنیزەکان خۆشترین ئاوازیـان بـەئاسمانی مەککـەدا بڵاودەکـردەوە، پاشان خوانـەکان بەچەندین خۆراکی  جۆراوجۆر ڕازایەوە.

خەدیجە بەم بۆنەیەوە چەندین دیاری بەسەر هەژارانـدا دابەشکرد، بەدەمێکی پڕ لەخەندەوە سەیری هەموو دۆست و دەسـتە خوشـك و خۆشەویـستانی خـۆی دەکـرد، ئیتر دوای کۆتایی هاتنی مارەکردن و تەواوبوونی داب و نەریتەکان خەڵکەکە بـەرەو مـاڵی خۆیـان گەڕانــەوە، بـەدەم ڕێگـای گەڕانــەوەیان تـەنیا باسـی موحەممــەد و خەدیجەیان دەکرد.

دوای چەند ڕۆژێك موحەممەد( درودی خودای لەسەربێت) ئەو بڕە کەلوپـەل و ماڵەی هەیبوو، گواستیەوە بۆ ماڵی خەدیجەئیتر ماڵەکە دووبـارە تاموچێژی ژیـانی بۆگەڕایەوە.

موحەممـەد(درودی خـودای لەسـەربێت) لاری نـەبوو لـە سەرپەرشـتی کردنـی کاروبـاری بازرگـانی و مـاڵ و سـامانی خەدیجـە، بـەلام خەدیجـە هەسـتی دەکـرد موحەممەد(درودی خودای لەسەربێت) بۆ کارێکی مەزن و گرنگتر لە ماڵ و سامان و بازرگـانی هاتۆتـەدی، دەیزانـی دڵ و دەروونـی پـاك و بێگـەردی موحەممـەد(درودی

خـودای لەسـەربێت) بـەجۆرێك ئامـادەو پـەروەردەكراوە تەنانـەت ئـەركێكی پـیرۆزو مـەزنی پێبـسپێردرێت، ڕۆڵێكـی گـەورە ببینێـت لـەپێناو سـەرجەم ئـادەمیزادو مرۆڤایەتی، تەنیا بۆ قوڕەیشیەكان یان بۆ بازرگانی و سامانی خەدیجە پەروەردە نەكراوە.

ڕۆژێكیان خەدیجە لەخەو هەستا بینی موحەممەد(درودی خـودای لەسـەربێت) خەریكی خۆ ئامادەكردنە لە ماڵ دەربچێت، سەیری كردو پێكەنی، پێیگوت:

بۆ كوێ دەچیت:

فەرمووی چەند كەسێك بۆ كاڵاو شتوومەك كڕین هاتوون، دەچم بۆ كۆگاكان كارەكەیان جێبەجێ دەكەم.

خەدیجە گوتی:

هێشتا زۆر زووە، خۆتۆ ئەمشەو تانیوەی شەو نەخەوتوویت، لەئاسمان ڕادەمایت و سەیری ئەستێرەكانت دەكرد، بۆیە پێویستیت بە حەسانەوەیە.

موحەممەد(درودی خودای لەسەربێت) پێكەنی، بەڕوێكی گەش و بە هێمنی و بەنەرمی فەرمووی:

بۆپیاوان پێویستە دەبێ كارێك بكەن، سەركەوتنیش لای خودایە.

خەدیجە گوتی:

ئامۆزا تۆ كارمەكە، ئێمە دەوڵەمەندین و لەهەمووكەس ماڵ وسامانمان پترە، موحەممەد (درودی خوای لەسەربێت) فەرمووی:

خەدیجە من ماڵ وسامانم ناوێ، من كارم دەوێ، پیاو نابێ لە ژیانیدا كارنەكات، ئەگەر دەوڵەمەندیش بێت بژێویشی ڕەهاو فەراهەمبێت، دەبێ هەوڵ بدات و كۆشش بكات، پێویستە ئەو تەندروستیەی خودا پێیداوە بەكاری بێنێت بۆ ئەومەبەستەی بۆی دروست بووە، گەنجینە و سامانیش ئەگەر نەیەتەوەسەری و لێی بڕوات لە ناكامدا نامێنێت، بۆیە دەبێ بێتەوە سەری و بەشی هەژارانیشی لێ بدرێت،

هەرنەبێت با نەختێك بۆ هەزاران کار بکەین و کۆشش بکەین، چونکە ژیانی هەزاران بەندە بە ژیانی دەوڵەمەندەکانەوە.

خەدیجە بەپەرۆشەوە گوتی:

موحەممەد، نابێ تۆ بەدەستی خۆت کاربکەیت،بەڵکو فەرمان بەدەست و پێوەندەکانمان دەکەیت، ئەوانیش جێبەجێی دەکەن، هەروەك دەبینی چۆن کرێکارو کەنیزەکانمان هەموویان چاوەڕوانی قسەو فەرمانی تۆ دەکەن، ئیتر لەمەودوا لەجیاتی تۆ یەکێکی تر دەچێت بۆ کاروان و بازرگانی، چونکە تۆ کاری ترت هەیە، ئیتر دەرفەتی چوونە وڵاتی شام و یەمەنت نیە.

موحەممەد (درودی خودای لەسەربێت) بەزەردەخەنەوە فەرمووی:

ئامۆزا مەبەستت چجۆرە کارێکە؟.

خەدیجە لەسەرخۆ گوتی:

خەڵك پێویستیان بەبیرو ڕای تۆیە، تەنانەت سەرکردەکان و سەرۆکەکان لە زۆر کارو کێشەدا ڕاوێژ بەتۆوە دەکەن، کەواتە پێویستە بۆ ئایندەو دواڕۆژی خۆت جێگای خۆت لەناویاندا بکەیتەوە، ئەوانیش هەمیشە چاوەڕوانی ئەوە لەتۆ دەکەن.

بەپێکەنینەوە هەڵسا تا بچێت بۆ کۆگاکان فەرمووی:

ئامۆزا بیری لێدەکەمەوە هەرچەندە ماویەتی و هێشتا کاتی ئەوە نەهاتووە، چونکە لە سەرەتای ڕێگادایین.

## باوکی قاسم

هەرچەند ڕۆژگار تێپەڕدەبوو خۆشەویستی نێوان ئەم دووهاوسەرە پتر گەشەی دەکردو پەرەی دەسەند، دڵیان بۆیەکتری ئالاو والاکردبوو، ماڵەکەی لەناو خەڵکدا وەك نموونەو هێلانەی خۆشەویستی دەهێنرایەوەو باس دەکرا،



موحەممەدیش(درودی خودای لەسەربێت) جێگاو ڕێگای تایبەتی خۆی لەناو سەرکردەو پیاوماقوڵانی مەککەدا بەدەست هێنابوو، تەنانەت لەبچووکترین بگرە تا ئالۆزترین کێشە ڕاوێژیان پێدەکرد، وێڕای ئەوەش بە ئەمینداری قورەیش ناسراوبوو، هەموو نهێنیەکانی خۆیان لای ئەو دەدرکاند، ئەگەر بۆ کارێکی گرنگ و پڕبایەخ کۆببانەوە بانگهێشتیان دەکرد، تەنانەت هیچ کارێکی چاکە بێ ڕای ئەو ئەنجام نەدەدرا، ئیتر ڕۆژ لەدوای ڕۆژ جێگاو پلەوپایەی لەناو پیاوماقوڵانی قورەیشدا بەرزو فراوانتر دەبوو، پتر ڕای وەردەگیرا، خەدیجە کاتێ هاوسەرەکەی لەم ئاستە بەرزەدا دەیبینی، هەستی بە گەورەیی دەکرد و ئاواتەخوازبوو شوێن و جێگاو پایەی بەرزتری پێ بدرێت تا دەبێتە گەورەی هەموو مەککە.

ئەمەلەلایەك لەلایەکی تر پێموایە هیچ ژنێك لەناو قورەیشدا هێندەی خەدیجە حەزی لەمنداڵبوون نەدەکرد، هەرچەندە منداڵی لە هاوسەرەکانی پێشووی عەتیق و ئەلنەباش هەبوو، بەڵام هەمیشە ئاواتەخوازبوو ئەم هاوسەرە شکۆدارەی تاموچێژی بەرهەمی هاوسەرگیری و خۆشەویستی نێوانیان لەچاوەگەشەکانی کۆرپەیەکدا ببینێت، سەرەڕای ئەمەش لەهاوسەرانی پێشووی گومانی پیربوون و نەزۆکی لێنەدەکرا، بەڵام ئێستا هیوای منداڵبوونی زۆرکەمە و گومانی بێ ئومێدی لێ دەکرێت، ئیتر هەمیشە ترسی بێ ئومێدی لەدڵدا هەبوو، نەوەك هاوسەرەکەی بێ منداڵ بمێنێتەوە، وێڕای ئەمەش قسەو هەواڵی پیرێژنان و سەرجەم قورەیشیەکانی پێدەگەیشتەوە، چۆن باسی تەمەن زۆری و بێ هیوابوونی ئەو دەکەن، بەتایبەتی ژنانی بنەماڵەی هاشمی، هەمیشە خەفەتبارو نیگەران بوون بۆ چاکترین لاوی بنەماڵەکەیان، چۆن بەهۆی ئەم پیرێژنە بەتەمەنەوە بێ منداڵ و بە وجاخ کوێری ماوەتەوە، بۆیە هەموو هیواو ئاوات و نزاو پاڕانەوەی خەدیجە خۆی لە چاوی کۆرپەیەکی خنجیلانەدا دەنواند، بەڵکو چاوی هاوسەرەکەی بە دیداری شادو ڕۆشن بکات.

ئیتر دوو ساڵ بەسەر ژیانی هاوسەرێتیان تێپەڕنەبوبوو کاتێ خودا ئاواتی

خەدیجـەی هێنایـەدی، بـەری پـیرۆزی هاوسـەرێتیان بەدەرکـەوت، زۆر شـادو بەختەوەربوو، بۆیە زوو مزگێنی دایە موحەممەد(درودی خودای لەسەربێت)، پاشان هەواڵەکەی بەسەرجەم بنەماڵەی هاشمیەکان و قورەیشەکان ڕاگەیاند، ئیتر چەندین خـەڵاتی بەسـەر هەژارانـدا دابەشـکرد، لـەماوەی بـارگرانی و دووگیانیـدا، خـۆی ئامـادەکرد بـۆ کـاتی لـە دایکبـوونی کۆرپەلەکـە، بێگومـان سـەبارەت بـەم ئەزموونـە شـارەزایی لـە ئـازارو ژانـەکانی هـەبوو، ڕۆژێکیـان هاوسـەرەکەی بەپەشـۆکاوی لەژوورەکـەی خۆیـدا وەسـتابوو، زۆر بەپەرۆشـەوە چـاوەڕوانی ئـەم سـاتە ناسـکەی دەکرد، چۆن پاش تۆزێکی تر دەچێتە قۆناغێکی تری ژیـان و دەبێتـە بـاوك، لـەناکاو دەنگی ناسکی کۆرپەیـەك لـەژووری دایکەکەوە بـەرزبووەوە، مزگێنـی لـەدایکبوونی خۆی بـەبن گوێچکەی بـاوکی شـکۆداری ڕاگەیانـد، پاشـان ئەوەنـدەی نەخایانـد ئـەم هەواڵە لە تێکڕای شاری مەککەدا بڵاوبووەوە، دوای ماوەیەك باوکی بەسۆز بـەدڵێکی پـڕ لـەجۆش و خرۆشـەوە بـەنیازی هـەواڵ پرسـین لـە ژووری هاوسەرەکەی نزیـك کەوتەوە، دەرگای ژوورەکەی کردەوە(سەلمای کەنیزەی سەفیەی کچی عەبدولموتەلیب) کۆرپەکـەی بـەرەو پـیری بـاوکی هێنـا، ئـەمیش کۆرپەکـەی وەرگـرت و خـستیە سـەر هەردوو باسکی و بۆلای هاوسەرەکەی چوو، خەدیجە لەبـەر ئـازارو ژانـی منـداڵبوون هەموو جەستەی خاوبوو بـووەوە لەسـەر جێگاکەی ڕاکشابو، بـەلام لەگـەڵ ئەوەشـدا شـادی و بەختـەوەری بەڕوخـساریەوە دیـاربوو، تیـشکی چـاوی هـەردووکیان لەسـەر ڕووی کۆرپە ئەشمیلەکە بەریەك کەوت و بەیەکەوە سەیری شێوەو ڕوخساریان کـرد، ئیدی ناویان لە کۆرپەکەنا(زەینەب).

ئیتر زۆری نەخایاند لەدوای زەینەب، پێشوازیان لە(ڕوقییە)کرد، لەدوای ئەویش پێـشوازیان لـە(ئومکەلـسوم)کـرد، هـەروەها لەسـاڵی دەیـەمی بەهاوسـەربوونیاندا پێشوازیان لـە(فاتیمـەی زەهـرا) کـرد، بێگومـان خەدیجە زۆر حەزیـدەکرد کوڕێکیـان ببێت، ئەمەش حەزێکی سەیرو نامۆ نیە بۆ کەسێکی وەکو ئـەو، چونکە کۆمـەڵگای عـەرەبی زۆر حـەزیان لـەکوڕە، ئەمـەش لـە بـاوك و باپیرانـەوە بۆیانماوەتـەوە، بـەلام

گرنگ ئەوەیە ئەم حەزو ئاواتەی هەرگیز ئاستەنگێك نەبوو لەبەردەم خۆشەویستیان بۆ چوار کچەکە، لە ژینگەیەکدا کچان تێیدا زیندەبەچاڵ دەکران، هەرچەندە تەمەنی خەدیجە لەپەنجا ساڵ تێپەربووبو، بەڵام هەرگیز لەم هیواو ئاواتەی بێ ئومێد نەبوو، ئەم هیوایەی بە لە دایکبوونی (قاسم) هاتەدی وماڵەکەی ڕۆشن بووەوە، ئیتر بە هاتنەدی ئەم ئاواتەی خەدیجە هەستی بەشادی و بەختەوەری دەکرد، لەمەودوا بەناوی باوکی قاسم بانگی هاوسەرەکەی دەکرد، تەنانەت لەئاکامدا تێکڕای خەڵك بەم نازناوە نوێیە بانگیان دەکرد ئەویش بەم نازناوە زۆر دڵخۆشبوو.

ئەم نازناوە خۆشترین ئاوازی بەگوێچکەی خەدیجەدا دەچڕی، کاتێ لەزاری خەڵك دەیبیست بە باوکی قاسم ناوی دەبەن ئومێدی بەژیان نوێ دەبووەوە، چونکە (قاسم) بەرهەمی خۆشەویستی و وەفاداریان بوو.

ئیتر موحەممەد (درودی خودای لەسەربێت) ڕۆژ لەدوای ڕۆژ لە دیدو چاوی مەککەییەکان مەزنترو شکۆدارتر دەبوو. خەڵك پتر ڕێزیان دەگرت و لە دەوری کۆدەبوونەوە، ڕۆژانە چارەسەری بۆ کۆسپ و تەگەرەو ئاستەنگەکان دەدۆزیەوە، ئامۆژگاری و ڕاوبۆچوونی ژیرانەی بۆ هەموو گیروگرفتێك دەردەبڕی، هەمیشە لەگەڵ گەورە پیاوانی قوڕەیش دادەنیشت، پیاوێکی کەم قسەو بێدەنگ، گران و سەنگین و لەسەرخۆ بوو، هەردەم پشتگیری لەستەمدیدە دەکردو دژی ستەمکاربوو، یارمەتی هەقی دەداو دژی ناهەق بوو، گاڵتەوگەپی لەگەڵ کەس نەدەکرد، هەرکاتێکیش کارێکی مرۆڤایەتی لەئارادابوایە خەڵکی هاندەداو هەوڵیدەدا کارەکە ئەنجامبدرێت.

ڕۆژێك خەدیجە هەستیکرد قاسم نەخۆشە، بەخێرایی هەوڵی چارەسەرکردنیدا، هەرچی داوودەرمانی پزیشکان هەبوو بۆ جگەرگۆشەکەی بەکاریهێنا، بەڵام بێ سوودبوو، موحەممەدیش (درودی خودای لەسەربێت) لە تەنیشت خەدیجەوە بەغەمگینی سەیری قاسمی دەکرد، هەستی دەکرد قاسم لەدەست نەخۆشیەکەی زۆر بەئازارو ئەشکەنجەیە و چۆن هیچ دەرمانێکیش چارەسەری ناکات.



خەدیجە دەستەو ئەژنۆ دانیشتبوو ناوەناوە سەری هەڵدەبڕی و نەیدەزانی چی بکات، بیری لەڕزگار کردنی جگەر گۆشەکەی دەکردەوە، چۆن ئەم دەردو نەخۆشیەی تووشیهاتوە خەریکە بەرەو نەمانی دەبات ، هەموو جۆرە خواردن و خواردنەوەیەکی تاقیکردەوە، تەنانەت چەند شتی بۆیان باس دەکرد بەکاریهێنا بۆ چارەسەری هەموو شتێکی کرد لەپێناو ڕزگار کردنی قاسم، بەڵام سوودی نەبوو، سەیری کرد سات لەدوای سات، وەك گەڵای دار ئاسا لە گەرمای هاویندا بێ ئاوبێت، قاسم ئاوا تا دەهات کزوو مات و سیس دەبوو، وێڕای ئەوەش خەدیجە کاتێ چاوی بە هاوسەرەکەی کەوت چۆن بەغەمگینی بەرامبەر کوڕەکەی دانیشتوە چاوەڕێی مەرگ و نەمانی دەکات، زۆر دڵپەست و نیگەران بوو، خەریکبوو لە خەفەتا دڵی بوەستێت، حەزی دەکرد خۆی بە تەنیا ئەم خەفەتەی بچەشتبایە، بەڵام کارو ویستی خودای مەزن بێگومان هەمیشە لە سەرووی هەموو شتێکە، توانای ئەو لە هەموو شتێك بەهێز ترە، بۆیە هیچ دەرمانێك چارەی قاسمی نەکرد، تەنانەت بەرە بەرە هەناسەی خێراتر و سوارتر دەبوو، تا لەپڕ چاوەکانی گەشبوو، دوایی هەناسەی نەما و چاوەکانی بۆ یەکجاری لەیەکترنا، خەدیجە خەریکبوو ببووڕێتەوە، زەوی لەبەر چاوی دەسووڕا، بەڵام لەبەر هاوسەرەکەی دانی بەخۆی داگرت، نەیهێشت فرمێسکە قەتیس ماوەکانی سەربکەن و بێنە خوارەوە، سەری هەڵبڕی تا دڵنەوایی باوکی قاسم بکات، بەڵام کاتێ سەیریکرد بینی فرمێسکی چاوەکانی باوکی قاسم(درودی خودای لەسەربێت) وەك لێزمەی باران بەگوڕ دێتە خوارەوە، ئیدی ئەویش خۆی بۆ نەگیراو قەڵپی گریانی سەریکرد، بەڵام پاش نەختێك توانی بەسەر خودیخۆیدا زالبێت، فرمێسکەکانی سڕیەوەو گوتی:

موحەممەد، لەگەڵ فەرمانی خودا هیچ ناکرێت، ئێمە کەمتەرخەمیمان نەکردوە، نەبەماڵ نەبەماندووبوون، ئایا گەڕانەوەی لە دەست ئێمەدابوو دەمانتوانی بیگەڕێنینەوە؟، خودا ئەم منداڵەی هەڵبژاردبوو ئیتر دەبوایە بڕوات، دوایی هەڵسان کفنیان کرد و بردیانە گۆڕستان و ناشتیان.

# بەڵگەو نیشانەی پێغەمبەرایەتی

موحەممـەد(درودی خـودای لەسـەربێت)، هەمیـشە سـەیری ئـەم گەردوونـەو بوونەوەرانی دەکرد، دڵی لەبیرکردنەوەی دانیشتوانی سەرووی ئاسمانەکانـدابوو، زۆر بەبەزەیی بوو بۆ هەژاران و کەسانی بێ هێز، خـەمخۆری بـێ دەسـەڵاتان بـوو، دژی چەوساندنەوەی خەڵك بوو، هەمیشە هەوڵیدەدا خۆشەویستی و ئاشتی لەناو خەڵکدا بێتەدی.

خەدیجە کاتێ سەرنجی هاوسەرەکەیدا، هەستیکرد حەز لە تـەنیایی و دابـڕان دەکات، دەیـەوێت لەچاوی خـەڵك دووركەوێتـەوە، بۆیـە ماڵەکـەی کـردە کـونجێکی ئـارام و بێـدەنگ، ژوورێکـی تایبـەتی بـۆ ئـەو تـەرخانکرد، تەنانـەت بـۆ ئـەوەی هاوسەرەکەی سەرقاڵی کاری لاوەکی نـەبێت، لـە زۆر بۆنـەدا لـەجیاتی هاوسـەرەکەی بەشداری دەکرد، وەك جێبەجێ کردنی پێداویستیەکانی خەڵك وسەرەخۆشی کـردن لەو کەسانەی کارەسات و نەهامەتیان بەسەر دەهات.

ئەو ماڵە گەورەیە چواردە ساڵ بەهێمنی و بەبێـدەنگی ژیانیـان بردەسـەر، جگـە لە سڵاو و ڕێزلێنان بەملاوە هیچ قسەیەکی ناڕێك و توندو تیژی تێدا نەبیسترا.

موحەممەد(درودی خودای لەسەربێت) هەرچەند تەمەنی زیاتر دەبوو، بەڵگەو نیـشانەی پێغەمبەرایـەتی پـتر تێـدا دەهاتـەدی، ڕۆژ لـە دوای ڕۆژ بەڵگـەی پـەیام لەقسەکانیدا پـتر بـەدی دەکـراو گەشـەی دەکـرد، زۆر جـار کاتـێ بـەیانیان لەخـەو هەڵدەستا خەونەکانی بۆ خەدیجە دەگێڕایەوە، ئیتر دوای ڕۆژێك یـان چـەند ڕۆژێـك خەونەکە کتومت دەهاتەدی، واتە ئـەو چۆن لەخـەودا بینـی بـووی و باسـی کردبـوو بەهەمان شێوە دەهاتەدی، وەك بڵێی ڕووداوێکەو دووبارە دەبێتـەوە، تەنانـەت یـەك پیتی کەم و زیاد نەدەبوو، بۆیە خەدیجە هیوای پتر بە پێغەمبەرایەتی هاوسەرەکەی لەدڵـدا گەڵاڵـە بـوو بـوو، دڵـشادو ئاسـوودە بـوو، کاتـێ هەسـتی بـە بێگـەردی و



سازگارتربوونی دڵ و دەروونی موحەممەد(درودی خودای لەسەربێت) دەکرد، تەنانەت ئەم سازگاری و بێگەردیەی ڕەنگدانەوەو کاردانەوەی بەسەر ڕوخساریەوە دیارو ئاشکرابوو، سەرنجیدا موحەممەد(درودی خودای لەسەربێت) بینی زیاتر هەوڵو کۆشش دەکات و لێپرسینەوە لەگەڵ خودی خۆیدا دەکات، چیای (حراء )ی کردووە بە خڵوەتگەی خۆی و لە مانگی ڕەمەزاندا ڕوو لەم شوێنە دەکات، (چیایێکی سەختە نزیکەی (١٨) هەژدە کیلۆمەتر لە مەککەوە دوورە)، هەمووساڵێك لەسەرەتای مانگی ڕەمەزاندا کەمێك نان و خوێ و ڕۆن و خورماو ئاوی هەڵدەگرت و بەسەر چیاکە دەکەوت، بەڕێگایەکی سەخت و ناڵەباردا دەڕۆیشت تەنانەت دەگەیشتە لووتکەکەی، لەوێ ئەشکەوتێك هەبوو دەچووە ئەوێ و لە خەڵك دادەبڕاو بەتەنیا دەژیا، سەرنجی دەداو سەیری تواناو دەسەڵاتی پەروەردگاری مەزنی دەکرد، ئیتر لەئاکامی ئەم بیرکردنەوەیەدا ژیانی ئەم جیهانەی زۆر بەکەم دەهاتە بەرچاو، هەروەها لەم ماوەیەدا دوور دەکەوتەوە لە درۆو دەلەسەو فرووفێڵ و قسەو قسەلۆکی خەڵك، تەنانەت دوور دەکەوتە لە هەموو شتێك کەسەرقاڵی بکات و دووری بخاتەوە لەبیرکردنەوەو تیاڕامانی ئەم گەردوونەدا، بێگومان لەماوەی ئەم گۆشەگیریەیدا زۆر بێ هێزو لاواز و ماندوو دەبوو، دوای تەواوبوونی مانگی ڕەمەزان دەگەڕایەوە ماڵەوە، ئیدی بە وتە شیرین و ئاسکەکانی خەدیجەی هاوسەری ئەشکەنجەو ئازاری نەدەما، بەم سۆزو خۆشەویستیەی خەدیجە بۆی دەردەبڕی دڵی دەسرەوت و ئۆقرەو ئارامی بە جەستەو دەروونی دەبەخشی، شەکەت و ماندووبوونی ڕۆژانی خڵوەتی لەبیردەبردەوە، بەخەندە شیرینەکەی پەستی و هیلاکی لەدڵ و جەستەی ڕادەماڵی و پتر هانیدەدا بۆ گەیشتن بە ئامانج و مەبەستی، هەروەها خۆزگەی دەخواست خەدیجە لەم گەشتەی سەر چیاکە بەشداربوایە تا بەچاوی خۆی دیمەنەکانی بدیبایە،چۆن تووڵەڕێگاکان لەنێوان دۆڵەکان و لووتکەکاندا چیاکان دەبڕن، ئاسمان و ئەستێرەکانی بەچاو بدیبایە، هەستی بە خۆشی و چێژی کپ و بێدەنگی و دوور لە

هاتوهاوارو جەنجاڵی ناو شاری مەککە بکردایە، بەڵکو ئەمیش وەك ئەو بۆخۆی یەك مانگ هەستی بە تاموچێژی ژیانی پڕ لە ئاسوودەو ئارامی گیان و دەروون بکردایە، یان هەر هیچ نەبێت بۆخۆی پشوویکی بداباو نەختێك لەتەنگ و چەڵەمەو نەهامەتیەکانی ژیان دوورکەوتبایەوە، بەڵکو هەستی بەژیانێکی شاد و کامەران بکردایە.

ساڵی دواتر مانگی ڕەمەزان نزیکبووەوە، خەدیجە هەڵسا کەلوپەلی گەشتی خلوەت و گۆشەگیریەکەی بۆ موحەممەد(درودی خودای لەسەربێت)ئامادەکرد، بەمەبەستی ئەنجام دانەوەی گەشتەکەی، بەم کارەی خەدیجە موحەممەد(درودی خودای لەسەربێت) وورەی بەرزتربووەوە، زۆر دڵخۆش وکامەران بوو، چونکە هەستی کرد سەبارەت بەم گۆشەگیریەی پشتیوانی و دەست خۆشی لێدەکرێت، خەدیجەش وێڕای ئامادەکردنی خواردن و پێداویستی و کەلوپەلەکان، بەکۆمەڵێك وشەی جوان و پڕ لە سۆزو خۆشەویستی بەڕێیکرد.

ئیتر تا دەهات ڕۆژ لەدوای ڕۆژ، خەدیجە لەو هیواو ئاواتەی چەند ساڵە چاوەڕوانی دەکات نزیکتر دەبووەوە، نزیکبووە پاڵ بەچیای خۆزگە بدات و ببێتە هاوسەری دواترین پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت)، بەبینینی نیشانەو بەڵگەکانی پێغەمبەرایەتی لە موحەممەد دا( درودی خودای لەسەربێت) زۆر شادو بەختەوەردەبوو، چۆن لەڕوخسارو قسەکانیدا ڕەنگدانەوەیان هەیەو دەدرەوشێنەوە، هەمیشە لەخودا دەپاڕایەوە تەنیا ئەوەندە تەمەنی پێبدات تا ئەم ڕۆژە بەچاوی خۆی ببینێت و بەم ڕۆژە شادبێت.

# باوەڕهێنان

خەدیجە لەلایەك خەریكی بەڕێوەبردنی كاروباری بازرگانی و سامانەكەی بـو، لەلایـەكی تـر هەمیشە بـیری لـە ئایینـدەی موحەممـەد(درودی خـودای لەسـەربێت) دەكـردەوە، ئـاخۆ ئـەو كاتـەی دەبێتـە پێغەمبـەر ڕووبـەڕووی چ كارەسـاتێك و نەهامـەتییێك دەبێتـەوە؟، سـەرەڕای ئـەوەش هەمیـشە هەوڵیـدەدا شـوێنێكی ئـارام و هێمنی بۆدابین بكات، تا كاری خەڵوەت و بیركردنەوەو پاك ڕاگرتن و سازگاری گیـان و دەروونی تێدا ئەنجامبدات، سەرەڕای ئەمەش ناوەناوە ئەوەی لە موحەممەدی(درودی خودای لەسەربێت) چاوپێكەوتبوو، یان بیستبووی، بۆ وەرەقەی ئامۆزای دەگێڕایەوە، ئەویش دەیگوت مزگێنی بـۆ تـۆ خەدیجە بوویتـە هاوسەری پێغەمبـەری چاوەڕوان كـراو، چـونكە ئـەم بەڵگانـەی تـۆ باسـی دەكـەیت، نیـشانەی پێغەمبـەرە چاوەڕوانكراوەكەیە، هـەروەها خـەریكی خۆئامـادەكردنبوو بـۆ بینینـی گزنگـی ئـەم خۆرەی چەندین ساڵە بەهیواو ئومێدی بینینیەتی، ئەو خۆرە مەزنەی ووردە ووردە وانزیكدەبێتەوە.

هەندێ جار دڵنیادەبوو لە ڕاستی و دروستی پێغەمبەرایەتی هاوسەرەكەی، ئیتر ئـەو كارەسـاتانەی وەرەقـە بـۆی باسـكردبوو دەهاتـە پێشچاوی، چـۆن پێغەمبـەری داهاتوو تووشی دەردەسەری و ئەشكەنجەو ئـێش و ئـازار دەبێـت، بۆیـە بەوورەیـەكی بەرز بـیری لـەهێزو توانـای خـۆی دەكـردەوە، تـا شانبەشـانی هاوسـەرەكەی بەرامبـەر سەرجەم نەهامەتی و گیرو گرفت و ئێش وئازارەكان بوەستێت.

ئیتر هەمیشە بیرو هەستی لای موحەممەدبوو(درودی خـودای لەسـەربێت) گیـان و دڵی لەگەڵ ئەو دابـوو، لەماڵەوە، لەئەشـكەوت و چیادا، لـەڕێگاو بـازاڕدا، لـە كـۆڕو كۆبوونـەوەی پیاوماقوڵانی مەككـەدا، لـە هـەموو سـات و شـوێنێك، دڵ و گیـانی وەك پەپوولە ئاسا بەدوایەوەبوو، كاتێ لەئەشكەوتی(حراء ) بوایە، هەستی دەكرد هێزێكی

پاڵـەر لەناخـەوە هانیـدەدات تـا بەشـوێنیدا بـچێت، ئـیتر چـەندین جار بـەم ڕێگا سەختو ناخۆشەدا سەردەکەوت بۆ بەرزایی چیاکە تا دەیبینی و دڵنیا دەبوو ئینجا دەگەڕایەوە، کاتێ موحەممەد (درودی خودای لەسەربێت) چاوی بەخەدیجە دەکەوت بەدوایداهاتوە بۆ ئەم شوێنە، ئەوەنـدەی تـر ڕشـت تـرو بـە پەرۆشـتر دەبـوو لەسـەر کارەکەی، چونکە هەستی دەکرد پشتیوانێکی دڵسۆزو یارمەتیدەرێکی بەتوانای هەیە، تەنانەت جارێکیان فەرمووی خەدیجە:

دەنگێـك لـەقووڵایی بیابانــەوە دێتــە بنگـوێم لەگـەڵ بیـستنی ئـەم دەنگـە خورپەیەك دەکەوێتە نـاو دڵـم و هەسـت بـە تـرس دەکەم و نزمـی دڵـم بـەو دەنگە تێکدەچێت، خەدیجە کاتێ ئەمەی بیست ترسێك ڕای دڵی کـەوت، بۆیـە ئەگـەر موحەممـەد (درودی خـودای لەسـەربێت) کـەمێك دووا بکەوتبایـەو نەگەڕابایـەوە بۆماڵەوە، خێرا یەکێکی بەشوێندا دەنارد تادڵنیابێت لەهۆکاری دواکەوتنەکەی.

دەرەنجـام شـەوێك لـە شـەوەکانی مـانگی ڕەمـەزان، موحەممـەد(درودی خـودای لەسەربێت) وەك نەریتێکی تایبەت بەخۆی لە ئەشکەوتی(حـراء )بـوو، تـاریکی شـەو چیاو دۆڵەکانی داپۆشیبوو، ئەستێرەکان لـە ناوەڕاسـتی ئاسمانـدا وەك چـاو سـەیری زەویان دەکـرد، لووتکـەی شـاخەکان لەبـەر تیـشکی کـزی ئەسـتێرەکان وەك پەیکـەرو تارمـایی ئـادەمیزاد و دڕنـدە وەسـتابوون، هەریەکـەو سـەیری ئـەوەی تـری دەکـرد، شـەوێکی یـەکجار کـپ و بـێ دەنـگ و هـێمن بـوو، ناوەنـاوە دەنگـی ئاژەڵـە کێـوی و دڕندەکان دەهات بەدوای نێچیرو خواردەمەنیدا دەگـەڕان، لـەناو تـاریکی شـەوەزەنگدا شاری مەککە تەواو بزربووبوو، جگە لە چەند چرایێکی کز هیچی تر لەم شارە بەدی نـەدەکرا، ئـەویش وەك ئەسـتێرەیەکی بچـووکی کـز خـۆی نیـشان دەدا کـە خەریکـە ئاوابێـت، ئالـەم شـەوەدا موحەممـەد( درودی خـودای لەسـەربێت) لەسـەر لووتکـەی چیاکە لە ئەشکەوتی(حراء ) بـوو، سـەیری ئاسمـان و تـاریکی شـەوی دەکـرد، چـونکە هەمیشە دڵی بەسەیرکردنی ئاسمان دەکرایەوە، بەڵام ئەم شەو هەستی بە سازگاری و



بێگەردییەکی تایبەتی دەکرد،خەدیجەش وێڕای هاوسەرەکەی، ئەم شەوە هەرگیز چاوی نەچووە خەو، زۆر نیگەرانبوو، تەنانەت بۆ چرکەیەکیش چاوی لەیەکتر نەنا، ئەو وێناو تارماییانەی دەورمیان لە موحەممەد(درودی خودای لەسەربێت) دابوو، هەمووی دەهاتە پێش چاو، دەنگی ئاژەڵ و دڕندە کێویەکانی نێو شاخەکانی دەهاتە بنگوێ، تەنانەت ترس لەدڵیدا پەرەی سەندوو ئارامی نەما، ئیتر نەیتوانی تا بەیانی ئارام بگرێت و چاوەڕوانبێت، بۆیە لەگەڵ هەندێ لە دەست و پێوەندەکانی بەم شەوە زەنگەو ئەنگوستەچاوە بەرەو ئەشکەوتەکە کەوتنەڕێ، زۆر خێرا سەر دەکەوت باکی بەم بەردە تیژو زەقانەی چیاکە نەبوو کە لە پێی دەچەقی و ئازاری دەدا، هەروەها هیچ بایەخی بەهەناسە تەنگی و ماندووبوون نەدا، تەنانەت گەیشتە ئەشکەوتەکە، سەیری کرد موحەممەد(درودی خودای لەسەربێت) لەوێ نیە، ترسا بە سەرسامی و حەپەساویەوە گەڕایەوە دواوە، ئاوڕیدایەوە گوتی:

بۆ کوێ چووە، ئەو جێگایە بۆچۆڵە، ئەو لەکوێیە؟!.

پاشان بەخێرایی بۆ ناو دۆڵی ژێر ئەشکەوتەکە دابەزی، خزمەتکارانی بەپێشی کەوتن، دوای گەڕان و سوڕان بەدوایدا بۆیان نەدۆزرایەوە، دوایی بەخێرایی بەرەوماڵ گەڕایەوە، نەوەك ئەو بەرێگایەك و بەلاییێکی تردا گەڕابێتەوە ماڵەوە، بەلام لەماڵەوەش نەبوو، خەدیجە بەسەرسامی و حەپەساوی وەستابزۆر نیگەران و پەشۆکاو بووبیری دەکردەوە دەبێ چ ڕووی دابێت!، لە دڵیخۆیدا دەیگوت:

سەیرە دەبێ بۆ کوێ چووبێت!؟، نە لەئەشکەوتەکەیە نە لەماڵەوەیە!؟.

پاشان هەر بۆ دڵنەوایی خۆی دەیگوت:

ڕەنگە ئەو لە دۆڵە چیاکەبووبێت، بەلام ئێمە نەمان بینیبێت.

خزمەتکارەکان دیاربوو شەکەت و ماندووبوون، بۆیە گوتیان:

خانم هیچ تولاشە بەردێك نەماوە لە دۆڵەکە نەمان پشکنیبێت، کەچی شوێنەوارێکی دیارنەبووا؟.

خەدیجە خـەریکبوو پـڕ بـەدەم هاوار بکات و بقیـژێنێت، درِ بـەکپ و بێـدەنگی شەو بدات و خەڵك کۆبکاتەوە، بەڵام دانی بەخۆیداگرت و بەخزمەتکارەکانی گوت:

جارێکی تر بگەڕێنەوە بۆ چیاکە، دەست بکەنەوە بەپشکنین و گەڕان بەدوایـدا، بەڵکو ئەمجارە بیدۆزنەوە.

خزتمەتکارەکان فەرمانەکەیان جێبەجێکردو بـەرەو چیاکە گەڕانـەوە، خەدیجە بـە تـەنیا لـە ناوەڕاسـتی ماڵەکەیـدا وەسـتابوو، لـە ترسـا هـەموو جەسـتەی دەلەرزی‌سـەرجەم سێبەرو تارماییـەکانی چیاکەی دەهاتـەوەبیر، چۆن لەبەرچاوی ئـەودا ببوونـە درِنـدەی زۆر گـەورەو زەبـەللاح و هاتووچـۆیان دەکرد‌بەنینۆکـە تیژەکانیان و دەمەگەورەو ددانە بەهێزەکانیان چنگیان ئامادەکردبوو بۆ پەلاماردانی موحەممـەد(درودی خـودای لەسـەربێت)، هـەروەها دەیبینـی چۆن ئـەمیش بـەرگری لەخۆی دەکات، زۆر چاپووکانەو پڵنگ ئاسا هێرشیان دەکاتـەوە سەرو پـەرتوبڵاویان دەکات، بـەڵام لـەناکاو چـەندین چیرۆك و بەسـەرهاتی بیرکەوتـەوە کەخـەڵك پێشتر باسیان دەکرد، چۆن گوایە لەو چیایانەی دەورووبەری مەککەدا، چـەندین کـەس بـێ سەروشوێن بوونە، بۆیە زۆر نیگـەران بـوو، تووشـی دڵـەڕاوکێ بـوو، ویـستی دووبـارە بچێتەوە بـۆلای ئەشکەوتەکە، بـەڵام لـەپڕ خشپەی پێـی یـەکێکی بیـست زۆر ترسـا، کاتـێ سـەری هـەڵبڕی‌و سـەیری کـرد بینـی ئـەوە موحەممـەدە(درودی خـودای لەسەربێت)، بەئەسپایی خۆی کرد بەژووورەوە، بەدەم لەرزو ترسەوە دەیفەرموو:

بم پۆشن!، بم پۆشن!.

خەدیجە خێرا بەرەوپیری چوو، یارمەتیـدا تـا گەیاندیـە سـەر جێگاکـەی، بـەڵام کاتێ بەم شێوەیە هاوسـەرەکەی بینـی زۆر ترسـا، هێنـدەی تـر دڵـی کەوتـە لـەرزین، موحەممەدیش (درودی خودای لەسـەربێت) لەسـەر پێخەفەکـەی ڕاکشا، خەدیجەش دایپۆشت، دوایی لەتەنیشتیەوە بـەبێ دەنگـی وەستاو سـەیری دەکـرد، بینـی ڕەنگـی بزرِکـاوەو هەناسـەی خێرابـووە، بەتـەنیا جێـی نەهێـشت تـا لـەباری تەندروستی

هاوسـەرەکەی دڵنیابێـت، پـاش ماوەیـەك ترسـەکەی نـەما، چـاوی هـەڵێنا، خەدیجـە پۆشاکەکەی لەسەر لابرد پارمەتیدا تا هەڵسایەوە، بەڵام لەبەر ئارەقەکردن جلـەکانی هـەمووی تـەڕبوو بـوو، خەدیجـە خێـرا جلـەکانی بـۆ گـۆڕی، دوایـی لـەلای دانیـشت، بەچاوێکی پڕ لەسۆزەوە سەیری کردو بەخەندەیەکی شیرین گوتی:

باوکی قاسم تۆ لەکوێ بوویت؟، دڵم هەر لای تۆ بوو.

سەیری سەرەوەو بنمیچی ژوورەکەی کردوو بە ترسەوە فەرمووی:

مـن نـازانم چـی ڕوو دەدات؟! مـن لـە خـۆم دەترسـم، چـونکە شـتێکی سـەیرم بینیوە!، خەدیجە دەترسم ئەوەی من بینیومە باسی بکەم خـەڵك بڵێن شێت بـووە، چونکە ئەوەی بینیومە باوەڕناکرێت!.

خەدیجە پێکەنی و پاشان گوتی:

چۆن باوکی قاسم ئەوە تۆ دەڵێی چی؟، بەخودا پەروەردگار هەرگیز شەرمەزارت ناکات، تۆ یارمەتی هەژاران دەدەیت، خزمان بەسەر دەکەیتەوەو سـەریان لێ نابڕیت، ڕێزی میوانان دەگریت، یارمەتی کۆست کـەوتوان و سـتەمدیدان دەدەیـت، هەمیـشە لایەنگری هەقی، تۆ هەر خێـرو چاکەت بـۆ خـەڵك دەوێـت، ئـیتر چـۆن شـەرمەزارت دەکات؟.

موحەممەد(درودی خودای لەسەربێت) فەرمووی:

لـە ئەشکەوتەکە بـووم بـەدڵێکی زۆر شـادو ئاسـوودە سـەیری ئاسمـان و زەوی و دەورو بـەری خـۆمم دەکـرد، لـەناو دەریـای ئەندێـشەو بیرکردنـەوەدابووم لـەپڕ بوونەوەرێکی جوانم بینی، شێوەی لەخەڵك نەدەکرد ، کاتێ بینیم ڕاچڵەکیم، هەموو گیـانم تاسـا، چـونکە لـەتۆ بـەملاوە کـەس نایـەت بـۆ سـەر ئـەم چـیایە، ئـیتر بـە حەپەسـاوی نـەمتوانی چاوەکانم لـەم شـتە سـەیرە بتـرووکێـنم، بۆیـە سـەیرم دەکـرد تابزانم ئەمە چیەو چی دەکات، تەنانەت ویستم بانگی بکەم، بەڵام لـەناکاو دەنگێکـی بەهێزم بیست هەردوو گوێی پڕکردم و ڕای هەژاندم و پێیگوتم:

بخوێنەوە!!.

منیش لەچنگ ئەم ترسەدا وەك پەڕی باڵندە ئاسا بەدەم ڕەشەباوەبووم، نازانم چۆن توانیم وەڵامم دایەوەو گوتم:

من خوێندەوارنیم.

ئەمجارە لەجاران بەهێزتر دووبارەی کردەوە، بۆیە منیش زیاتر ترسام سەرتاپای جەستەو گیانم هەمووی هاتە هەژان، کاتێ گوتی:

ئەی موحەممەد بخوێنەوە!.

منیش بەلێویکی لەرزۆکەوە گوتم:

من خوێندەوارنیم.

ئەمجارەیان دەنگی توند ترو کاریگەر تربوو، ئەوەندەی نەمابوو بتوێمەوە، گوتی: بخوێنەوە!.

هیچ کەس و شوێنێك نەبوو پەنای بۆ بەرم، بۆیە بەدەنگێکی لەرزۆکەوە گوتم:

چی بخوێنمەوە!؟.

بەدەنگێکی ناسك و نەرم و شیرینەوە گوتی:

﴿ اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ ﴿١﴾ خَلَقَ الْإِنسَانَ مِنْ عَلَقٍ ﴿٢﴾ اقْرَأْ وَرَبُّكَ الْأَكْرَمُ ﴿٣﴾ الَّذِي عَلَّمَ بِالْقَلَمِ ﴿٤﴾ عَلَّمَ الْإِنسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ ﴿٥﴾ ﴾ العلق: ١ – ٥

واتای پیرۆزی:

موحەممەد (درودی خودای لەسەربێت) تۆ ئەوەی لە پەروەردگارەوە بۆت دێتەخوارەوە بیخوێنەرەوە، بەپاڵپشت و توانای ئەو پەروەردگارەی هەموو بوونەوەرێکی دروستکردوە ئادەمیزادی لەخوێنێکی مەییو دروستکردوە، بیخوێنەرەوە هەر چەندە تۆ نەخوێندەواری، پەروەردگاری تۆ دەستبلاوە بەبەخششەپێنووسی کردۆتە هۆکارێك بۆلەیەکتر گەیشتنی خەڵکان و مرۆڤی فێری شت کردوە

کەنەیدەزانی.

ئیتر ئەوەی ئەو گوتی، منیش لەدوای ئەو گوتمەوەو دووبارەم کردەوە، دوای ئەوە ڕۆیشت، منی بەسەرسامی و بەترس و لەرزەوە جێهێشت، پاشان هێزم هێنایەوە بەرخۆم بەخێرایی لە چیایەکە دابەزیم و بەرەومالّ هاتمەوە.

خەدیجەخان (خودا لێیڕازیبێت) بەدڵێکی پڕ لەشادی و کامەرانیەوە گوتی:

باوکی قاسم، تۆ سەیربکەو سەرنجبدە بزانە چ شتێك لەم گوفتارە شیرینترە؟! شیرینی تیادا دیارە، تام وچێژی تایبەتی خۆی هەیە، بۆیە من دڵنیام کەئەوە قسەی ئادەمیزاد نیە.

خەدیجەخان (خودا لێیڕازیبێت) سەیری ڕوخساری پیرۆزی موحەممەدی دەکرد(درودی خودای لەسەربێت) بینی وەك مانگی چواردە پڕشنگدارە، دوایی بە دەنگێکی پڕ لە سۆزو ناسك گوتی:

باوکی قاسم ئەی دوای ئەوە پیاوەکە چی کردو بۆ کوێ چوو؟!

سەیری خەدیجەی کردو بە بایەخەوە فەرمووی:

بەرزبووەوە بۆئاسمان، دووبارە سەیریکردم، گوێم لە دەنگیبوو بەهێزەوە پێیگوتم:

موحەممەد من جبرائیلم، تۆش پێغەمبەرو نێردراوی خودای!.

خەدیجەخان (خودا لێیڕازیبێت) لەدڵی خۆیدا گوتی:

خودا پیرۆزیبکات، خودای مەزن و بەرزوبالاّ پیرۆزیبکات.

ئیتر خەدیجەخان(خودا لێیڕازیبێت) کاتێ ئەم بەسەرهاتەی بیست، هاوسەرەکەی لەباوەشی خۆی گرت و سەری ماچ کرد، بەشادمانیەوە گوتی:

مزگێنی بۆ تۆ باوکی قاسم، مزگێنی تۆ ئەو پێغەمبەرەی خەڵك هەمیشە باسی دەکەن، ماوەیەکی دوورو درێژە چاوەڕێی هاتنی دەکەن.

پاشان لەسەر خۆ سەری ڕاهەژاند،تا کەمێك خەو بیباتەوەو پشووێك بداتو

بحەسێتەوە، بەڵکو ئەم ترس و لەرزەی تۆزێك لەبیربچێتەوە، ئیتر لەتەنیشتیەوە ڕاوەستا تا پێڵوی چاوەکانی لەیەکترنا، دوایی خێرا چوو جلی خۆی گۆڕی و بەرەوماڵی(وەرەقە)ی ئامۆزای چوو، سەرجەم بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوە، ئەمیش بەسەرسامیەوە گوتی:

پیرۆزە!، پیرۆزە!.

خەدیجەخان هاوسەرەکەت پێغەمبەرە، بۆیە جبرائیل هاتۆتە لای، هەروەك هاتۆتەلای هەموو پێغەمبەرەکانی پێشووتر، ئیتر پێویستە تۆ یارمەتی بدەیت، هەمیشە پشتیوانی بکەیت بۆ جێبەجێکردنی پەیامەکەی.

نەختێك بێدەنگ بوو، دوایی گوتی:

خەدیجەخان ئازاو جەسوور و بوێربە، چونکە ڕێگایەکی دوورو درێژو سەخت و دژوارو پڕ لەئەشکەنجەو ئازارو مەینەتیتان لەبەردەمدایە.

دوای ئەوە خەدیجەخان(خودا لێیرازیبێت) خێرا گەڕایەوە ماڵەوە، تابیروڕای وەرەقە بەهاوسەرەکەی بڵێت.

بەڵام سەیری کرد هێشتا هەر خەوتووە، بۆیە لەنزیکی دانیشت و بەچاوێکی پڕ لەسۆزو بەزەییەوە سەیری دەکرد، لەپڕ بینی لەخەوەکە ڕاچڵەکی و نێوچاوانی ئارەقەی کرد، خەدیجەخان(خودا لێیرازیبێت) ئەمەی بینی سەرسامبوو، ویستی هوشیاری بکاتەوەو لە خەو هەلیبستێنێت، دوایی وای پێ پەسندبوو نەختێك بوەستێت، تا ئەو بارودۆخە نالەبارەی نامێنێت، بەڵام موحەممەد(درودی خودای لەسەربێت) لەناکاو چاوی هەڵێنا بێدەنگ بوو، چاوەکانی لەبن میچی ژوورەکەدا بەدوای شتێکدا دەگێڕا، وەك چۆن سەیری شتێك بکات، دوای ئەوە گەڕایەوە دۆخی خۆی و بێدەنگبوو، خەدیجەخان (خودا لێیرازیبێت) بەدەنگێکی نەرم و لەسەرخۆ گوتی:

باوکی قاسم بۆ لەخەو هەستایت، خۆتۆ پێویستیت بە حەسانەوەو خەوی پتر هەیە.



فەرمووی:

خەدیجە ئیتر کاتی حەسانەوە ڕۆیشت و تێپەڕبوو، چونکە جبرائیل فەرمانی خودای پەروەردگاری بۆ هێناووم، ئیتر لەمەودوا دەبێ کاربکەم و هەوڵبدەم، بۆ ئەوەی خەڵك ڕزگاربکەم لەم ڕێگا چەوت و گومڕایەی لەسەری دەڕۆن.

دوای کەمێك بێدەنگی، لەسەرخۆو بەهێمنی فەرمووی:

خەدیجە تۆ فەرموودەکان و فەرمانەکانی پەروەردگاری بەرزو باڵات نەبیست؟!

جبرائیل ئێستا پێیراگەیاندم، خودای مەزن دەفەرموێت:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمُدَّثِّرُ ۝١ قُمْ فَأَنذِرْ ۝٢ وَرَبَّكَ فَكَبِّرْ ۝٣ وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ ۝٤ وَٱلرُّجْزَ فَٱهْجُرْ ۝٥ وَلَا تَمْنُن تَسْتَكْثِرُ ۝٦ وَلِرَبِّكَ فَٱصْبِرْ ۝٧ ﴾ المدثر: ١ – ٧

واتاکەی:

ئەی ئەو کەسەی خۆت لە کراسەکەت لولداوە و لەخۆت ئاڵاندووە، لە جێگاکەت هەڵسە بەورەوە خەڵك ئاگادار بکەرەوە لەئازاردان و ئەشکەنجەدانی خودا، ئەگەر باوەڕنەهێنن، پەروەردگاری خۆت تایبەتمەند بکە بە گەورەیی و مەزنی، خۆت خاوێنبکەرەوە لە بێ ئارامی، مەبەستی ئەوەیە کە (کراسەکەت لەسەر لاشەیەکی بە تاوان لەبەر مەکە)، خۆشت دوور بخەرەوە لە ئازار، چاکەیەکیش بکەیت بە زۆری مەزانە، ئارامگرو خۆڕاگربە لە پێناو ڕازی بوونی خودا لەسەر ئەو ئازارانەی تووشی دەبیت.

خەدیجەخان(خودا لێیرازیبێت) کاتێ ئەم ئایەتە پیرۆزانەی بیست، زۆر شادو کامەرانبوو، هەستی کرد لەناخەوە هێزو توانایەك هەیە هانیدەدات و ورەبەخشە بۆخۆبەختکردن و تێکۆشان لەپێناو ئایینی نوێدا، ئەم هێزە ئامادەی کردوە بۆ بەرگریکردن و خۆڕاگری لەبەردەم هەموو جۆرە هەڕەشەو ئەشکەنجەو ئازارو ئەهامەتیەکانی چاوەڕوان کراو، دوای ئەختێك بیرکردنەوە بە زەدەخەنەیەکەوە



گوتی:

باوکی قاسم مزگێنی بۆتۆ بۆ ئەم سەروەریەو دوا ڕۆژە پیرۆزو گرنگەو ئەم مەزنیەی خودای مەزن بەتۆی بەخشیوە.

پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) فەرمووی:

خەدیجە ئیتر دەبێ فەرمانی خودا جێبەجێ بکەم، داوا لەخەڵك بکەم و ئاگاداریان بکەمەوە، تا باوەڕ بە خودای مەزن بێنن و ڕێگای ڕاست ودروست بگرنەبەر، دوایی فەرمووی:

بەڵام هەرچەند بیر دەکەمەوە، نازانم ئەو هۆزەی من چۆن ڕێگای چەوت و نالەبار جێدەهێڵن، چۆن ئەو هەموو خراپەکاری و ستەمانەی تیایدا پەروەردە بووینەو لەسەریدا ڕاهاتوون لە ڕەگ و ڕیشەوە هەڵدەکەنن، خەدیجە ئەوانە بەرهەڵست و بەرگری دەکەن، بۆیە دەڵێم نازانم ئەنجامی هەوڵ و تەقەلاو خەبات و تێکۆشانمان بەچی دەگات.

خەدیجەخان(خودا لێرازیبێت) هێشتا شیرینی و تاموچێژی فەرموودەی خودای مەزنی لەسەر زاری مابوو، گوتی:

هەروەکو خودا فەرمانی پێ کردوویت(ولربك فاصبر) ئارام بگرە لە پێناوی خوادا، کەواتە پێویستە خۆڕاگرو بەئارامبیت، چونکە بەئاسانی ناتوانیت بیرو بۆچوونی چەوت و نالەبار لە دڵی کەسێك دەربکەیت لەسەر ئەو ڕێگایە پەروەردە کرابێت و گەشەی کردبێت، بەڵام سوێندم بەو خودایەی تۆی ناردوە بەهەق،هەرگیز خودای بەرزو کاربەجێ تۆ لەبیرناکات، بەڵکو هەمیشە لەگەڵتدایە و چاودێریت دەکات و یارمەتیت دەدات، چۆن پەروەردگار بەتەنیا جێتدەهێڵێت؟! کەچی تۆی ناردووە بۆ ئەوەی ڕێنمایی خەڵك بکەیت، تا بەرەو ڕێگای ڕاستی ئەویان بەریت و فێری خودا پەرستیان بکەیت!.

خەدیجەخان(خودا لێرازیبێت) تاموچێژی باوەڕو شیرینی پەیامەکەی لە دڵ و

دەروونیدا جێگیربوو، بۆیە بەدەنگێکی بەرزتر گوتی:

من یەکەم کەسم باوەڕم بەتۆ هێنا، گەواهی دەدەم تۆ نێردراوی خودای باڵاو مەزنی‌و پێغەمبەری ئەوی، بۆیە خۆم و ماڵ و سامانیشم لەپێناو خوادا بەختدەکەم و پێشکەش بەم ڕێگایە پیرۆزەی دەکەم.

پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) بەم هەڵوێستەی خەدیجەی هاوسەری(خودا لێیڕازیبێت)، زۆر ئاسوودەو بەختەوەربوو، لەسەرەتاو دەستپێکی کارە پیرۆزەکەیدا لایەنگرو یارمەتیدەرو دڵسۆزی بۆ هاتە ئاراوە، بەتایبەتی لەنێو خانەوادەکەی خۆیدا، بۆیە وەك گوڵ گەشایەوە.

# خەڵکی مەککە و هەواڵی پێغەمبەرایەتی

لەبەر گرنگی و پیرۆزی و مەزنی ڕووداوەکە، خەدیجەخان(خودا لێیڕازیبێت) ئەوەندە دڵخۆش و شادبوو بۆیە بەیانی زوو لەگەڵ گزنگی خۆر چوست و چالاکانە لەخەو هەڵسا هەرگیز هەستی بەشەونخونی نەدەکرد، لەدوای ئەو پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) هەڵسا چوو بۆ(کەعبە)ی پیرۆز، وەك دابونەریت و پاشماوەو بۆماوەی ئایینی ئیبراهیم پێغەمبەر(سلاوی خودای لەسەربێت)بەچواردەوری کەعبەی پیرۆزدا سووڕایەوە، پاشان ڕووەو کەعبە دانیشت، پاش ماوەیەکی کەم وەرەقەی کوڕی نەوفەلیش هات بۆ ئەوێ، کاتێ چاوی بەپێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت)کەوت زۆر دڵشادبوو، لەلای ئەو دانیشت، دوای پیرۆزبایی کردن چەندین ئامۆژگاری بەپێزو قسەی سوودبەخشی بۆکرد، هەروەها داوای لێکرد خۆڕاگربێت و لەسەر ڕێگای خۆی سوورو بەردەوام بێت، وێڕای ئەوەش بۆی باسکرد چی بەسەردێت لەدەست قورەیشیەکان، چۆن بەدرۆی دەخەنەوە، تووشی چەوسانەوەو دەردەسەری و دەربەدەری دەبێت، لە کۆتایی قسەکانیدا وەرەقە تەوقی سەری

پێغەمبەری(درودی خودای لەسەربێت) ماچکرد، هەرچەندە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێت) لەدانیشتنەکەدا سەری زۆر نزیک کردبووەوە لە دەمی وەرەقە، بەڵام وێڕای ئەوەش هەندێ لەم قورەیشیانەی نزیک ئەوان گوێیان لە قسەکانی وەرەقە بوو، بۆیە کاتێ وەرەقە ڕۆیشت ئەوان هاتنەلای موحەممەد(درودی خودای لەسەربێت) پرسیاری قسەکانیان کرد، گوتیان چی بووە؟.

پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) سەیریکردن و بەدڵنیاییەوە فەرمووی:

دوێنێ شەو من سروشم(وەحیم) بۆ هاتووە!!.

قورەیشیەکان هەموویان سەیری یەکتریان کرد، یەکێکیان بەسەرسامی و بە حەپەساوییەوە گوتی:

موحەممەد کێ سروشی ( وەحی ) بۆ ناردوویت؟!

پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) بە متمانەیەکی زۆرو بەورەوە فەرمووی:

ئەو پەروەردگارەی من و ئێوەی دروستکردوە وەحی بۆ ناردوم، ئەو خودایەی ئاسمانو زەوی و بەردو دارو ئاوی دروستکردووە.

یەکێکیان بەپێکەنینەوە گوتی:

خودای تۆ دەربارەی چی وەحی بۆ ناردوویت؟.

پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) بەدڵنیاییەوە فەرمووی:

وەحی بۆ ناردووم تا خەڵك بەرەو ڕێگای خوداپەرستی و ڕێگای ڕاست بەرم، لەسەر ئەم گومڕاییەو ڕەفتارە ناشیرین و قێزەوونانە لایانبدەم، ئەرێ تۆ ئەم ژیانە ئاڵۆزو ناڕێکە نابینیت؟، ئایا پێویستی بە گۆڕانکاری نیە؟!

یەکێکی تر بەگاڵتەوە گوتی:

ئەوا تێگەیشتین و زانیمان، تۆ دەتەوێت ببیتە ئەو پێغەمبەرەی خەڵك باسی دەکەن، زۆر کەس پێش تۆ داوایان کردو گوتیان ئێمە ئەوین، بەڵام جگە لە گاڵتەو ئازار و ئەشکەنجە بەملاوە هیچی تریان دەست نەکەوت، تۆش تا زووە هەر لە

ئەمڕۆوە بگەڕێوە هۆش خۆت و واز لەم کارە بێنە، ئەگەر نا بەدەردی ئەوانەی تر دەچیت و تووشی ئازارو ئەشکەنجەو ڕەنجەڕۆیی و دەردەسەری دەبیت.

خەدیجەخانیش(خودا لێیڕازیبێت)لەماڵەوە دەستەخوشك و كەنیزەو کارکەرەکانی خۆی کۆکردبوووەوەمزگێنی بەپێغەمبەربوونی هاوسەرەکەی پێ ڕاگەیاندن،چۆن پەروەردگاری مەزن(وەحی) بۆ ناردوە، ئەوانیش هەموویان زۆر بەسەرسامی و بایەخەوە گوێیان بۆ بەسەر هاتەکەی پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت)گرتبوو، دوایی ڕۆیشتنەوە ئەم هەواڵەیان بەهاوسەرو خێزانەکانیان ڕاگەیاند، ئیتر زۆری نەخایاند هەواڵی پێغەمبەرایەتی موحەممەد(درودی خودای لەسەربێت) لەناو سەرجەم خەڵکی مەککەدا بڵاوبووەوە، زۆربەی خەڵکەکە باوەڕیان نەکرد، بەڵکو بەپێچەوانەوە گاڵتەیان بەم پەیامە دەهات، بەڵام هەندێکیان خێرا بەخۆیان داچوونەوەو پرسیاریان لە خودی خۆیان کرد، ئایا موحەممەد بۆچی ئەو گیروگرفتە بۆ خۆی دروست دەکات؟، بەڵام لەلایەکی دیکە دەیانگوت خۆ ئەم پیاوە هەرگیز درۆی نەکردوە، لە ڕاستۆگیی و ئەمینی بەملاوە هیچی ترمان لێی نەبینیوەو نەزانیوە! ئەی خەدیجەخانی هاوسەری ژنێکی هۆشمەندو ژیرە چۆن باوەڕی بەقسەکانی ئەو هێناوە؟! کەواتە بۆچی ئەم قسانە دەکات؟، دوایی هەر لەدڵی خۆیان دەیانگوت ڕەنگە خەدیجە شێت بووبێت و مێشکی تێکچووبێت، بەڵام ئەی موحەممەد؟، نا، چۆن دەبێ هەر دووکیان بەیەکەوە لە یەك شەودا شێت بووبن!؟.

ئیتر بۆگەیشتن بەڕاستی ودروستی ئەم هەواڵە، ژنان بەکۆمەڵ ڕویان لەماڵی خەدیجەخان (خودا لێیڕازیبێت)دەکرد، ئەمیش بەدڵێکی فراوان و پڕ لە متمانەو هیواوە بۆی باس دەکردن و جەختی لەسەر ڕاستی و دروستی دەکردەوە، هەروەها ئەو ئایاتانەی دەیزانی بۆی دەخوێندنەوە، ئەوانیش زۆر بە وردی سەیری ڕوخساریان دەکرد، تا بزانن ئاخۆ هیچ بەڵگەیەك و نیشانەیەکی شێتبوونی پێوە



دیارنیەا، بەڵام هیچیان دەست نەکەوت، بەڵکو خەدیجەخان(خودا لێیڕازیبێت) هەروەکو جاران ژنێکی قسە شیرین و وردبین و هۆشمەندبوو، ئیتر بەحەپەساوی سەرسامیەوە دەچوونەوەماڵەوە، ئەوەی بینیبوویان و بیستبوویان بۆ هاوسەرەکانیان دەگێڕایەوە.

پاشان ئەم ژنانە ڕۆژانە دەهاتنەوە لای خەدیجە(خودا لێیڕازیبێت)، سەبارەت بە(وەحی) پرسیاریان دەکرد، ئاخۆ چ شتێکی نوێ لەئاسمانەوە دانەبەزیوە؟، بەڵام بۆماوەیەك وەحی پچڕا و دانەبەزی، پێغەمبەر( درودی خودای لەسەربێت) لەم پچڕانەو دانەبەزینە سەرسامبوو، خەدیجەخانیش(خودا لێیڕازیبێت)، چونکە وەحی نەدەهاتە خوارەوە، بۆیە هیچ جۆرە وەڵامێکی لانەبوو نەیدەزانی چ بەژنەکان بڵێت، دەرەنجام زۆر غەمگین و خەفتبار بوو، لەوە دەترسا نەوەك خودا وازی لە پێغەمبەر( درودی خودای لەسەربێت) هێنابێت، ئیتر ئەویش ئەم شکۆداریەی لەدەستبچێت، کەخۆی و ماڵ وسامانەکەی بۆ تەرخان کردوەو بڕیاریداوە لەپێناویدا بەختیبکات، سەرەڕای ئەمەش کاتێ پێغەمبەری (درودی خوای لەسەربێت) بەپەشۆکاوی و نائارامی دەبینی، زۆر خەفەتبارو غەمگین دەبوو، بەڵام هەرگیز ئەم غەمباریەی ڕەنگدانەوەی لەسەر ڕوخسارو هەڵسوکەوتی نەبوو، نەوەك کاربکاتە سەر بیروهەست و ورەی هاوسەرەکەی، بەڵکو بەپێچەوانەوە سەرجەم ڕەفتار و قسەکانی دڵنەوایی بوون بۆ پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت)، هەمیشە دەیگوت نزیکبووە خودا وەحیت بۆ بنێرێت و ئایاتەکانی دابەزێت.

بەڵام وەحی هەر نەهاتە خوارەوە، بۆیە پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) یەکجار غەمگین و پەشۆکاو بوو، خەدیجەخان(خودا لێیڕازیبێت) لەم کاتە ناسکەدا ڕۆڵێکی گرنگ و کارای هەبوو، چونکە هەرکاتێ بیدیبایە پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) بەماتوکزی و خەفەتباری دانیشتوە خەریکی بیرکردنەوەیە دەچوو لەلای دادەنیشت، بەدەنگێکی پڕ لەسۆزەوە دەیگوت:

ئەی پێغەمبەری خودا(درودی خودای لەسەربێت) غەمگین مەبە، چونکە هیچ ناخۆشی و تەنگژەیەك نیە کۆتایی نەیەت، هەموو ناخۆشییێك فراوانی بەدواوەیە، سەرەڕای ئەمەش بێگومان خودای بەرزو بالا چۆن بیەوێت هەروادەبێت، پاشان لەخودا دەپاڕایەوە، تکاو نزای دەکرد بەزەیی بەپێغەمبەری خۆی(درودی خودای لەسەربێت) بێتەوە، تا چیتر لەم نائومێدیەو نیگەرانیەدا نەمێنێتەوە، خەڵك بێ متمانەیی و دوودڵیان لا دروست نەبێت.

پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) زۆر پەرێشان و خەفەتباربوو، هەمیشە بیری دەکردەوە، کاتێك خەدیجەخان(خودا لێیڕازیبێت) سەیری کرد هاوسەرەکەی بەمجۆرە نیگەرانە، لەلای دانیشت بەقسەی خۆش و بە پێز هانیدەدا وورەی بەرز دەکردەوە، ئیتر لەپڕ بینی نێوچاوانی خەریکە وورده وورده ئارەقە دەکات، زانی ئەوە نیشانەی دابەزینی سروشە، بۆیە لەخۆشیانا ڕاچڵەکی، بەدەنگێکی پڕ لە هیواو لەسەرخۆ گوتی:

باوکی قاسم پەروەردگار تۆی جێنەهێشتوەو وازی لێ نەهێناوی.

پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) بەخەندەیەکی شیرین سەری ڕاهەژاند، پاشان بەدەنگێکی زوڵاڵ وپڕ لەخرۆشەوە، ئەم ئایەتانەی بەبن گوێدا چرپاند:

﴿ وَٱلضُّحَىٰ ﴿١﴾ وَٱلَّيۡلِ إِذَا سَجَىٰ ﴿٢﴾ مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَىٰ ﴿٣﴾ وَلَلۡأٓخِرَةُ خَيۡرٞ لَّكَ مِنَ ٱلۡأُولَىٰ ﴿٤﴾ وَلَسَوۡفَ يُعۡطِيكَ رَبُّكَ فَتَرۡضَىٰٓ ﴿٥﴾ أَلَمۡ يَجِدۡكَ يَتِيمٗا فَـَٔاوَىٰ ﴿٦﴾ وَوَجَدَكَ ضَآلّٗا فَهَدَىٰ ﴿٧﴾ وَوَجَدَكَ عَآئِلٗا فَأَغۡنَىٰ ﴿٨﴾ فَأَمَّا ٱلۡيَتِيمَ فَلَا تَقۡهَرۡ ﴿٩﴾ وَأَمَّا ٱلسَّآئِلَ فَلَا تَنۡهَرۡ ﴿١٠﴾ وَأَمَّا بِنِعۡمَةِ رَبِّكَ فَحَدِّثۡ ﴿١١﴾ ﴾ الضحى: ١ – ١١

واتاکەی:

خودا سوێند دەخوات بەم کاتەی خۆر بەرزدەبێتەوە لە سەرەتای ڕۆژێکی نوێدا،

واتە(کێشتان ـ چێشتان)، سوێند دەخوات بە کپو بێدەنگی و تاریکی شەو، خـودا تـۆی جێنەهێشتومو ڕقـی لێت نیـە(موحەممـەد) وەکۆتـایی کارەکـەت لـە بڵاوکردنـەوەی ئـایین بۆتـۆ چـاکتر دەبێـت لـە سـەرەتاکەی،(وەحـیش) بـە بـەردەوامی بەسـەر تـا دادەبـەزێت و پلەوپایـەو هێـزت زیـاتر دەبێـت، خـودا بەخشـشەکانی خـۆی بـەبیر دێنێتەوە، کاتێ هەتیوو بوو(ئەبوتالیب)ی مامی بردیە لای خۆی تا بەخێوی بکات و لەگاورەکان بیپارێزێت، سەرسام و نیگەرانبوو لەڕەفتاری میللەتەکەی خودا ڕزگاری کرد بە وەحی و ناردنی ئاینی پیرۆزی ئیسلام، بەکۆمـەڵ خـەڵك هاتنـە سەر ڕێگای ڕاست، هەژار بوو دوایی دەوڵەمەندی کرد، پاشان خودا فەرمان بە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێت) دەکات، خۆی تاڵی هەتیوی چەشتوە بۆیە نابێ هـەتیو ڕووشکێن بکرێت و ستەمی لێ بکرێت، ئەوەی پرسیاری شتێك بکات نابێ بـەدڵ شکاوی بـەڕێ بکرێت، هەردەم باسی بە خشش و چاکەکانی خودا بکات.

دوای بیستنی ئەم ئایەتـە پیرۆزانـە خەدیجەخان(خـودا لێیڕازیبێت)زۆر دڵشادو کامەرانبوو، دڵی سرەوت و ئۆقرە و ئـارامی گـرت، بیری لـەم ئایەتانـە کـردەوە چـۆن فەرمان و ڕێنماییەکانی خودای مەزن وبالا، پێویستە لەمەودوا کاریـان پـێ بکرێـت و جێبەجێ بکـرێن، تـا ببێتـە سـەرمایە و پـشتیوانێك بـۆ ڕۆژی دوایـی، چونکە ژیـانی دواڕۆژ چاکترە لـەم ژیانـەی ئـەم جیهانەکاتیـە و سـەرەتاییە، هـەروەها ئـەم ئایەتانـە ئەوە دەخاتەوە بیرو یادی پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) پـەروەردگار چـجۆرە چـاکەیەکی لەگـەڵ کـردوە، وێـڕای ئەمـەش داوای لێ دەکـات قـۆڵ و بـازووی خـۆی هەربماڵێ و زۆر بە پەرۆشـەوە داوا لەخـەڵك بکات بـۆ ڕێگای خواپەرستی، ئاگاداری هەتیوو هەژاران بێت، ئیتر بەدەم بیرکردنەوە لـە ئایاتـە پیرۆزەکـان زەردەخەنەیـەك هاتە سەرلێوەکانی، پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) لەم کاتەدا سـەیری دەکـرد، بەدڵخۆشی و کامەرانی هاوسەرەکەی زۆر شادو بەختەوەربوو فەرمووی:

خەدیجە بێگومان هەموو چاکەیەك و بەخششێك لەلایەن خوداوەیە، خودا تۆی

کرد بەهاوسەری من، ئەوەتا ئێستا بەسامان و بەخودو بەگیانی تۆ من دەوڵەمەنـدم، بۆیە هیوادارم لەڕۆژی دواییدا خودا پاداشتت بداتەوە، لەبری ئەم چاکانەت چاکەت لەگـەڵ بکاتـەوە، بۆیـە تکایـە ئـەو کاتـە ئـەم چـاکانەم بیربخـەرەوە، گوێـت لەمنـە خەدیجە.

خەدیجەخان (خودا لێڕازیبێت) خێرا بەچاوێکی پڕ لە ئەسرین گوتی:

خـۆم و مـاڵ وسـامانم بـەختکردوە لـەپێناوی خـودای پـاك و کاربـەجێ و پێغەمبەرەکەی (درودی خـودای لەسـەربێت)، خـودای مـەزن و باڵادەسـت پاڵپـشت و پشتیوانی تۆیە، کەواتە کاتی ئەوە هاتووە فەرمانەکانی خودای مەزن جێبەجێ بکەیت و ئایینە پیرۆزەکەی بەخەڵك ڕابگەیەنیت، منیش هەمیشە بـەگیان و بەسامان لەگەڵ تۆدام.

# دایکی موسـڵمانان

ڕۆژ لەدوای ڕۆژ ئایەتەکانی قورئـانی پـیرۆز بەسـەر پێغەمبـەردا(درودی خـودای لەسەربێت) دادەبەزیە خوارەوە،خەدیجەخانیش(خودا لێڕازیبێت) کاتـێ ئایەتـەکانی لەهاوسەرەکەی دەبیست بەم ژنانەی ڕادەگەیانـد کەهاموشـۆیان دەکـردو دەهاتنـەلای، هـەروەها ئـەو یەکـەم کەسـبوو لـەدوای پێغەمبـەر(درودی خـودای لەسـەربێت) ڕێنماییەکانی خودای پێدەگەیشت و کاری پێدەکرد.

ئـیتر بـە تێپـەڕبوونی ڕۆژگـار، ئایاتـەکان و ڕێنماییـەکان لـەناو زۆربـەی چـین و توێـژەکانی شـاری مەککـەدا بڵاوبـووەوە، لەئەنجامـدا هەنـدێ لـە گـەورەپیاوان و خەڵکێکی زۆریـش لەچینی چەوساوەو ستەمدیدەو نـەدارو هـەژاران، باوەڕیـان بـەم ئاینـە تازەیـە هێنـا، چـونکە پرشـنگی خـۆری ئـازادی و ڕزگاربوونیـان لـەم ئایینـە تازەیەدا بەدیدەکرد، هەروەها چینی چەوساوەو ستەمدیدە کاتێ بینیان نـاوەرۆکی

ئـەم ئاينـە دژی کـردەوەو ڕەفتـاری ناشـيرين و ناڕێـك و خراپـەو خراپەکاريـە، بەيەکسانی و دادوەری سەيری خەڵك دەکات، سەرجەم هێزە جياجياکان ڕێکدەخاتو کۆدەکاتەوەو کارەکانيان يەکدەخات تا هـەموويان بەيەکەوە لـە پێنـاوی خـوادا کـاری پوخت و چاك ئەنجامبدەن، زوو باوەڕيان بەم ئايينە تازەيە هێنا.

بێگومـان خەديجـەو چـوار کـچەکەی يەکـەم کەسـبوون موسـڵمانبوون، باوەڕيـان بـەئايينی نـوێ هێنـا، بـەڵام ئـەم باوەڕهێنانـە بـۆ کـچەکانی بووەمايـەی مەينـەت و دەردەسەری و دروستبوونی کێشەو گيروگرفت، چونکە سێ کچيان شوويان کردبـوو، کاتێ موسڵمانبوون هاوسەرەکانيان موسڵمان نەبوون، جگە لەمەش سـەرکردەو پيـاوە دەسـەڵاتدارەکانی مەککە بـەهاتنی ئـەم ئايينـە نوێيـە زۆر نيگـەران و دڵپەسـتبوون، کاتـێ بينيـان خـەڵکێکی زۆر موسـڵمان دەبـن و ڕۆژ لـە دوای ڕۆژ ژمـارەی موسـڵمانان لەزيادبووندايـە، ترسـيان لەدڵـدا پەيـدابوو، بۆيـە دەسـتيان کـرد بـەپلانگێڕان دژی موسڵمانەکان، ئەگەر موسڵمانەکە کۆيلـە و بـێ دەسـەڵاتبوايە ئـازارو ئەشـکەنجەيەکی زۆريان دەدا، تائايينی نوێ جێبهێڵێت و بگەڕێتـەوە سـەر بتپەرستی، بـەڵام سـەبارەت بەو ژنانەی موسڵمان دەبوون، هەوڵياندەدا دڵی هاوسەرەکانيان لێ ڕەش بکەن، ئـاگری دووبەرەکيان لەنێوان ژنـەکان و خـزم و کەسـی هاوسـەرەکانيان خـۆش دەکـرد، بۆيـە کچەکانی پێغەمبـەريش(درودی خـودای لەسـەربێت) لـەم ئازاوەيـەو دووبەرەکيـە بـێ بـەش نـەبوون، بـەڵکو تووشـی گيروگرفـت و ناخۆشـی و کێـشەهاتن، بـەڵکو خانەوادەکايان سەرقاڵی کێشەی ئەوانبن، نەك بڵاوکردنەوەی ئايين.

سەرەڕای ئەوەش لەلايەك لەترسی ستەم و ئەشکەنجەو ئازاردان، لەلايەکی تر بۆ پاراسـتنی ئايينەکـەيان، خـەڵکێکی زۆر ڕوويـان لـەماڵی پێغەمبـەر کردبـوو (درودی خـودای لەسـەربێت)ئـيتر خەديجـەخان(خـودا لێيڕازيبێـت)وێـڕای سـەرقاڵبوونی بەکێشەی کچەکانی، بەدڵێکی فراوان و پڕ لەسۆزو بەزەييەوە يارمـەتی سـەرجەم بـێ دەسەڵات و چەوساوانی دەدا، ئەوانـەی گاورەکـان لەسـەر کارەکانيـان دەريـانکردبوون،



بێ جێگاوڕێگا مابوونەوە، هەروەها بەماڵ و سامانی خۆی هەرگیز کەمتەرخەمی نەدەکرد لەئازادکردنی کۆیلەو بەندەکان، چونکە ڕووبەڕووی سامناکترین ئازارو ئەشکەنجە دەبوونەوە، تەنیا لەبەر ئەوەی بتپەرستیان جێهێشتبوو خودایان بە پەروەردگاری خۆیان دانابوو، سەرەڕای ئەوەش هەرچەند دوژمنداریەتی گاورەکان لەئاست موسڵماناندا دژوارتردەبوو، خەدیجەخان (خودالێیڕازیبێت) دڵی فراوانتر دەبوو، پتر بەدەم ستەمدیدەو هەژارانەوە دەچوو، چێشت و نانی دەدایە برسیەکان، تەنانەت ماڵەکەیان بووبووە پەناگەو شوێنی داڵدەدانی بێ دەسەڵاتان و ستەمدیدەکان، هەرگیز کەمتەرخەمی نەدەکرد لەپێناو بڵاوکردنەوەی ئایینی نوێی پیرۆزدا.

ڕازێك لەدڵی خەدیجەخان(خودا لێیڕازیبێت) خۆی مەڵاسدابوو، بۆیە هەردەم لە خودا دەپاڕایەوە ئەم خواستەی بەدیبێنێت و ئەم ڕازەی بۆ جێبەجێ بکات، هەستی دەکرد بەرەو تەمەنی بێ هیوا و نائومێدی دەڕوات، بۆیە حەزیدەکردو ئاواتەخواز بوو کچەکانی براێکیان هەبێت و هاوسەرەکەی کوڕێکی هەبێت، بەڵکو هیوای دوا ڕۆژی لە کوڕەکەدا بەدی بکات، بۆیە لەخودای بەرزو باڵا دەپاڕایەوە تکاو نزای دەکرد ئەم بەخششەی پێ بدات، هەروەکو بەخششی ئاینی ئیسلامی پێ بەخشیوە، ئیتر لەپڕ هەستی کرد باری گرانبووە، زۆر شادو دڵخۆشبوو، دووبارە کەوتەوە پاڕانەوە بەڵکو خودا بیکاتە کوڕ.

کاتێ زانی کوڕێکی بووە، لەخۆشیانا خەریکبوو باڵ بگرێت، چاوی بەپێغەمبەر کەوت (درودی خودای لەسەربێت) بینی لەتەنیشتیەوە وەستاوە، بەچاوێکی پڕ لە سۆزو خۆشەویستی، بەدەنگێکی ناسك گوتی:

باوکی قاسم چ ناوێك بۆ کۆرپەکەمان هەڵدەبژێریت؟، بەڵام کەوایگوت خۆی بۆ نەگیرا فرمێسکەکانی هاتنەخوارەوە.

پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێت) بەهێمنی و لەسەرخۆ فەرمووی:

خەدیجە ناوی دەنێین (عەبدوللا)، چونکە لەدوای هاتنی ئایینی ئیسلام لەدایکبووە، ئەم کۆرپەڵەیە پاکژە و چاکترە لەوەی لەسەردەمی کاڵفامی و پێش ئیسلامدا لە دایکبووبێت، ئیتر ماڵەکەیان بەهاتنی ئەم کۆرپەیە هێندەیتر شادی و بەختەوەری ڕووی تێکرد، وێڕای ئەمەش زۆربەی دۆست و خۆشەویستان بەکۆمەڵ دەهاتن پیرۆزبایی لە دایکبوونی عەبدوللایان لێ دەکردن، بێگومان ئەمەش فاکتەرێکی بەهێزبوو بۆ بەرز کردنەوەی وەرەی خەدیجەخان، هەروەها بەبۆنەی لەدایکبوونی عەبدوللا چەندین دیاری نایابی بەسەر هەژاران و بێ دەرامەتاندا دابەشکرد، چاوی هیواو ئاواتی بڕیبووە ئەم کوڕە، بەڵام بێگومان ئەوەی خودا بیەوێت کەس بۆی نیەو تواناى نیە ڕەتی بکاتەوە، هەر خودا خۆی دانایەو دەزانێ چی دەبێت و بۆچی؟ پەروەردگاری کاربەجێ لەناکاو عەبدوللای هەڵبژارد و بردیەوە بۆلای خۆی، ئیتر بەمردنی ئەم منداڵە خنجیلانەیە باڵی غەم بەسەر ئەم ماڵەدا خشا، کچەکان ئارامیان نەما خەدیجەخان(خودا لێیڕازیبێت) بە دوولێوی لەرزۆکەوە هەوڵیدەدا قوڵپی گریانی سەرنەکات، بەڵکو لەناخیدا پەنگبخواتەوە، بەڵام خۆی بۆنەگیرا فرمێسکەکانی بەگوڕ هاتنەخوارەوەو لەپرمەی گریانیدا.

پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) هاتەلای بۆدڵنەوایی و ئارامکردنەوەی سەرەخۆشی لێیکردو فەرمووی:

خەدیجە خودا دەیەوێت چاکەیەکت لەگەڵدا بکات، نەیویستووە تۆ تەنیا دایکی یەک کەس بیت، یان تەنیا دایکی(قاسم و عەبدوللا) بیت، بەڵکو تۆی کردوە بە دایکی سەرجەم موسڵمانان، ئیتر خۆت پەرێشان مەکە، ئەم نازناوە نوێیە مایەی شادی و کامەرانیە بۆتۆ، دوای ئەمە دوو فرمێسک بەسەر ڕوومەتیدا هاتنە خوارەوە، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێت) بەدەستی پیرۆزی بۆی سڕیەوەو فەرمووی:

خەدیجە، ئایندەو دواڕۆژ چاکترە لەم ژیانەی ئێستا، دوایی ئەم ئایەتەی خوێندەوە کەخودا فەرموویەتی:

﴿وَلَلْآخِرَةُ خَيْرٌ لَكَ مِنَ الْأُولَىٰ ﴿٤﴾ وَلَسَوْفَ يُعْطِيكَ رَبُّكَ فَتَرْضَىٰ ﴿٥﴾﴾ الضحى: ٤ – ٥

خەدیجەخان(خودالێیڕازیبێت) کاتێ ئەم ئایەتانەی بیست دڵی سرەوت و ئۆقرەی گرت، ڕازی بوو بەکاری خودای مەزن و کاربەجێ، دوای ئەمە پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) فەرمووی:

خەدیجە، ئێمە هەمووومان دەگەڕێینەوە لای خودا، ئیتر لە هەرکات و ساتێکدا بێت دەسەڵاتمان نیە دەبێ بگەڕێینەوە، کەواتە پێویستە خۆمان ئامادەبکەین بۆ هەوڵ و تێکۆشان، هەروەك خۆت بەڵێنت بەخودای بەرزو باڵا داوە، خۆت بەخت بکەیت لەپێناو بڵاوکردنەوەی ئایینی ئیسلامدا، جا ڕێگامان وێڕای دوورو درێژی زۆر سەختەو پڕ لەئەشکەنجەو ئازارە.

## توندوتیژی

گەورەپیاوانی مەککە پێیانوابوو بانگەوازی موحەممەد(درودی خودای لەسەربێت) وەکو ئەوانەی پێشووترە، چونکە زۆر جار لێرەو لەوێ بەهرەمەندان و داناو زانایان، بۆ مەبەستێکی تایبەتی خۆیان، داوایان لەخەڵك دەکردو بانگەوازیان دەکردن بەڵام ئاواتەکەیان نەدەهاتەدی و بانگەوازەکەیان نەزۆك دەبوو، ئیدی بیرۆکەو مەبەستەکەیان زۆرزوو لەبار دەچوون.

هەرچەندە هێشتا پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) بە ئاشکراو ڕاستەوخۆ، داوای لە گەورەپیاوەکانی قوڕەیش نەکردبوو موسڵمانببن، بەڵکو بەنهێنی داوای لە خەڵك دەکرد باوەڕ بەخودای تاکوتەنیاو ئایینی ئیسلام بێنن، بەتایبەتی لای ئەمجۆرە کەسانە باسی ئایینی تازەی دەکرد، کە چاوەڕوانی چاکەی لێ بکرابوایە، خەڵکانی ڕێکوپێك و ڕەوشت بەرزو ڕەفتار جوان بوونایە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا موسڵمانان لەچنگ تیروتوانج و گاڵتەجاڕی گاورەکان بێزاربوبوون، تووشی ڕەنجەڕۆیی و دەردەسەری و ئەشکەنجە دەبوون، سەرەڕای ئەم ئازارو مەینەتیەش



ڕۆژ لەدوای ڕۆژ ژمارەی باوەڕداران لە پەرەسەندنو زیادبوون دابوو، موسڵمانان پـۆل پۆل ڕوویان لـە مـاڵی خەدیجەخان(خـودا لێیڕازیبێـت) دەکـرد، لـەم ماڵە مەزنـە زۆر بەڕێزەوە پێشوازیان لێ دەکرا.

ئەم بانگەوازە نهێنیە مـاوەی سێ سـاڵی خایانـد، لـەم ماوەیـەدا بـڵاو کردنـەوەی ئایینی ئیسلام هەمیشە بەنهێنی بـوو، ئـیتر موسـڵمانان بـۆ خوداپەرسـتی ڕوویـان لـە دۆڵو چیاکان و کەندو شیوەکانی مەککە دەکـرد، یـان بـە نهێنـی لـە مـاڵی یـەکێکیان کۆدەبوونەوە، ئەوەندەی بۆیـان بڕەخـسابایە لەبـەر چـاوی سـەرکردەو گـەورەپیاوانی قـوڕەیش دوور دەکەوتنـەوە، لـەنێوان خۆیانـدا بـەنهێنی و دوور لەچـاوی خـەڵك قسەیان دەکرد.

ڕۆژێکیـان پێغەمبـەر(درودی خـودای لەسـەربێت)لـەدەرەوە بـوو، کاتـێ هاتـەوە خەدیجەخان (خودا لێیڕازیبێت) هەستی کرد هاوسەرەکەی نیگەران و پەشۆکاوە، بـە پێکەنینەوە پێشوازی کردو لەسەر خۆ گوتی:

ئەی پێغەمبەری خودا(درودی خودای لەسەربێت) چی بووە؟.

پێغەمبەر(درو ـ خودای لەسەربێت) فەرمووی:

خودای مەزن فەرمانی پێ کردووم، دەبێ لەمـەودوا بەئاشـکرا بانگـەوازی خـەڵك بکەم بۆ باوەڕهێنان بـەم ئایینـە پیرۆزەو خوداپەرسـتی، هـەروەها گـەف لەبنەماڵەو خزمە نزیکەکانی خۆم و سـەرۆکەکان و پیاوماقوڵانی قـوڕەیش بکـەم، ئەگـەر بـاوەڕ بەخودای تاکو تەنیا نەهێنن ئەوا لەڕۆژی دواییدا ئازارو ئەشکەنجە دەدرێن.

خەدیجەخان(خودا لێیڕازیبێت) بەهێمنیەوە گوتی:

ئەی پێغەمبەری خودا(درودی خودای لەسەربێت)، لەڕاستیدا زۆر پێویستە گەف لـەهۆزو خـزم و کەسـت بکـەیت و پـەیامی پـەروەردگاریان پێڕابگەیـەنیت، چـونکە ئەگەر گوێیان لە ئایەتە پیرۆزەکانی پەروەردگاربێت، ڕەنگە بیربکەنەوەو موسڵمانبن، هەروەها پێموایە خزم و کەسی نزیکت لەخـەڵکانی تـر لەپێشترن بـۆ بـەپیرەوەهاتنی ئەم بانگەوازەو بەدەستهێنانی ڕەزامەندی پەروەردگار.

پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت)، زۆر بەووردی سەیریکرد، دوایی فەرمووی:

خەدیجە تۆ ڕاستدەکەیت، بەڵام خزم و کەسی من، لەبەر ئەوەی هەندێکیان کوڕو کۆیلەو بەندەکانیان لەدەستداوە بەهۆی باوەڕهێنانیان بەخودای تاکوتەنیا، بۆیە واهەست دەکەن ئەم ئایینە نوێیە ژیانی لاتاڵکردون، ئیتر زۆر ڕقیان لەئیسلام دەبێتەوە، ڕەنگە دەرەنجام دژایەتیمان بکەن و دەستەوەستان نەوەستن، ئێستا ئەوان داوا لەخەڵك دەکەن باوەڕ بەمن نەکەن و ئیسلام نەبن، ڕقوقینی دڵیان گڕی گرتووەو گڵپەی سەندوە، پێموایە هەر ئەم باسەیان لەگەڵدابکەم، گڕکانی تووڕەییان بەسەر موسڵماناندا دەبارێنن، ئیدی ئەوکاتە بەئاشکرا ڕووبەڕووی موسڵمانان دەبنەوە، ئازارو ئەشکەنجەیان دەدەن، بێگومان ئێمەش هێزو توانای ئەوانمان نیە.

خەدیجە خان(خودالێیڕازیبێت)، زۆر بەورەو گڕوتینەوە گوتی:

ئەی تۆ بانگهێشتی خەڵك ناکەیت بۆ ڕێگای ڕاست و ڕەوا؟ئیتر خودای بەرزو باڵادەست پشتیوانتە، ئەم پشتیوانە بەهێزە هەرگیز مل کەچت ناکات و بەتەنیا جێتناهێڵێت، کەواتە چۆن پەروەردگار فەرمانت پێ دەکات دەبێ ئاوا ڕەفتاریان لەگەڵدا بکەیت، قورئانیان بۆبخوێنەوە، بەڵکو ڕاستیەکان دەبیستن و دڵیان نەرم دەبێت، دەرەنجام بەسەر دڵە گومڕاکانیان زاڵ دەبن و باوەڕ بەخودای بەهێزو توانا دەهێنن.

دوایی بڕیاریاندا چێشت و خواردەمەنی دروست بکەن، خزمەکانیان بانگهێشتی سەر خوانی خۆیان بکەن، دوای نانخواردن پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) بەپێی فەرمانی خودای مەزن داواکەیان پێ ڕابگەیەنێت.

بۆ ئەم مەبەستە پێغەمبەر ( درودی خوای لەسەربێت ) بەیانی زوو چوەلای یەکەیەکەی خزم وخوێشەکانی، بانگهێشتی کردن بۆ سەرخوانی خۆیان، خەدیجەخان(خودا لێیڕازیبێت)خەریکی چێشت ئامادەکردنبوو،ئاواتەخوازبوو ئەو

خزم و کەسانەی ئامادەی سەر خوانەکەدەبن، داواکاریەکەی پێغەمبەر(درودی خودای لەسـەربێت) جێبـەجێ بکـەن و موسـڵمانبن، بـەڵکو هـەموو شـتێك کۆتـایی پێبێـت و ئاشتی بەرقراربێت.

ئـیتر کـاتی نیـوەڕۆ خـەڵك لـەماڵی پێغەمبـەر(درودی خـودای لەسـەربێت) کۆبوونەوە، باسی جۆر و ڕێگاکانی بازرگانی و داهات و سامان کرا، باسی شەڕو شۆڕو ئاشتی کرا، ئیدی پاش ئەوەی هیچ هەواڵ و باس وخواسێك نـەما، پێغەمبـەر(درودی خودای لەسەربێت) باسی باوەڕهێنان و ئاینی ئیسلامی ورووژانـدو بۆی بـاس کـردن، کاتێ ئەمەیان بیست، هەموویان هەڵچوون و تووڕەبوون، ئیتر نەوەستان و دەرفەتیان پێنەدا تاقسەکانی تەواودەکات بەڵکو بەبۆڵەبۆڵ لە ماڵەکەیان چوونەدەرەوە.

پێغەمبـەر(درودی خـودای لەسـەربێت) چـووەوەلای خەدیجـەخان، نائومێـدی و دڵشکاوی پێوە دیاربوو، بەدەنگێکی پڕلەتاسەوە فەرمووی:

خەدیجە بینیت چۆن ئەمانـە نایانـەوێت موسـڵمانبن، بـەڵکو دەیانـەوێت لەسـەر ڕێگای چەوت بەردەوامبن و بمێننەوە، چونکە بەبۆچـوونی خۆیـان پێیانوایـە ئـەوان لە خەڵکی تر بەرزترو گەورەترن، بۆیە دەبێ خـەڵك لـەوان نـزمتربن و ژێردەسـتەی ئەوانبن، چۆن باوەڕدێنن ئەگەر لە ماڵ و سامانەکانیان بەشی هەژارو کەم دەرامەتو پەککەوتەکانی لێ بدەن.

خەدیجەخان(خودا لێیرازیبێت) بەخەندەیەکی شیرین گوتی:

ئـەی پێغەمبـەری خودا(درودی خـودای لەسـەربێت) نیگـەران و نائومێـد مەبـە، ئەوان ئەگەر باوەڕیان هێناو هاتنەسەر ڕێگای ڕاست، ئەوا بێگومان سوودو چاکەکەی تەنیا بۆخۆیانە، بەپێچەوانەوەش، ئەگەر بەهۆی کەللەڕەقی و گومڕاییـان موسـڵمان نەبوون، ئەوا تاوانبار دەبن، بۆیە دەڵێم چی تێدایە ئەگەر جارێکی تریش داوایـان لێ بکەیتەوە، بەڵکو موسڵمانبن؟!.

پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) بەگیانێکی پڕلەورەوە فەرمووی:

ئەمجارە جگە لە خزم و خوێشەکانم، داوا لە سـەرجەم خـەڵکی مەککە دەکـەم و



فەرمانی خودا بەهەموویان ڕادەگەیەنم، ئیتر بۆ هێنانەدی ئەم مەبەستە ڕۆژێکیان پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێت) لەسەر بەرزایی (صەفا) سەرکەوت و ڕاوەستا، بەدەنگێکی بەرز بانگی کرد، گوتی:

ئەی کۆمەڵانی قورەیش، ئەی کۆمەڵانی قورەیش.

خەڵك کاتێ بینیان و گوێیان لێبوو، خێرا چوون بەچواردەوریدا کۆبوونەوە، تا بزانن چی دەوێت، پرسیاریانکرد چیە، بۆ بانگمان دەکەیت و داواکەت چیە!؟.

فەرمووی:

خودا فەرمانی پێ کردوم، ئاگاداری هۆزو خەڵکی نزیکی خۆم بکەمەوە، باوەڕبهێنن‌و خۆیان لەخەشم‌و تووڕەیی خودای بەرزو پیرۆز بپارێزن، هەروەها فەرمووی تەنیا یەك خودا هەیە، تاك و تەنیا و بێ هاوبەشە، بێ منداڵ و باوك و دایك و بێ کەس‌و کارە.

خەڵکەکە کە ئەمەیان بیست هەموویان دایانە قاقای پێکەنین، عەبدولعزای (ابولهب) ی مامی بەتووڕەییەوە هاواری کردو گوتی:

دەك لە ناو بچیت و بفەوتێیت، تەنیا بۆ ئەوە لێرە کۆتکردووینەتەوە؟، چۆن هەراسانت کردووین و حەسانەوەت لێ تێکداوین.

بۆیە لەبەرزایی ئاسمانەکانەوە لەلایەن خودای بەرزو پڕ تواناوە، وەڵامی مامی درایەوە، ئایاتی قورئانی پیرۆز دابەزیە خوارەوە و هەڕەشەی لە(عبدالعزی) کرد، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێت) ئایەتەکانی بۆ خەڵك خوێندەوەو پڕ بەدەم فەرمووی:

﴿ تَبَّتۡ يَدَآ أَبِي لَهَبٖ وَتَبَّ ١ مَآ أَغۡنَىٰ عَنۡهُ مَالُهُۥ وَمَا كَسَبَ ٢ سَيَصۡلَىٰ نَارٗا ذَاتَ لَهَبٖ ٣ وَٱمۡرَأَتُهُۥ حَمَّالَةَ ٱلۡحَطَبِ ٤ فِي جِيدِهَا حَبۡلٞ مِّن مَّسَدِۭ ٥ ﴾ المسد: ١ — ٥

واتاکەی:





ئەبولەهەب خۆی فەوتاوە، بەڕاستی فەوتاو و لەناوچووە هەردوو دەستی بەبڕین بچێت، سامان و دەستکەوتەکانی و ناوبانگی سوودیان نیە بۆی و لە سزاکانی خودا ڕزگاری ناکەن، دەچێتە ناو ئاگرێکی گڵپەدارو بڵێسەدار، ژنەکەیشی لەگەڵیدا دەچێت، ئەو دارکێش و دار هەڵگرە، کندرێکی ( تەنافێکی ) وەك لیفکەی لە مل دایە.

پاش بیستنی ئەم ئایەتە پیرۆزانە، خەڵکی سەیری یەکتریان کردو پێکەنین، زیاتر بەم نازناوە نوێیەی (عبدالعزی)پێکەنین، چۆن بە(ئەبولەهەب)هاتبوو، وەك چۆن بڵێی ئەم نازنازوە بەپێوان بۆی بڕاوەو بە ووردی بۆی دووراوە، ئاوا بۆی شیاو و گونجاوبوو، (واتە ناوێکبوو پڕ بەپێستەی خۆی بوو)، ئیدی خەڵك لەبەر خۆیان هەمیشە دووبارەیان دەکردەوەو دەیانگوتەوە(ئەبو لەهەب)، دوای ئەوە زۆر بە نازناوی ژنەکەی پێکەنین (دارکێش یان دار هەلگر)، ئیتر ئەم وەڵامە بەپێزەی خودای پڕتواناو باڵادەست، خێرا وەك برووسك ئاسا بەناو سەرجەم خەڵکی مەککەدا بڵاوبووەوە، ئیدی گەورەو بچووك ئەم نازناوەیان لەسەرزاربوو هەمیشە دەیانگوتەوە، تەنانەت هەواڵەکە بە(عبدالعزی) و ژنەکەی (ئوم جەمیل - دایکی جەمیل) گەیشتەوە، کاتێ ئەم نازناوانەی خۆیان بیست، زۆر پەست و تووڕەبوون و ڕقیان هەڵسا، (دایکی جەمیل) سوێندی بە(لات و عزی) خوارد - دوو بتی قورەیشیەکان بوو - گوتی دەبێ ئەم تۆڵەیە لە موحەممەد و خەدیجە بکەمەوە، ماڵی هەردوولا دراوسێی یەکتربوون، ئومجەمیل گوێی لێبوو هەندێ ژن بەگاڵتەوە باسی تەنافی مل و دارهەڵگری ئەویان دەکرد، خێرا چووە لای مێردەکەی، بە تووڕەییەوە گوتی:

پێمناڵێیت دوای ئەمە چی بۆ ئێمە ماوەتەوە؟، پێموایە هیچ نەماوە، یان ئەوەتا من لەو ماڵە نابم، یان دەبێ هەردوو کچەکانی خەدیجە تەڵاق بدرێن.

ئەبولەهەبی مێردی لە ئومجەمیل تووڕەتربوو، بۆیە خێرا بانگی هەر دوو کوڕەکانی خۆی کرد، هاوسەری ( ڕقییە و ئوم کەلسوم ) بوون پێیگوتن:

بیستووتانە موحەممەد دەرهەق بەمن و دایکتان چی گوتووە؟، جا یان من یان هەردوو کچەکانی خەدیجە!، هەردوو کوڕەکان(عوتبە و عوتەیبە) کەمێك بێ دەنگبوون، سەیری یەکتریان کرد، باوکیان بە تووڕەییەوە ڤیژاندی و هەڕەشەی لێ کردن و گوتی؛

ئەگەر تەلاقیان نەدەن ئەوا من باوکی ئێوە نیم، پەیوەندیم دەپچڕێنم لەگەڵتاناو بە دڵشکاویش سەردەنێمەوە، هێشتا ئەبولەهەب قسەکانی تەواو نەکردبوو، ژنەکەی هاواری کرد بەسەر کوڕەکانداو بەدەم جنێودانەوە هەڕەشەو نەفرەتی لێ دەکردن، ئیتر هەردووکیان بەرامبەر بە هەڕەشەو گوڕەشەی باوك و دایکیان نەیانزانی چی بکەن، تەنیا مل کەچی و جێبەجێ کردنی خواست و ویستی ئەوان نەبێت، بۆیە بەناچاری دەستبەرداری هەردوو کچەکانبوون و تەلاقیاندان.

کاتێ ئەم هەواڵە گەیشتە خەدیجەخان (خوداڵێیڕازیبێت)، هەردوو دەستی بەرزکردەوە بۆ ئاسمان، سوپاس و ستایشی خودای مەزنی کرد، کە ئەم دوو کچەی لە کوڕەکانی ئەبولەهەب جیاکردەوە، ئیدی لەچنگ ئومجەمیل و جادوگەری و پلان‌و خراپەکانی ئەو ڕزگاریانبوو.

جگە لە دایکیان تەنانەت پێغەمبەریش ( درودی خودای لەسەربێت ) سوپاسی خودای کردو بەڕزگار بوونی کچەکانی لەدەست ئەبولەهەب و ژنەکەی شادو دڵخۆشبوو، بەلام وێڕای ئەوەش دەیزانی هەڕەشەکانی ئەم دوو کەسە تەنیا ئەوەندە نیە، بەڵکو ئەمە سەرەتایەو هێشتا کۆتایی نەهاتووە، ڕەنگە ئەو دوو شەڕخوازە کاڵفام و سەرسەختە لەمەبەدواوە فۆڵ و باسکی دوژمنایەتی لێ هەربماڵن، بەدزی و بەئاشکر ا دژایەتیان بکەن، خەدیجەخان(خودا لێیڕازیبێت) چاوەڕوانی پلان و داو نانەوەی ئومجەمیل بوو بۆی بنێتەوە و بچنێت، چونکە ئەمجۆرە ژنانە هەمیشە چاوەڕوانی پلان گێڕی و داو نانەوەیان لێدەکرێت.

# دژایەتی و هەڕەشەکردن

باروذۆخ و پەیوەندی نێوان پێغەمبەرو (درودی خودای لەسەربێت) قورەیشەکان ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ئاڵۆزترو توندتردەبوو، بەڵام وێڕای ئەمەش پێغەمبەر(درودی خودای لەسەر بێت)هەمیشە خەریکی بانگەواز کردن و بڵاو کردنەوەی ئاییەنەکەی بوو، هەڕەشەو دژایەتی قورەیشیەکان تۆزقاڵێك کاری نەکردبووە سەر ورەو بیرو باوەڕی، ئیدی قورەیشیەکان لە داخا خەریکبوو دڵیان شەقبەرێت، هەموو کات بیریان لە دۆزینەوەی ڕێگاچارەیەك دەکردەوە، بەتایبەتی ئەبولەهەب و ژنەکەی بە ئاشکرا دوژمنایەتی خۆیان بەرامبەر بە پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) و خەدیجەخان(خودا لێیڕازیبێت) ڕاگەیاند.

پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) هەمیشە هەوڵیدەدا سەرنجی خەڵك سەبارەت بە بتەکان ڕابکێشێت، کە ئەم بتانە نەسوودبەخش و نەزیان دەدەن، لەئەنجامدانی کاری نادورست و ناڕەواو نابەجێ، هەروەها لەکاری چاکە و مرۆڤایەتیشدا هیچ هەڵوێستێکیان نیە، تەنانەت جووڵە ناکەن و هیچ کاریگەریان لەسەر خەڵك نیە، ئەم گاڵتە کردنە بەبتەکان، کاریگەری کردە سەر هەست و سۆزی قورەیشیەکان و بەمکارە پەست و نیگەران بوون، لەئاکامدا قورەیشیەکان کۆبوونەوە تا لەئاست جموجۆڵی موسڵمانەکان هەڵوێست وەربگرن، بەڵکو بتوانن لە سووکایەتی کردن بە بتەکانیان و بڵاوکردنەوەی ئایینەکەیان قەدەغەیان بکەن، چونکە پێیانوابوو ئەم ئاینە بوومتە مایەی نانەوەی ئاژاوەو دووبەرەکی لەنێوان سەرجەم خەڵکی مەککەدا.

لەم کۆبوونەوەیەدا هەندێکیان گوتیان:

ئەگەر زۆر بەتوندی دەست لە موحەممەد نەوەشێنین و زەبرێکی کاریگەری لێنەدەین، ئەوا لە مەودوا دەسەڵاتمان نامێنێت، دوایی بۆ چۆنیەتی دژایەتی کردنی



موسڵمانان، لە نێوان خۆیاندا بەم شێوەیە ڕێککەوتن و کارەکانیان دابەشکرد.

بوێژەکان ـ شاعیرەکان ـ گوتیان:

ئێمە بەهەڵبەستەکانمان موحەممەد سووک و ڕسوادەکەین، بیروڕاو بۆچوونەکانی بەشێتانەو گاڵتەجاڕی باسدەکەین، کاتێ شیعرەکانمان کەوتە بەردەستی خەڵك و بڵاوبۆوە، ئەو کاتە کاریگەری لەدڵی خەڵکدا دەبێت، ئیترکەس بەدوای ئەو ناکەوێتو بەقسەی ئەو ناخەڵەتێت.

چیرۆکبێژەکان گوتیان:

ئێمەش چیرۆك و بەسەرهاتەکانی میللەتانی پێشوو بۆ خەڵك باسدەکەین و دەگێڕینەوە، کەچۆن بووینە و چیان بەسەرهاتووە، بەم کارە دەتوانین هەموو باس و چیرۆکەکانی ناو قورئان لەنگ و ناشیرین و شێواو بکەین، ئیتر لە ئەنجامدا خەڵك جوانی و بێ هاوتایی و پیرۆزی قورئانیان لەبەر چاودەکەوێت.

بازرگانەکان گوتیان:

ئێمەش کڕین و فرۆشتنی کاڵاو کەلوپەل لەگەڵ موحەممەدو شوێنکەوتوانی قەدەغە دەکەین، تاژیانیان بەلاوە تەنگ دەبێت و بژێویان دەست ناکەوێت، ئیتر ئەم کاتە ناچار دەبن ئایینەکە جێدەهێڵن.

ئەبوجەهەل و ئەبولەهەب بەشێکی زۆری ئازار و ئەشکەنجەدانی پێغەمبەریان (درودی خودای لەسەربێت) گرتە ئەستۆی خۆیان، ماڵی ئەبولەهەب دروسێیانبوو، بەڵێنیدا ئیتر لەمەودوا دەبێ ماڵی موحەممەد(درودی خودای لەسەربێت) بکاتە دۆزەخ، تا نەتوانن بەهێمنی و ئارامی تێیدا بژین و گوزەران بکەن، بەتایبەتی خەدیجەخانی هاوسەری، ئەو ژنە وورەی موحەممەد بەرزدەکاتەوە، وێڕای ئەمەش ماڵ و سامانی خۆی تەرخانکردوە بۆ بڵاوکردنەوەی ئایینەکەی، بۆیە دەبێ هەمیشە بەپەشۆکاوی و مەرگەساتی ژیان بباتەسەر، ئیتر دوای ئەم بڕیارانە کۆبوونەوەکەیان کۆتایی هات و پەرتوبڵاوبوون. ئەبولەهەب بە ئومجەمیلی گوت:

دەبێ موحەممەد فێربکەم و بزانێت چۆن زمانی لەناست مندا دەخاتەگەڕ، ئینجا بزانە وەك ئەو ڕۆژەی ( صەفا ) وەحی بۆ دێتە خوارەوە؟!.

ژنەکەی گوتی:

منیش دەبێ نیشانی خەدیجەی بدەم، کەئومجەمیل چی دەکات و چۆن پلان بۆ دوژمنانی دەنێتەوە، دەبێ بزانێت ئەو تەنافە چیە موحەممەد لەملی منی کردوە، لەدەرگای ماڵەکەی خۆیان سەیری ماڵی خەدیجەخانی کرد، ددانەکانی بەیەکەوە قرچاند، لەبەر تووڕەیی و ڕقەوە سیرەی ددانەکانی دەهات گوتی:

خەدیجە یان تۆ لەم خانووە باردەکەیت و دەڕۆیت، یان ئێمە دەڕۆین، نابێ لەمەودوا خۆشی لە ژیانتا ببینیت، ئیتر پاش ئەوە بۆ ئازارو ئەشکەنجەدانیان دەست بەکاربوو، بۆبەیانی ڕۆژی دواتر چەند خۆڵ و خاشاك و شتی فڕێدراو وکۆنە هەبوو، هەمووی لەبەر دەرگای ماڵی خەدیجەخان(خودا لێیڕازیبێت)کۆکردەوە، کاتێ پێغەمبەر( درودی خودای لەسەربێت) لەماڵ هاتەدەر ئەمەی بینی گەڕایەوە ماڵەوە فەرمووی:

خەدیجە ئەوە ژنی ئەبولەهەب دەستی پێکرد، ئەوە سەرەتای بارانی دژایەتی و ئازاردان بەسەرماندا باری.

خەدیجەخان(خودا لێیڕازیبێت) هەڵسا چووەلای دەرگا، سەیری خۆڵ و خاشاکەکەی بەردەم ماڵەکەی کرد، بەزەردەخەنەیەکەوە گوتی:

ئەی پێغەمبەری خودا(درودی خودای لەسەربێت) ئێستا خاوێنی دەکەمەوە، خێرا بانگی کەنیزەو کارکەرەکانی کردو پێیگوتن ئەم خۆڵ و خاشاکە پیسانە لێرە فڕێبدەن و ئێرە خاوێن بکەنەوە، سەیری کرد بینی ژنی ئەبولەهەب لە دەرگای ماڵەکەیان ڕاوەستاوەو سەیری دەکات تا بزانێت چۆن هەڵدەچێت و تووڕە دەبێت، بۆ ئەوەی پەلاماری بدات و سووکایەتی پێبکات، ئیتر شتەکە لەخراپەوە بەرەو خراپتر بچێت، بەڵام خەدیجەخان (خودا لێیڕازیبێت) ئەم کارەو پلانەی نەزۆك کردو

نەیهێشت خواست و ویستی ئومجەمیل بێتەدی‌بەڵکو بەپێچەوانەوە هەرگیز خۆی نیگەران و پەست نەکردو بەسەرخۆی نەهێنا، هەرچەند ئومجەمیل جنێوو قسەی ناشیرینی کرد بەڵام وەڵامی نەدرایەوە، بەڵکو بە پێکەنینێکی پڕ لە وورەوە گوتی:

دەبێ ئاوا ڕقوکینەو تووڕەییتان لەسینەدا پەنگبخواتەوە، نابێ ڕێگا بەناگری دەروونتان بدەم بێتەدەرەوە، بەڵکو دەبێ تەنیا خۆتان پێیەوە بسووتێن، چونکە ئەوەیان بەلای منەوە چاکترو ڕێکترە لەوە لەگەڵ کەسانێکی وەك تۆ کەم و پڕوپووچ دەمەتەقەو قرەوبۆڵە بنێمەوە، دوایی سەیری کەنیزەو کارکەرەکانی خۆی کرد زانی زۆر تورەن، پێیگوتن نابێ دەمتان بکەنەوە، تەنیا یەك ووشە وەڵامی ئەم ژنە کەمە نەدەنەوە، چونکە ئەگەر وەڵامی بدەنەوە کەواتە جیاوازی نیە لە نێوان ژنانی موسڵمان و ژنانی گاور، ئێمە ئەگەر بەرهەڵستی خراپە بەخراپە بکەین، گیانی لێبوردنمان نەبێت و لە سوکایەتی پێکردن خۆشنەبین، کەواتە ئەو کاتە ئەرکی ئاینیمان جێبەجێ نەکردوەو لەسەر ڕێبازی پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) نەڕۆیشتووین.

ئیتر هەموو ڕۆژ جۆرەها سووکایەتی و گاڵتەیان پێدەکرا، کەچی بەم شێوەیە ئارامی دەگرت و خۆڕاگربوو، سەرەڕای ئەمەش ئەگەر پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) لەلای هاوسەرە ڕێزدارەکەی باسی قسەی ناشیرین و سووکایەتی پێکردنی ئەبوجەهل‌و ئەبولەهەبی بکردبایە، ئەوا زۆر بە هێمنی دەیگوت:

ئەو قسانە هیچ بایەخێکیان نیە لەگەڵ بادەڕواو نامێنێت.

قورەیشیەکان کاتێ بینیان موحەممەد(درودی خودای لەسەربێت) ڕۆژ لەدوای ڕۆژ بەرزترو بەهێزتر دەبێت، دۆست و لایەنگری لە زیادبوون وئاینەکەی لە پەرەسەندندایە، گوتیان دیارە موحەممەدو یاوەرەکانی بە ئازارو ئەشکەنجەدانیان لەلایەن ئەبوجەهل و ئەبولەهەب و ژنەکەیەوە ناوەستن، بۆیە جارێکی تر کۆبوونەوە بەڵکو بڕیارێکی تر سەبارەت بە لاوازکردن و لەناو بردنیان بدەن، ئیدی



لە کۆبوونەوەکەدا هەندێکیان گوتیان:

ئەو کاتە ئێمە دەتوانین زاڵ بین بەسەر موحەممەددا ئەگەر بێتو پشتیوانی و یارمەتی نەمێنێت، گوتیان کێ یارمەتی دەریەتی، ئایا مەبەستتان(ئەبوتالبی)مامیەتی؟، ئەگەر ئەو واز لەبرازاکەی نەهێنێت تا بزانین!!.

یەکێك گوتی:

نەخێر مەبەستمان خەدیجەیە!، ئەو ژنەی بووەتە پشت و پەنای موحەممەد، بەدڵو بەسامان و بەدەسەڵات هەمیشە خەریکی بڵاوکردنەوەی ئایینە نوێیەکەیە، تەنانەت ئەوەندە بەپەرۆشە بۆ ئایینەکە، وادەزانێت بازرگانیەو گەشەی پێ دەدات، یان وا دەزانێت کاڵاو کەلوپەلە لەنێودڵی خەڵك شیرینی دەکات و بانگەوازی بۆ دەکات، سەبارەت بەڕاستی و دروستی ئەمەش سەیرکەن بزانن چەندین کەس لە خزم و کەس و کاری خەدیجە موسڵمان بووینە، هەموویان بەدڵ و بەگیان بەرگری لە موحەممەدی زاوایان دەکەن ولایەنگری ئەون، زۆر بەلامەوە سەیرە نازانم ئەوە چیە؟، گوتمان دیارەو ئاشکرایە موحەممەد جادوکەرەو سیحربازە، بەڵام چی بەخەدیجە بڵێین؟، چونکە من پێموایە ئەو ژنە لەجادو و سیحرەکانی موحەممەد دا بەشدارە، بۆیە دەڵێم ئەگەر سنوورێك بۆ خەدیجە دانەنێین و نەیوەستێنین و سیحرەکانی پووچەڵ نەکەینەوە، ئەوا هەرگیز ناتوانین دەسەڵاتمان بەسەر موحەممەددا بسەپێنین!!.

گوتیان:

کەواتە چارە چیە؟، ئێستاچی بکەین؟.

بەگڕوتینەوە گوتی:

ئەگەر توانیمان پەیوەندی نێوان (ئەبوتالب) و موحەممەد تێکبدەین، تا چیتر بەرگری و پشتیوانی لە برازاکەی نەکات، ئەوا بێگومان دوای ئەوە دەتوانین هەڕەشە لەخەدیجە بکەین تا لە موحەممەد جیابێتەوە، ئەو کاتە موحەممەد دوو کۆڵەگەی

بەهێزو تۆکمەی هێزو توانای خۆی لەدەست دەدات، لەئاکامدا بێدەنگ دەبێت و دەکەوێت.

سەرجەم گەورەپیاوانی مەککەو ئامادەبووانی کۆبوونەوەکە، ئەم ڕاوو بۆچوونەیان لاپەسندو گرنگبوو، بۆیە خێرا کەوتنەکار کردن بۆجێبەجێکردنی.

سەرەتا چوونە لای ئەبوتالیب، داوایان لێکرد لەمەودوا دەستبەرداری موحەممەدی برازای بێت، چیتر بەرگری لێنەکات و یارمەتی نەدات.

بەڵام ئەبوتالیب لە وەڵامدا پێیگوتن:

هەرگیز برازاکەم بەقسەی ئێوە جێناهێڵم و وازی لێناهێنم!.

کەواتە لەبەشی یەکەمی پلانەکەیان سەرنەکەوتن، بۆیە بێگومان لەبەشی دووەمیش سەرکەوتنیان بەدەست نەهێنا، کەجیاکردنەوەی خەدیجەخان بوو (خودا لێیڕازیبێت) لە پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت).

دوای نائومێدبوونیان لە جێبەجێکردنی پلانەکەیان، ئیتر بڕیاریاندا لەمەودوا بەتوندترین ودڕندەترین شێوە یاوەرانی شوێنکەوتووی موحەممەد(درودی خودای لەسەربێت) ئازارو ئەشکەنجەبدەن و بیانفەوتێنن، تەنانەت ببنە پەند بۆ هەموو ئەو کەسانەی نیازیان وایەو دەیانەوێت ببنە موسڵمان، ئیتر ڕۆژ لەدوای ڕۆژ ژمارەی شوێنکەوتووانی کەمدەبێتەوە، دەرەنجام ڕۆژێك دێت موحەممەد بێ لایەنگرو هاوبیر دەمێنێتەوە، ئیتر کەس بەدوای ناکەوێت و ئامانجەکەی نەزۆك و پووچەڵ دەبێت.

دوای ئەوە پەرتوبڵاوبوون بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە.

ئیتر دوای دەرکردنی ئەم بڕیارە نگریسە، شاری مەککە بووە گۆڕەپانی دەرهێنانی فیلمێکی تراژیدی، لەهەموو لایەکی ئەم شارە ناوەناوە دەنگی هاواروناڵەو فیغان بەرز دەبووەوە، موسڵمانان بەتایبەتی بێ دەسەڵاتان و کۆیلەکان، لەبەر خۆرەتاو بەڕووتی درێژدەکران بەردێکی گەورە دەخرایە سەر سنگیان تا نەتوانن جوولەبکەن و ڕانەکەن، بێگومان تیشکی خۆری (مەککە) کەس توانای نیە بۆ

ماوەیەکی کەم لە ژێریا بوەستێ، پێستی دەسووتێت، جا چجای ئەوەی بەڕووتی بەردێکی زلیش لەسەر جەستەیان بێت، ئاخۆ دەبێ چ ئازارو ئەشکەنجەیەك درابن؟!، هەندێکی تر لە موسڵمانان لەژوورێکی تاریك بێ خواردن و خواردنەوە دادەندران، تا برسێتی هەناوی دەخواردنەوە، هەندێکیان لەپێش چاوی خەڵك، بە تیغێکی ئاسن سکیان هەڵدەدڕین، تا ببنە پەند و خەڵکەکە ئەم ئازارو مەرگەساتیە ببینن و هەرگیز موسڵمان نەبن.

سەرەڕای ئەم ئازارو مەینەتیە، لەبەر دەرگای ماڵەکان دەستاڕی جنێودان و قسەی ناشیرین و پڕوپوچ و گاڵتەجاڕی دەگەڕا، چەندین ژنی کارامەو لێزان بۆ ئەم مەبەستە ئامادەکرابوون.

ئیتر کار گەیشتە ئەم ڕادەیە لەترسی کافرەکان خەڵك خۆی لە موسڵمانان لادەدات، تەنانەت خزمان و دۆستی نزیك و خۆشەویستانیش بۆیان نەبوو خۆیان لە موسڵمانان نزیك بکەنەوە، چونکە ئەگەر بیاندیبایە یەکێك هاموشۆی موسڵمانان دەکات، ئەوا ئەویش دەکەوتە ناو تۆڕی ئازارو دژایەتیەوە، قورەیشیەکان دڵڕەقانە وەك موسڵمانێك ڕەفتاریان لەگەڵ دەکرد.

خەدیجەخان(خوداڵێڕازیبێت) سەرەڕای ئەم هەموو دژایەتی و دوژمنایەتی و بەربەرەکانێیە، یەکجار خۆڕاگرو وورە بەرزبوو، ڕۆژانە وەك دایکێکی بەسۆزو وەك پەرستارێك برینی زامدارانی سارێژ دەکردو وەی بەرز دەکردنەوە، مزگێنی سەرکەوتن و ڕزگاربوونی پێدەدان، گەنجینەکانی بۆ موسڵمانان هەمیشە ئاڵاو کراوەبوو، بەپێی خواستی خۆیان چەندی پێویستیان بوایە پارەو پوولیان وەردەگرت، سامانی خۆی لەڕێگای خوادا دەبەخشیەوە، قەرزی موسڵمانانی دەدایەوە، کۆیلەی ستەم دیدەی دەکڕی و ئازادی دەکردن، لە بواری بازرگانیدا دەرفەتی قورەیشیەکانی نەدەدا موسڵمانان تووشی تەنگ و چەڵەمە بکەن، هەرگیز بایەخی بەدەست درێژی کردنە سەرماڵەکەی و بەردبارانکردنی دەرگای خانووەکەی نەدەدا، تەنانەت هەمیشە کەڕو لاڵ و بێدەنگبوو لەئاست هەڕەشەو هاوارو قیژەو جنێوەکانی

ژن و منداڵانی بەچوار دەوری ماڵەکەیان کۆدەبوونەوە، هەروەها ئەم خانمە ڕەوشت بەرزە هەمیشە چاوەڕوانی پێغەمبەر بوو(درودی خودای لەسەربێت) تا دەگەڕایەوە ماڵەوە، ئیتر بەپێکەنینەوە پێشوازی دەکرد، خێرا جلە پیسەکانی بۆ دەگۆڕیو خاوێنی دەکردەوە لەم شتە پیس و پۆخڵانەی گاورەکان بەسەر سەری پیرۆزیان داکردبوو، وێڕای ئەمەش دڵنەوایی دەدایەوە سەبارەت بەم کارە قێزەوون و پڕووپووچانەی قوڕەیشیەکان.

لەئەنجامی ئەم ئەشکەنجەو ئازاردانەی موسڵمانان پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) زۆر پەرێشان ونیگەران بوو، بۆیە بیری لە ڕێگاچارەیەك دەکردەوە تا لەم مەرگەساتە ڕزگاریان بکات، لەئاکامدا فەرمانی بەموسڵمانەکان کرد کۆچبکەن و ڕوو لە وڵاتی (حەبەشە)بکەن، خەدیجەخان(خودا لێیڕازبێت) شادی دڵخۆشی خۆی بۆ ئەم ڕایەو فەرمانە دەربڕی و زۆر بەلایەوە پەسند بوو، زوو کەوتە دابینکردن و جێبەجێکردنی پێداویستیەکانی کۆچەکە، یارمەتی خۆ ئامادەکردنی کۆچبەرانی دەدا، کاتێ بیستی ڕوقییەی کچی و هاوسەرەکەی عوسمانی کوڕی عەففان (خودا لێیانڕازیبێت) داوایان کردوە ئەوانیش کۆچ بکەن، هێندەی تر دڵخۆش و شاد بوو، گوتی:

بەرەکەتی خودا بەسەر(عوسمان و ڕوقییە)دا برژێت، ئێمە لێرە دەمێنینەوە تەنانەت خودا ڕێگامان پێ دەدات بۆ کۆچکردن.

ئیتر بۆ ڕزگاربوون لەچنگ ئازارو مەینەتیەکان و بۆ پاراستنی ئایین و بیرو باوەڕیان، موسڵمانەکان لەژێر پەردەی تاریکی شەودا کۆچیانکرد، خەدیجەخان(خودا لێیڕازیبێت) بەو پەڕی وورە بەرزییەوە، بەڕوویێکی گەش و پڕخەندەوە بەڕێی دەکردن و ماڵئاوای لێیان دەکرد، لەکۆتاییدا دوو ماچی لەکچەکەی کرد، لەخودا دەپاڕایەوە ئەم کۆچە بەختەوەرو بێ ئازارو سەرکەوتووبکات، دوایی ڕاوەستا سەیری کردن تا لەناو تاریکی شەودا خێرا وونبوون و تارماییان نەما، ئینجا گەڕایەوە ماڵەوە چاوەڕێی قوڕەیشیەکانی دەکرد، ئاخۆ کاتێ بەم کۆچە بزانن دەبێ چی دەکەن؟.

# ئابلوقەدان

موسڵمانانی کۆچبەر گەیشتنە لێواری دەریای سوور، سەیری دەریایان دەکرد ئاخۆ هیچ کەشتییێك یان شتێك دیارنییە تا پێی بپەڕنەوە، هەروەها لەترسی قوڕەیشیەکان ناوەناوە سەیری دواوەیان دەکرد، نەوەك بەم کۆچکردنەیان زانیبێت و بەدوایاندابێن، لەپڕ کەشتییێکی گەورەیان بینی لە نزیك ئەوانەوە دەڕۆیشت، ئیتر هەموویان چوونە ناو کەشتیەکەو ڕۆیشتن.

کاتێ قوڕەیشیەکان بەم کۆچکردنەیان زانی زوو هەستیان بەمەترسی ئەم کۆچەکرد، بۆیە خێرا بەدوایانداچوون تابیانگەڕێننەوە و تەمبێیان بکەن، بەڵام کاتێ گەیشتنە لێواری دەریاکە هیچ شوێنەوارێکیان نەمابوو، بۆیە زۆر تووڕەبوون، ئیدی بەنیگەرانی و بەدڵێکی سارد گەڕانەوە، خەریکبوو لەداخا شەقبەرن و هەناسەکانیان گڕبگرێت، بۆیە زۆر بەغەمناکی دەیانگوت:

نابێ ئاوا بەئاسانی لە چنگمان دەربچن، پێویستە کارێك ئەنجام بدەین و هەوڵێك بدەین، ئیتر نابێ دەستەوەستان دابنیشین، چاوەڕێی چی دەکەین؟.

پاش ئەوە کۆبوونەوە، هەندێکیان گوتیان:

موحەممەد دەکوژین.

هەندێکی تر گوتیان:

خەدیجە و ئەبوتالیب دەکوژین!.

هەندێکی تر گوتیان:

بەڵکو ئەوان و سەرجەم بنەماڵەی هاشم و موتەلیب بکوژین باشە!.

پاشان لەسەر ئابلوقەدان و قەدەغەکردنی خۆراك ڕێککەوتن، بۆ ئەوەی دەرمنجام یان لەبرسانا دەمرن، یان واز لە موحەممەد(درودی خودای لەسەربێت) دەهێنن، بۆ ئەم مەبەستەش بەڵگەنامەیەکیان نووسی و تێیدا پەیمان و بەڵێنیان


بەیەکتریدا کە:

هیچ شتێکیان لێ نەکڕن و پێ نەفرۆشن، تێکەڵاوییان لەگەڵ نەکەن نە ژنیان لێبێنن و نەژنیان پێ بدەن، یەك دەست و یەك هەڵوێستبن لە ئاست هەموو کەسێك سۆز و خۆشەویستی بۆ ئەوان هەبێت.

ئیتر ئەم نووسراوەیان لە(کەعبە) هەڵواسی، بنەماڵەی(هاشم وموتەلیب) کاتێ ئەمەیان زانی لەئاست ئەم پەیمانە شوومە کۆبوونەوەو ڕاوێژیان بەیەکتری کردوو هەڵوێستیان وەرگرت، بڕیاریاندا پشتی یەکتری بگرن، لەدژی ئەم پەیمانە نگریسە پڕلەتاوانە بوەستن، پشتیوانی لە موحەممەد(درودی خودای لەسەربێت) بکەن، هەرگیز بەتەنیا جێینەهێڵن و ملکەچ نەکەین بۆ ئەم بڕیارە شوومە، تەنانەت ئەگەر هەموویان لەبرسانا لەناو بچن و بمرن، هەروەها بڕیاریانداو وایان لا پەسندبوو هەموویان بچن لەدۆڵێك لەدۆڵە چیاکانی مەککە کۆببنەوە، لەوێ گوزەران بکەن، تا دووربن لەپلان و تەلەکەبازی و هەڕەشەو گێچەڵی مەککەییەکان، دوای ئەوەی هەموویان کۆکبوون لەسەر ئەم ڕایە بەخێرایی چوونە دۆڵێك، خەدیجەخان(خودا لێیڕازیبێت) ئەوەندەی توانی و بۆی ڕەخسا سامان و خۆراکی لەگەڵ خۆی برد.

ئیتر قوڕەیشیەکان لەناو بازاڕدا بڵاوبوونەوە، ئەگەر کاروانێکی بازرگانی بهاتبایە بۆ مەککە، بەچواردەوریدا دەوەستان و چاودێریان دەکرد، کاتێ یەکێکی موسڵمانان یان یەکێکی بنە ماڵەی هاشمی و موتەلیبیەکان بۆلای کاروانەکە بهاتبایە بۆکڕینی کەلوپەل، ئەوا یەکێك دەچوو نرخی شتەکەی لەسەر موسڵمانەکە گران دەکرد، ئەگەر موسڵمانەکە نرخەکەی زیاد بکردبایە، ئەوا ئەو دوو ئەوەندەی تری زیاد دەکرد، تا لەئەنجامدا موسڵمانەکە بێزار دەبوو شتەکەی بۆ نەدەکڕا، ئیتر جێیدەهێشت و دەڕۆیشت، ئەوانیش بەگاڵتەوە پێی پێدەکەنین.

بێگومان ئەبولەهەب و ژنەکەی لەگەڵ بنەماڵەی(هاشم و موتەلیب) نەچوون، چونکە نەك خزمایەتی موحەممەدیان نەدەکرد، بگرە ئەوەندە ڕقیان لەم

پێغەمبەرە پیرۆزە بوو (درودی خودای لەسەربێت)، هیچ کەسێك لەمەککە هێندەی ئەم دوو کەسە دوژمنایەتیان نەکردوە، دژوارترین و سەرسەخترین دوژمنیبوون، لەهەموو کەس خراپتر و بەزیانتربوون بۆی، ئەبولەهەب کاتێ بەبازاردا دەڕۆیشت بەبازرگانەکانی دەگوت نەکەن کەلوپەل و شت بفرۆشنە شوێن کەوتوانی موحەممەد، هەروەها دڵنیای دەکردنەوە ئەگەر لەبەر ئەم هۆیە زیانیان لێ کەوت ئەوا ئەو زیانەکەیان بۆقەرەبوو دەکاتەوە.

موسڵمانەکان و هەردوو بنەماڵەی(هاشم و موتەلیب) خۆراکیان لێ قەدەغەکرا، چەندین دۆست و لایەنگرو خۆشەویستانیان هەوڵیاندا تا بتوانن بڕێك خۆراکیان پێبگەیەنن، بەڵام نەیانتوانی و هەوڵەکانیان بێ سوودبوو، دەرەنجام ئەوەی هەیانبوو هەمووی بەسەرچوو هیچیان نەما، ئیتر برسیەتی باڵی بەسەر دۆڵەکە کێشا، زۆر بێزاربوون، مرۆڤی بەتەمەن خۆڕاگرتربوون، بەڵام منداڵەکان لەچنگ هێرشی برسیەتی بەدەم هەنسکی گریانەوە ڤیژەو ناڵەو هاواریان بۆ لەتێك نان دەچووە بەری ئاسمان، تەنانەت لەو دیوی دۆڵەکە دەنگی گریانیان دەبیسترا، بەڵام وێڕای ئەم هەموو دەردەسەری و مەرگەساتیە، موسڵمانەکان و هەردوو بنەماڵەکە، تا دەهات باوەڕیان بەهێزتر دەبوو، گیانی خۆڕاگری و خۆبەخت کردنیان تێدا تۆکمەترو ورەیان بەرزتردەبوو.

خەدیجەخان(خودا لێیڕازیبێت) لەم ژیانە سەختەدا خاوەنی کەسایەتییەکی زۆر بەهێزو توانابوو، یەکجار خۆڕاگربوو، بگرە نموونەیەکبوو بۆ ئارامگرتن و ئازایەتیو ورەبەرزی، هەمیشە سامان و پارەو پووڵی دەبەخشیەوە، دڵنەوایی خەڵکی دەکرد، گەرچی ڕۆژ لەدوای ڕۆژ گوزەران و ژیانیان لەم دۆڵە بەرەو خراپتر دەچوو، کەچی ئەم خانمە ڕێزدارە وورەو خۆڕاگری تێدا بەرزتردەبووەتەنانەت خەندەی سەرلێوەکانی زیاتردەبوو، هەرچەندە لەم دۆڵە چیایە ئابلووقەدرابوو، هیچ هەوڵ و دەسەڵاتێکی نەبوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا قورەیشیەکان لە بیروڕاو پلانەکانی خەدیجەخان(خودا لێیڕازیبێت) دەترسان، بۆیە زۆر بەوردی و بەتوندی چاودێری



دۆڵەکەیان دەکرد، سەرەڕای ئەوە ئەم خانەوادانەی پێشتر هاموشۆی خەدیجەیان دەکرد و پەیوەندیان لەگەڵ هەبوو لەناو شاردا چاودێریان خرابووەسەر، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا قورەیشیەکان هەستیان دەکرد ناوەناوە بەپلانی خەدیجەخان(خودا لێیڕازیبێت) بڕەخۆراکێك دەگاتە موسڵمانەکان، بۆیە ئەبوجەهل کە سەرپەرشتی ئەم ئابلووقەیەو چاودێری کردنی پێسپێردرابوو، هەوڵی زیاتری خستەگەڕ بۆ بنبڕکردنی ئەم یارمەتیانەی، کەبەنهێنی دەگاتە موسڵمانەکان، تەنانەت شەوێکیان بینی مێرد منداڵێك هەندێ گەنمی پێیە، لەپەنای تاریکی شەو خۆی حەشارداوەو دزەدەکات بەرەولای دۆڵە جیاکە دەچێت، پیاوێکیش بەخێرایی بەدوای منداڵەکە دەڕوات، سەیری پیاوەکەی کرد ناسیەوە، زانی بت پەرستەو موسڵمان نیە، ئەبو جەهل خێرا منداڵەکەی گرت و بەتووڕەیی بەپیاوەکەی گوت:

ئەی ئێمە پەیمانمان نەداوە پەیوەندی لەگەڵ ئەوانە بپچڕێنین؟، یان دەبێ بگەڕێنەوە سەر ئایینی ئێمە، یان لەبرسانا دەمرن؟.

پیاوەکە بەگاڵتەوە گوتی:

ئەوە قەرزاری خەدیجەم قەرزەکەم بۆی دەبردەوە، ئەی خەڵك نابێ وەفاداربێت و قەرزی خەڵك بداتەوە؟.

ئەبوو جەهل بەدەنگێکی بەرز گوتی:

دەزانم هەموو پلانێك لە خەدیجەوەیەبۆیە دەبێ ئەو ژنە خۆی و بنەماڵەکەی لەناو ببرێن، دوای ئەوە بەخێرایی چووە لای سەرۆکەکانی قورەیش بۆ وەرگرتنی بیروڕایان سەبارەت بە خەدیجەخان و دۆزینەوەی ڕێگاچارەیەك.

ئیتر ئەم ئابلووقەیە شوومە سێ ساڵی ڕەبەقی خایاند، لەم ماوەیەدا خەدیجەخان(خودا لێیڕازیبێت)سەرجەم ماڵ و سامانی خۆی لەپێناو ئایینی ئیسلامدا خەرجکرد، بەم کارەش نیگەران نەبوو، بەڵکو زۆر شادو بەختەوەربوو، لە ماوەی ئەم سێ ساڵەدا هێزو وورەی لەدڵی پیاواندا پتەوتردەکرد، خۆبەخت کردن وئارام گرتن و خۆڕاگریشی لەدڵی ژنان زیندوو دەکردەوە.

دوای سێ ساڵ لە ژیانی مەرگەساتی و قاتوقڕی، ویستی خودا وابوو ئەم ئابلوقەیە هەڵبگیرێت، ئیتر موسڵمانەکان بەهەنگاوی لەسەر خۆو بەڕەنگی زەردو بزرکاوەوە بەرەوماڵ گەڕانەوە، خەدیجەخانیش(خودا لێیڕازیبێت) وەك هەر موسڵمانێك گەڕایەوە ماڵەوەئەم دەردەسەری و تەنگژەو مەرگەساتیە وورەو هێزو توانای پتری پێبەخشیبوو بیری دەکردەوە ئاخۆ ئەمجارە قورەیشیەکان پاش شکست هێنان و پووچەڵ کردنی ئابلووقەکە دەبێ چی بکەن؟، چ نیازو مەبەستێکیان لەدڵدا گەڵاڵە دەبێت؟، چ داوێك و پلانێکی نوێ دەنێنەوە؟، زۆر بیرو بۆچوونی جیاجیای بۆدەهات دەربارەی جۆرەها ئازارو ئەشکەنجەی تر، کەماوە قورەیشیەکان لەگەڵیان ئەنجامی بدەن، لە میانەی دەریای بیرکردنەوەیدا لەپڕ ڕاچڵەکی و زۆر ترسا، چونکە بیری کەوتەوە قورەیشیەکان هیچ ئازارو ئەشکەنجەیەکی ئەوتۆیان نەماوە کاریگەری زۆری هەبێت بەسەر موسڵماناندا، تەنیا دوا تیری نێو هەگبەیان نەبێت، ئەویش کوشتنی پێغەمبەرە(درودی خودای لەسەربێت)، بۆیە ڕاچڵەکی و گوتی:

نا .. نای کوژن!..ناتوانن بیکوژن!.

# تیری کۆتایی

بێگومان خەدیجەخان(خودا لێیڕازیبێت) گەڕایەوە ماڵەوە، ئەو ماڵەی سێ ساڵ تاریك و چۆڵ بوو، ئێستا ئاوەدان بووەتەوەو ڕووناکی بۆگەڕاوەتەوە، خۆشەویستان و دۆستان کاتێ هەواڵی گەڕانەوەیان زانی خێرا هاتنەلای، شادی و کامەرانی خۆیان بەم بۆنەیەوە دەربڕی، هەروەها ئەو ژنانەی سێ ساڵ بوو بەخششی ئەو خانمەیان دەست نەکەوتبوو، بە چاوێکی پڕ لە ئەسرینی شادی و خۆشی پێشوازیان لەم خانمە مەزنە کرد، دڵیان پڕ لەڕق و قینەبوو لەئاست کافرانی دڵڕەقی مەککە، چونکە ماوەیەکی دوورو درێژبوو لەم ماڵە دەرگا فراوانە دایانبڕاندبوون.

ئیتر ماڵەکەیان لە جاران بەگرو تینترەوە موسڵمانان ڕوویان تێدەکرد، هەموو



سات و کاتێك دەنگی قورئان خوێندنی تێدا بەرزدەبووەو دەنگیدەدایەوە، چونکە موسڵمانان چیتر بەنهێنی خواپەرستیان نەدەکرد، بەتایبەتی دوای ئەوەی چەند کەسێکی زەبر بەدەست و دەسەڵاتداری وەك مامی پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت)حەمزەی کوڕی عبدالمطلب و عومەری کوڕی خەتاب(خودا لێیانڕازیبێت)موسڵمانبوون، بە موسڵمانبوونی ئەم دوو کەڵە پیاوە ئیسلام زۆر بەهێزبوو، تەنانەت دەتوانین بڵێین پێینایە قۆناغێکی تر.

بێگومان کافرەکان بەکۆتایی هاتنی ئابلووقەکە زۆر پەست و غەمگین و تووڕەبوون، چونکە هیواو ئامانجەکەیان نەپێکاو دەرئەنجام هیچیان بۆ نەهاتەدی، چونکە ئەوان پێیانوابوو موحەممەد و(درودی خوای لەسەربێت) شوێن کەوتوانی بەم کارە لەناودەچن و لەبرسێتی و قاتوقڕیدا ڕزگاریان نابێت و دەمرن، ئیتر لەچنگ ئەم ئابینە ڕزگاریان دەبێت، بەڵام بەهێزو توانای لەبن نەهاتووی خودا، ئابلووقەکە شکستی هێناو موسڵمانان بێ زیان ڕزگاریان بوو، دەنگوباسی ڕزگاربوونی موسڵمانان بەسەرجەم نیمچە دوورگەی عەرەبیدا بڵاوبووەوە، بەجۆرێك بووبوە قسەی سەرزاری سەرجەم خەڵکانی دوورونزیك، هەندێ کەس سەرسامبوون لەئاست چۆنیەتی ڕزگاربوونی موسڵمانان لەم ئابلوقەیەدا، بۆیە نەیاندەزانی لەم بارەیەوە چی بڵێن؟!، بەڵام هەندێکیان بەسەرسامیەوە دەیانگوت دیارە موحەممەد پەیوەندی بەخوداوە هەیەو پەروەردگاری خۆی پشتیوانی کردووە، دەرئەنجام دەهاتن دەستیان دەخستە ناودەستی پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت)، دانیان بەموسڵمانبوونیان دەناو دەهاتنە ڕیزی موسڵمانان، ڕۆژ لەدوای ڕۆژ ژمارەی موسڵمانان لەزیادبوون و پەرەسەندندا بوو.

خەدیجەخان(خودا لێیڕازیبێت) دوای گەڕانەوەی دووبارە وەکو پێشوو کارمەندەکانی هاتنەوەلای و دەستیانکردەوە بەکاری بازرگانی، وێڕای ئەمەش زۆر

شاد و دڵخۆش بوو بەگەشانەوەو درەوشانەوەی چرای ئیسلام، هیچ بەربەستێك و ناستەنگێکی دوژمنان نەیانتوانی ڕێگای پێبگرن، بەڵکو تیشکی ڕووناکی و پرشنگی هەمیشە لەگەشەکردندا بوو.

کافرەکان کاتێ چاویان بەماڵی خەدیجەخان(خودا لێیڕازیبێت)دەکەوت، بەمجۆرە جمەیدێت لە موسڵمانان، زۆر خەفەتبارو پەستدەبوون، تەنانەت ئەگەر بۆیان بلوابایە و بڕەخسابایە پەلاماریاندەدا خانووەکەیان بەسەردا دەڕووخاند، بەتایبەتی ئەبولەهەب و ژنەکەی، کاتێ دەیانبینی پۆل پۆل موسڵمانان دەچنە ژووری و دێنەدەرەوە، بەجارێك ڕقوقینیان هەڵدەستاو لەداخا خەریکبوو شەقبەرن، کاتێ چاویان بە موحەممەد و خەردیجەخان دەکەوت واهەستیان دەکرد ژیلەمۆو پشکۆی ئاگریان لەناو دڵ و سینەدا کراوەتەوە، بۆیە ئۆقرەو ئارامیان نەدەما.

تەنانەت شەوێکیان خەو پێڵوی چاوەکانی گرتبوون، خەریکبوون بچنە ناو جێگاو بخەون، بەڵام لەماڵی خەدیجەخانی دراوسێیان موسڵمانان بەدەنگی بەرز قورئانیان دەخوێند، دەنگی قورئان خوێنەکان وەك تیرێکی ژەهراوی ئاسا دڵی ئەوانی دەپێکا، ئیتر خەو لەچاویان تۆرا و نەیانزانی چیبکەن، لەئاکامدا هەڵسان چوونە سەربانی خانووەکەیان، بەچاوێکی پڕ لەگڕو بڵێسەی ئاگرین و ڕق و قینەوە سەیری ماڵی خەدیجەخانیان(خودا لێیڕازیبێت)دەکرد،گوێیاندایە خوێندن و ئاخاوتنەکانی موسڵمانان، لە دڵدا حەزیان دەکرد بچن ئاگر لە خانووەکە بەربدەن و هەموویان لە ژووری فڕ بکەن، چۆن ژیانیان لا تاڵ کردوون، لەناو ماڵەکەیان ئارامی و سرەوتن و ئۆقرەیان تێکداوون، هەروەها شەوێکیان ژمارەیکی زۆری موسڵمانان لە ماڵی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێت)شەونخوونیان کردو تابەیانی نەخەوتن، ئیتر ئەبولەهەب و ژنەکەیشی وێڕای ئەوان خەو لەچاوەکانیان زڕاو نەخەوتن، بەیانی زوو لەگەڵ گزنگی خۆر ئەبولەهەب خێرا چوو بۆ (خانەی کۆڕوکۆبوونەوە واتە دارالندوە)جێگای کۆڕو کۆبونەوەی قوڕەیشیەکان بوو، بانگی کردن لەوڕا

هەموو گیانی دەلەرزی، چاوەکانی شەونوخونیان پێوەدیاربوو کە نەخەوتووە، گوتی:

تاکەی ئاوا دەستەوئەژنۆ دابنیشین، چۆن دەتوانین ئارامگرو بێدەنگبین لەئاست ئەم کێشەیەی تێیکەوتووین، ئەوا جام پڕبوو لەسەری ڕژایەوە، کەوانیش چیتر ئارام و ئۆقرەی بۆ ڕاگرتنی تیر نەماوە، هەندێك ویستیان تۆزێ لە تووڕەییەکەی هێوری بکەنەوە، کەچی ئەو پتر هاواری کردو گوتی:

ئەگەر ئێوەش دراوسێی ماڵی خەدیجە دەبوون، ئەوا ئەو کاتە دەتانزانی ئێمە لە چ ژیانێك داین، ئەگەر تۆزێك چاوتان لێ بوایە دەتانزانی ئاینی موحەممەد گەیشتۆتە کوێ، ئایا ئێمە دەبێ ئارام بگرین تا کارەکە لەدەست دەردەچێت؟ پێتان بڵێم کارلەوە نەماوە ئیدی بەجنێو و قسەی پڕوپووچ، یان بەئابلووقەو ڕاوەدونان و ئەشکەنجەدان، چارەی بکەین، بەڵکو تەنیا دوا تیری کۆتایی چارەسەری دەکات.

یەکێك لەسەر خۆ پێیگوت:

بەڵام موحەممەد کوڕی براتە عەبدولعزا!!.

لەم قسەیە زۆر تووڕەبوو، بەدەنگێکی بەرز هاواری کردو گوتی:

ئەم پەیوەندیەمان لەباربردوە، ئەم نزیکیە و خزمایەتیەمان نەماوەو پچڕاوە، ئێستا لەنێوان موحەممەد و مندا، هیچ پەیوەندیێك و ڕەچەڵەکێکمان لە ئارادا نیە.

کاتێ چاوی بە ئەبوتالیبی برای کەوت، کە هەمیشە پشتیوانێکی بەهێزی موحەممەدە (درودی خودای لەسەربێت)، گوتی:

هەروەها سەبارەت بە موحەممەد لەگەڵ ئەبوتالیبیش پەیوەندیمان پچڕاوەو نەماوە، ئێستاش هەرچی دەتانەوێت بیکەن، گرنگ ئەوەیە ئەم ئاگرە بکوژێنەوە کەخەریکە پەرەدەستێنێت، ئەی نابینن ئەم ئاگرە چۆن لە مەککە دەرچووە بەرەو شوێنی تر ڕۆیشتووە، نابینن موحەممەد هەمیشە خەریکە خۆی بەهۆزەکانی تر دەناسێنێت و ئایینەکەی بڵاودەکاتەوە، ئایا بینیوتانە ئەبوتالیب هیچ جوولەیەك و

برازاڤێـك بكـات بـۆ قـەدەكردنی برازاكـەی، بـەڵكو بەپێـچەوانەوە پارێزگـاری لـە موحەممەدی برازای دەكات و دەیپارێزێت، هەروەها لەگەڵ ئەویشدا چوو بۆ دۆڵە چیاكە، كەواتە چی لێ چاوەڕوان دەكرێت، بەڵام ئەم دەردەی من پێیەوە دەناڵم مـاڵی خەدیجـەو سـامانەكەیەتی، نـەختێك بـێ دەنگبـوو، دوایـی بەتووڕەییـەوە هاتـەوە ئاخاوتن و گوتی:

سەرەڕای ئەمەش خزم وكەسوكاری خەدیجە، هەموویان لایەنگری موحەممـەدن، بەوە نەخەڵەتێن كە هەندێكیان تا ئێستا موسڵمان نەبووینە، ئەوەتا هالـەی خوشكی خەدیجەو كوڕەكەی موسـڵمان نەبووینـە، كەچی دژایـەتی موحەممـەد ناكەن، بـەڵكو هەمیشە هاتووچۆی ماڵی خەدیجەش دەكەن، بیرتـان نایەتـەوە هەنـدێكیان بەئاشـكرا موسڵمان نەبوون كەچی سڵیان نـەدەكرد لـە تـاریكی شـەودا دزەیـان دەكـرد بـۆ دۆڵی چیاكە خۆراكیان بۆدەبردن تاپلانەكەمان لێ تێكبدەن؟، ئایـا ئێـوە نـابینن برازاكـانی خەدیجە چۆن یەك لەدوای یەك موسڵمانبوون؟، دیسان نەختێك بـێ دەنگبـوو پاشـان گوتی:

بەم چەند كەسەی خزمانی خەدیجە نەخەڵەتێن، كـە دوژمانیـەتی موحەممـەد دەكەن، زۆر چاك بزانن ئەوانە ئەگەر لەدڵدا موسـڵمانیش نـەبن، ئـەوا مـن پێمـوایـە چاوی خەدیجەن لەناو ئێمـەدا، هەنـدێك بێـدەنگبوو، دوایـی لـەپی دەسـتی بەتونـدی بەزەوی داداو بەدەنگێكی بەرز گوتی:

بـەبیروڕای مـن وام بـەلاوە پەسـندە لەخەدیجـەوە دەسـت پێبكـەین، دوای ئـەو هەموو كارێك ئاسانە.

یەكێك لەسەرخۆ گوتی:

ئەی ئەگەر لە ئەبوتالیبەوە دەستمان پێ كرد؟!.

ئەبولەهەب بەسەرسامیەوە گوتی:

من ڕای خۆم بـۆ ئاشـكرا كـردن ئێـوەش لـەكوێ دەسـت پێدەكـەن بیكـەن، بـەڵام

گرنگ ئەوەیە نەخەون بەپەرۆشبن، ڕۆژێـك دوا بکەون سـاڵێك دوادەکەوین، ئەگەر دواش بکەوین ئەوا موحەممەد سەر دەکەوێت و ئێمەش دەبەزین.

لەسـەرەتادا ڕێکبـوون لەسـەر ئـەوە لـە ئەبوتالیبـەوە دەسـت پێبکـەن، بـەڵام یەکێکیان بەزەیی پیاهات و گوتی:

ئەبوتالیب پیـاوێکی نەخۆشـە، بەدەسـت پیریـەوە دەناڵێنێـت، لـەم ڕۆژانـەی دوا تەمەنی ئێش و ئازاری یەکجار زۆرە، نەخۆشییێکی گـران وکوشـندەی تووشـبوە، بۆیـە ئێمە بارێگا چارەیەکی دیکە بگرینەبەر، ئیتر دوایی هـەموویان بـە پەسـندیان زانـی بچن سەبارەت بە موحەممەد(درودی خودای لەسەربێت) ووتووێژ لەگەڵ ئەبوتالیبی مامی بکەن، ئیدی چوونە لای ئەبوتالیب و ئەم سێ خاڵەیان خستەڕوو:

*موحەممـەد(درودی خـودای لەسـەربێت ) پەشـیمان بکاتـەوە لەبیرۆکـەی پەرستنی تاکە خوایێك و ئاینی نوێ.

*یان دەست بەرداربێت و پشتیوانی و پارێزگاری نەکات.

*یان ئەویش وەك برازاکەی دوژمنداریێتی لەگەڵ دەکرێت.

پێغەمبـەریش(درودی خـودای لەسـەربێت) ئەوکاتـە لـەوێ بـوو، کاتـێ سـەیری کافرەکـانی کـرد لـەگرکان و بڵێسەی چـاوەکانیاندا دوژمنایـەتی و بەدڕەوشـتی بـە ئاشکرا دەبینی، لەدەنگ و ڕەنگیان دڵڕەقی و کەللەڕەقی بەدی دەکرد، ئیتر گاورەکـان قسەیان لەگـەڵ ئـەبوتالیب کـرد، بـەڵام نەگەیشتنە هـیچ ئـەنجامێك و بەنائومێـدی گەڕانەوە، بەدەم ڕێگاوە بیریان لە قسەو باسەکە دەکردەوە، دوای ڕۆیـشتنی گاورەکان پێغەمبـەریش(درودی خـودای لەسـەربێت) گەڕایـەوە مـاڵی خـۆی و بـەبێ دەنگـی دانیشت.

خەدیجەخان(خودا لێیڕازیبێت)، هاتەلای و گوتی:

ئـەی پێغەمبـەری خـودا(درودی خـودای لەسـەربێت) چـی بـووە؟، چ ڕووداوێـك ئەمڕۆ غەمبار و خەفەتباری کردوویت!؟.

بەدەنگێکی کزو پڕ لەتاسەو ئاواتەوە فەرمووی:

خەدیجە، ئەبوتالیبی مامم نزیکی مردنە، کافرەکانیش چاوەڕێی مردنی ئەو دەکەن، ئیدی دوای مردنی ئەو، هەرچی توڕەیی و ئازار و ئەشکەنجەی لەدڵیاندا هەیەو پەنگی خواردۆتەوە، وەك لێزمەی باران بەسەرماندا دەیبارێنن.

خەدیجەخان(خودا لێیڕازیبێت) بەڕوویێکی گەش سەیری کردو گوتی:

ئەی پێغەمبەری خودا(درودی خودای لەسەربێت) ئێمە خودامان لەگەڵدایە، هەرگیز ناهەقیش بەسەر هەقدا سەرناکەوێت، ئەگەر ئەبوتالیب بمرێت ئەوا پەروەردگاری ئەو لەئەوو ئەوانیش بەهێزترە، ئیتر ئەوان هەرگیز بەئامانج ناگەن و حەزوو ئارەزووەکانیان جێبەجێنابێت.

پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) کاتێ ئەم ئاخاوتنە شیرینەی لە هاوسەرە دڵسۆزەکەی بیست، لەخۆشیانا بەخەندەیەکی شیرین لێوە پیرۆزەکانی لەیەك ترازاو خەفەت و پەژارەی نەما.

بەڵام ئەوەندەی نەخایاند لەپڕ هەواڵی مردنی ئەبوتالیب بەسەرجەم مەککە ڕاگەیاندرا، پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) بەمردنی ئەبوتالیبی مامی زۆر نیگەران و غەمگین و خەفەتباربوو، تەنانەت کاردانەوەی ئەم کارەساتە لەڕوخساری پیرۆزیدا ڕەنگدانەوەی بەدیدەکراو دیاربوو، هەستی کرد بەم مردنەی مامی قەڵایێکی پۆڵایینی لەناکاو تێکشکاو ڕووخا، خێرا بەرەوماڵی مامی کەوتەڕێ، ئەو مامەی هەرگیز کەمتەرخەمی نەکرد بۆی، زۆر بەخێرایی دەڕۆیشت تا بۆ دواجار چاوی بە دیدەنی شاد بێت، لەڕێگادا لەبەر ئازارو غەم و پەژارەی دابڕانی مامی ئازیزی دەیفەرموو خەدیجە تەنیا تۆ ماویتەوە، بەدەم تکاونزاوە لەخودا دەپاڕایەوە تەمەنی خەدیجەخان درێژ بکات، دوایی بەرەو گۆڕستان ڕۆیشت بۆ شاردنەوەی تەرمی مامی، بەدەم ڕێگاوە سەرنجیدا و بینی قورەیشیەکان چۆن بەرقوقینەوە سەیری دەکەن، لە ڕوخساریان دیاربوو خەریکن لەدڵدا چی بۆ ئامادە دەکەن،



ڕووگرژیان جنێوی لێ دەتکایەوەو دەیانوویست بەڕاشکاوی بڵێن: موحەممەد ئەوا ئەبوتالیبی پشتیوانت مرد، ئیتر لە خەدیجە بەملاوە کەس نەماوە یارمەتیدەرت بێت، ئەویش لەناو دەبەین، ئینجا بزانە چۆن وەك چۆلەکە دەکەویتە ناو داوەوە!.

بۆچوونەکەی تەواوبوو، چونکە ماوەیەکی زۆر بەسەر مردنی ئەبوتالیبدا تێپەر نەبووبوو، بەسەختترین شێوە دەستیان کرد بەنانەوەی کردەوەی توندو تیژی و دژایەتی کردنیان، پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت)کەوتە بەرگری کردن، خەدیجەخانیش (خودا لێیڕازیبێت) هەمیشە یارمەتی دەداو پشتیوانی دەکرد، بەڕوویێکی خۆش و گەش، بەدڵێکی پڕلەوورەو باوەڕەوە، مەینەت و غەمو ئازارەکانی کەم دەکردەوە، کافرەکان ئەوەی لەدەستیان هات بۆسووکایەتی پێکردن و ئازارو ئەشکەنجەدان کردیان، لەم بوارە هیچ کەمتەرخەمیان نەکرد، دەرئەنجام بیریان لەفەوتان و لەناوچوونی خەدیجەخان (خودا لێیڕازیبێت)کردەوە، چونکە پێیانوابوو دوای لەناوچوون و نەمانی ئەم خانمە بەڕێزە، ئیتر بەئاسانی دەتوانن موحەممەد(درودی خودای لەسەربێت) لەناو بەرن.

# دابڕان

دوای نەمانی ئەبوتالیب، خەدیجەخان(خودا لێیڕازیبێت) هەر چەندە تەمەنی گەیشتبووە شەست و پێنج ساڵ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا خاوەن دڵێکی گەنجانەبوو، نزمی دڵی تێکەڵاوی ڕووناکی باوەڕی ڕاستەقینە بووبوو، کەواتە هێزو تواناکەی هەڵقوڵاوی ئەم باوەڕە تۆکمەو سازگارەبوو، لەسەربنەمای ئەم هێزەو باوەڕەوە کارەکانی ئەنجامدەدا، بۆیە پیریی و بێ هێزیی، ڕێگر نەبوون لەبەردەم گورجوگۆڵی و ئەنجامدانی چالاکیەکانی، بەڵکو بەپێچەوانەوە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ چالاکانەترو زیاتر یارمەتی پێغەمبەری خودای (درودی خودای لەسەربێت)دەداو پتر دڵنەوایی دەکرد،

پێغەمبەر(درودی خودای لەسەر بێت) هەمیشە لەخودا داواکاربوو تەمەنی خەدیجەخان(خودا لێیڕازیبێت) ئەوەندە درێژبێت تەنانەت بەچاوی خۆی سەرکەوتنی ئایینی خودا دەبینێت، هەروەها خۆرە گەورەکە دەبینێت چۆن سەرتاپای ئەم جیهانە ڕووناك دەکاتەوەو تاریکی و شەوەزەنگ ڕادەماڵێت، تادەهات کافرەکان زیاتر پێغەمبەریان(درودی خودای لەسەربێت) ئازارو ئەشکەنجەدەدا، بۆیە خەدیجەخان(خودا لێیڕازیبێت)بەو پەڕی سۆزو بەزەییەوە هەمیشە دڵی لای پێغەمبەربوو(درودی خودای لەسەربێت)، هەروەها هەرچەند خەدیجەخان( خودا لێیڕازیبێت) بەناوساڵ دەکەوت و پیرتر دەبوو، ڕێزو خۆشەویستی لەدڵی پێغەمبەردا (درودی خودای لەسەربێت) زیاتر دەبووبەڵام نەیدەزانی خەدیجەخان(خودا لێیڕازیبێت) دوای ئەبوتالیب هێندە نازیت، ئەویش خەریکە بارگەی لەیەك دەنێت و دەچێتەوە لای پەروەدگارو ئەو بەتەنیایی جێدەهێڵێت، ئیدی دووبارە تیری کافرەکان دەچێتەوە ناو کەوانەوە.

شەوێکیان نەخەوتن بەیەکەوە دانیشتبوون، خەریکی قورئان خوێندن و نزاو پاڕانەوە بوون، لەناکاو خەدیجەخان(خودا لێیڕازیبێت) هەستی کرد ژانێك و ئازارێك بروسك ئاسا بەناخیدا تێپەڕبوو، پاشان سەرتاپای جەستەی داگرت، سەیری پێغەمبەری کرد(درودی خودای لەسەربێت) بەدەنگێکی پڕ لە سۆزەوە گوتی:

ئەی پێغەمبەری خودا(درودی خودای لەسەربێت) دڵنیام پەروەردگار سەرکەوتووت دەکات، ڕووناکی خودا هەرگیز ناکوژێتەوە خودای مەزن ڕووناکی خۆی جێناهێڵێت، بەڵکو بەئەنجامی دەگەیەنێت، هەرچەندە کافرەکان ڕقیان لەم ڕووناکیەیەو خۆشیان ناوێت،پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت)کاتێ سەیری ڕەنگ وڕوخساری هاوسەرەکەی کرد، هەستی کرد شتێکی بەسەرهاتووە، دەستی گرت بینی پلەی گەرمی بەرزبۆتەوە، فەرمووی:

خەدیجە چیتە نەخۆشی؟.



بەسەر ژان و نەخۆشیەکەیدا زاڵبوو، گوتی:

هەست دەکەم جەستەم نەختێك گەرم بووە، پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) یارمەتیدا دەستیگرت و بردیە سەرجێگاکەی، پاشان لەتەنیشتیەوە دانیشت، دەستی پیرۆزی بەشوێنی ژانەکە دادەهێنا، هەروەها دەستی خستە سەرنێوچەوانی هەستیکرد پلەی گەرمی زۆر بەرزەهەوڵیدا بەئاوی سارد فێنکی بکاتەوەو گەرمیەکەی دابەزێنێت، هەروەها لەخودای گەورە دەپاڕایەوە ئەم ئازارو ژانەی لەسەرلابەرێت، خەدیجەخانیش (خودا لێیڕازیبێت) بەسوپاسەوە سەیری پێغەمبەری دەکرد(درودی خودای لەسەربێت) بۆ ئەم چاودێری کردنەی، هەروەها داوای لێ دەکرد نەختێك پشووبدات و بحەسێتەوە، بەڵام زۆر بە بەزەییەوە دەیفەرموو:

چۆن دەتوانم هەقی چاکەی تۆ بدەمەوە خەدیجە، من هەژار بووم خودا لەسایەی تۆ دەوڵەمەندی کردم، هەرشەم لێ کرا، لەماڵی تۆدا سەرکەوتن و پارێزگاریم بەدەست هێنا، تۆ بۆ من بوویتە دایك و خوشك و هاوسەر.

خەدیجەخان(خودا لێیڕازیبێت) کاتێ ئازارو ژانەکەی زۆر دەبوو چاوەکانی پڕ فرمێسك دەبوو، پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) سەیری دەکرد، دەیفەرموو:

خەدیجە چیتە؟، خودا زۆر بەسۆزو بەزەییە.

خەدیجەخان(خودا لێیڕازیبێت) سەیری کرد بینی پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) بۆی غەمبارو خەفەتبارە، دووبارە گوتی:

خودا تۆ سەرکەوتوو دەکات، کافرەکان ناتوانن ڕووناکی خودا بکوژێننەوەهەرگیز خودا ڕووناکی خۆی جێناهێڵێ، بەڵکو تا سەرکەوتن پارێزگاری دەکات ئەگەر کافرەکان پێشیان ناخۆش بێت، هەروەها زۆر حەزم دەکرد خۆزە گەورەکەم بدیبایە چۆن تاریکی جیهان لادەدات، لە ناو مەککەو لەدەرەوەش سەر پێچیکاران لەناو دەبات.

پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێت) فەرمووی:

خەدیجە ئەم ڕۆژە دەبینیت، پشت بەخودا بە تەندروستییەکی چاك لەم نەخۆشیەت هەڵدەستیتەوە، تا تەواوکردنی پەیامەکەدوایی سەیری دەکردو بەغەمگینی دەیفەرموو: خودا چاکت دەکاتەوە خەدیجە، بەتەنیا جێمناهێلیت.

خەدیجەخان(خودا لێیرازیبێت) دوای دان بەخۆداگرتن گوتی:

ئەی پێغەمبەری خودا(درودی خودای لەسەربێت) پەروەردگاری مەزن پشتیوانی تۆ دەکات، پلانی کافرەکان پووچەڵ دەکاتەوەو ڕزگارت دەکات، هەرگیز دەستیان پێت ناگات، چۆن هەمیشە خودا دەتپارێزێت.

نەختێك بێدەنگ بوو دوایی گوتی:

ئەی پێغەمبەری خودا(درودی خودای لەسەربێت) ئاخۆ خودای کاربەجێ چی بۆ من ئامادەکردوە؟، ئایا لێم ڕازیە و من وەردەگرێت؟.

پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) چاوەکانی داخست بۆئەوەی فرمێسکە قەتیس ماوەکانی بشارێتەوە، پاشان بەخەندەیەکی پڕ لەسۆزو خۆشەویستیەوە فەرمووی:

خودای مەزن لەتۆ ڕازیە و سوپاست دەکات، چونکە تۆ یارمەتی پێغەمبەری خودات داوەو پشتیوانیت کردووە، خۆت و ماڵ و سامانت لەپێناوی خوادا بەخت کردووە، یەکێکیش یارمەتی خوداو پێغەمبەرەکەی بدات بێگومان خوداش یارمەتی ئەو کەسە دەدات، لەبەهەشت چەندین کۆشکت بۆ ئامادەکراوە، ڕووباریان تێدا دەڕوات، لە دوڕ و گەوهەر دروست کراون، بەگوڵ وداری بەردار و هاژەی رووبارەکان ڕازاونەتەوە.

وێڕای ئەوەش ناوەناوە بەئاوی سارد سەری خەدیجەخانی(خودا لێیرازیبێت) سارد دەکردەوە، بەهەناسەیەکی ساردو پڕ لەئاهوناڵەوە دەیفەرموو:

پشت بەخودا ئەم تاوو گەرمیە نامێنێت و تەندروستیت چاك دەبێت و



ڕادەبیتەوە بۆ تەواوکردنی پەیامەکە، خودا دڵی دوژمنانمان خۆش ناکات و نابێ ئەوان بەزیانی ئەم ئایینە دڵخۆشبن.

خەدیجەخان(خودا لێیڕازیبێت) چاوەگەورەکانی کردەوە، پرسیاری کرد گوتی:

قورەیشیەکان ئێستا لە چی دانە؟ یەکێك لە کچەکانی کە لە دەوری دایکیان کۆببوونەوە بەدەنگێکی پڕ لەتاسەوە گوتی:

دایە چاوەڕوانن!، بەڵام قوڵپی گریان لەناخیدا سەریکردو لەپرمەی گریانیدا، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێت) چاوەکانی پڕ فرمێسك بوو، داوای لەکچەکەی کرد نەگرێێت، فەرمووی دایکت باشە، هەروەها داوای لە خەدیجە کرد قسە لەگەڵ کچەکانی بکات.

بەڵام نەخۆشیەکەی سات لە دوای سات توندتردەبوو، بۆیە پێغەمبەرو(درودی خودای لەسەربێت) هەرچوار کچەکەی پەشۆکاوترو غەمبارتر دەبوون، تەنانەت موسڵمانانیش خەفەتباربوون، زۆربەیان هاتبوونە ئەوێ و پرسیاریان لە تەندروستی خەدیجەخان(خودا لێیڕازیبێت)دەکرد، بەتایبەتی هەژاران و ئەو ژنانەی هەمیشە ژیانیان بەندبوو بە بەخشش و چاکەکانی ئەم خانمە و لەسایەی بەخششەکانی ئەودا ژیانیان فەراهەم بوو، دەستیان بەرزکردبووەوە بەدەم نزاو پاڕانەوە لە خودای بەرزو کاربەجێ دەپاڕانەوە، بەڵکو ئەم خانمە ڕێزدارە چاکبێتەوە.

ئەبولەهەب و ژنەکەی لەدەرگایماڵەکەیان وەستابوون، یەکێك لەبەردەمیان تێپەڕیبوایە پرسیاری باری تەندروستی خەدیجەخانیان(خودا لێیڕازیبێت)لێیدەکرد، موسڵمانانیش بەقسەی ڕەق و ناخۆش وەڵامیان دەدانەوە، چونکە لە پرسیارەکەیان جنێو و هیواو ئاواتی نەمانی خەدیجەخانیان(خودا لێیڕازیبێت)بەدی دەکرد، دەیانزانی ئەوان زۆر بەپەلەو بەپەرۆشن بۆ بیستنی هەواڵی مردنی ئەم خانمە بەرزو بەڕێزە، بۆئەوەی ئەم شمشێرە بڕندەو بەهێزە بچێتەوە کالان، سەرەڕای ئەمە سەرجەم مەککەییەکان دۆستان و دوژمنان پرسیاری باری تەندروستی

خەدیجەخانیان دەکرد، تەنانەت لەهەموو کۆڕو دانیشتنێکدا باسی دەکرا، هەندێکیان باسی چاکەکانیان دەکرد، هەندێکیش بە پێچەوانەوە بەخراپە باسیان دەکرد و چاکەکانیشی بەخراپە دەهاتە بەرچاو، بێگومان ئەمەش بەپێی ناحەزی و ڕق لێبوونەوە بوو، هەموویان چاوەڕوانی بیستنی هەواڵی مردنیان دەکرد، تەنانەت زۆربەیان بە دڵنیاییەوە دەیانگوت ئێستا نا ئێستا بڵاودەبێتەوە.

پێغەمبەرو(درودی خودای لەسەربێت) کچەکانی بەچواردەوریدا وەستابوون، بەوپەڕی سۆزو بەزەیی و خۆشەویستیەوە سەیریان دەکرد، چۆن بەرەبەرە خەریکە لەکۆتایی ژیان و دواهەناسەی ژیانی نزیك دەبێتەوە، بەڵام خەدیجەخان(خودا لێیڕازیبێت) تەنانەت لەسەرەمەرگیشدا باکی بەمردنی خۆی نەبوو، بەڵکو تەنیا غەمی پێغەمبەری بوو(درودی خودای لەسەربێت) ئاخۆ دوای نەمانی ئەو، قورەیشیەکان چی بەسەر دێنن؟.

ئەم شەوە شەوێکی زۆر دوورو درێژ بوو، خانەوادەی خەدیجەخان(خودا لێیڕازیبێت) بەدڵ و دەروونێکی پەشۆکاوو پڕ لەنیگەرانیەوە بەچواردەوری ئەم خانمە بەرێزو شکۆدارەدا وەستابوون، پێڵوی چاوە پڕ لەئەسرینەکانیان تەنیا بۆ چرکەیەکیش نەبۆرژان و نەخەویان بەخۆیانەوە نەدیت، بەڵکو ئەم شەوە تەنیا لەخودا دەپاڕانەوەو تکاو نزایان دەکرد، ئیتر لەمە زیاتر هیچی تریان بۆنەدەکرا، پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) لە تەنیشتیەوەبوو دەیفەرموو:

ئەوەی خودا بیکات لەهەمووی چاکترە.

بەرەبەیانبوو لەناکاو خەدیجەخان(خودا لێیڕازیبێت) چاوەکانی هەڵێنا، سەیری چوار کچەکەی و پێغەمبەری کرد(درودی خودای لەسەربێت)، دوایی پێکەنی و چاوەکانی داخست، ئیتر جەستەی بۆ هەتاهەتایە لە جووڵە کەوت، ئەو جەستەیەی تا ئەو ساتە لە پێناوی خوداو ئایینەکەی لە بزاڤ و جووڵەدابوو.

پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت)خۆی بۆ نەگیرا، فرمێسکی چاوەکانی بەتاو

هاتنەخوار، کچەکانی لەپرمەی گریانیانـدا، ئـیتر تـەنیا دەنگی ئـاهو ناڵەو گریـانبوو لەم ماڵە پیرۆزەدا، بـۆ بـەیانی تـەرمی پیرۆزی خەدیجەخان(خـودا لێیرازیبێـت)، لـە ماڵەکەیانـەوە بەسـەر شـان و ملـی موسـڵمانانـدا گواسـترایەوە بـۆ گۆڕسـتانی(المعـلاة) لەباکووری ڕۆژهەڵاتی مەککە لەناوچەی(حەجون)، قورەیـشیەکان لـەدێر زەمانـەوە لـەم گۆڕسـتانە بـەخاك سـپێردرابوون، لـەم گۆڕسـتانە گۆڕیـان بـۆی هەڵکەنـد، پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) چووە ناو گۆڕەکە بەدەستی پیرۆزی خـۆی نـاو گۆڕەکـەی بـۆ ڕاسـت کـرد، دوایـی تـەرمی پاکـژی مـاچ کـردوو لـەناو گۆڕەکـەی درێـژ کردبۆ دواجار سەیری کردوو دوایی بەچاوێکی پڕ لەفرمێسك لـە گۆڕەکـە هاتـەدەر، ئیتر لەتەنیشت گۆڕەکە وەستا، سەری دانەواندبوو بە دڵێکی پڕ خەفەت و پەژارەوە سـەیری گۆڕەکـەی دەکـرد، ئـیتر موسـڵمانان لەسـەر گۆڕستانەکە یەکەیەکـە پرسـەو سەرەخۆشیان ئاراستەی کرد، دوایی گەڕایەوە ماڵەوە چاوەڕوانی کافرەکان بـوو ئـاخۆ چی دەکەن پاش بزربوون و نەمانی ئەم کۆمەڵگە بەهێزەی ئیسلام.

## یـادەوەریەکانی خەدیجە

پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) بەمردنی خەدیجەخان(خـودا لێیرازیبێـت) هەسـتی بەکـەم و کـوڕی و کـەلێنێکی گـەورە دەکـرد لەژیانیـدا، هـەر کاتـێ سـۆزو چاکەکانی ئـەم خانمـە ڕێـزدارەی بیردەکەوتـەوە زۆر پەسـت و غـەمگین و خەفـەتبار دەبـوو، تەنانـەت کاریگـەری مـردن و دابڕانـی ئـەم هاوسـەرو هـۆگرە خۆشەویـستەی، کاردانەوەی لەڕەنگ و ڕوخسارو جەستەیدا بەدەرکەوتبوو.

بێگومـان گاورەکـان بـەمردنی خەدیجـەخان(خـودا لێیرازیبێـت) زۆر دڵخـۆش و کامەرانبوون، تەنانەت لەخۆشیانا سەمایان دەکردو دەیانگوت:

ئیتر نە ئەبوتالیب و نەخەدیجە لەبەر دەممان نەماوون.

پاش پرسەو سەرەخۆشی، پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) رۆژێکیان لەماڵ چووە دەرەوە، لەرێگادا چەند کافرێکی کاڵفام هاتنە پێشی نەشکەنجەو ئازاریانـدا، تەنانەت خۆڵ و خاشاکیان بەسەر سەریدا کرد، ئیتر بەدڵێکی پـڕ لەغـەم و پـەژارەوە گەڕایـەوە ماڵـەوە، خەدیجـەخانی هاتـەوەیاد، چـۆن جـاران بەپێکـەنین و ڕووێکـی گەشەوە پێشوازی دەکرد، هەموو ئـازارو دەردو خەفـەتی لەدڵدا دەردەکرد، فاتیمـەی کچی کاتێ بـاوکی بـەم شێوەیە بینـی، خێـرا هەسـتا تـا سـەری بـشوات، کاتـێ ئـاوی بەسەری باوکی داکرد، دایکی کۆچکردووی بیرکەوتـەوە، چۆن جاران ئـەم کـارە ئـەو ئەنجامیدەدا، وێڕای ئەمـەش دڵنـەوایی دەدایـەوەو وەرەی بـەرزدەکردەوە، بۆیـە خـۆی بۆنـەگیراو لەپرمـەی گریانیـدا، ئـەم گریانـەی فاتیمـە کاریگـەری کـردە سـەر بـاوکی (درودی خودای لەسەربێت)، ئەمیش گریا، دوایی بەدەم تکاو نـزاوە لـەخودای مـەزن پاڕایەوە بۆ هاوسەرە کۆچکردوەکەی.

پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) هەرگیز خەدیجەخانی(خـودا لێیڕازیبێـت) لـەیاد نـەدەکرد، هـەر قـسەو باسـێك بکرابـا، باسـی چـاکەو سـۆزی ئـەوی دەکـرد، موسڵمانان کاتێ بیـ ـیان پێغەمبەر(درودی خـودای لەسـەربێت) کاردانـەوەی خەفـەتی دابڕانی هاوسەرەکەی پێوەدیارە، هەوڵیاندا وویستیان نەختێك باری خەفەتەکەی بـۆ سـووك بکـەن، ئـیتر پێـشنیاری ژنهێنانیـان بـۆی کـرد، بـۆ ئـەم مەبەسـتە ژنێکیـان ناردەلای تا پێشنیارەکەی پێڕابگەیەنێت ژنەکە گوتی:

ئەی پێغەمبەری خودا(درودی خودای لەسەربێت) دەبینم تۆ لەدوای کۆچکردنی خەدیجە (خـودا لێیڕازیبێـت) هەمیـشە کـزو دامـاوو خەفـەتباریت، تەنانـەت دابڕانـی ئـەو، کاریگـەری کردۆتـە سـەر ڕوخـسارو جەستەکەشـت، بۆیـە دەڵـێم دەبـێ یـەکێك نەبێت ئەم خەفەت و پەژارەیەت لابەرێت یان کەم بکاتەوە؟.

پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) بەچاوێکی پڕ لەفرمێسکەوە فەرمووی:

کێ هەیە بتوانێت غەم و پەژارەی خەدیجەم لەدڵ دەربکات؟، چۆن ئەو یارمەتی پێغەمبەری خودای دابوو، بۆ خودا ژیاو لەپێناو خوداش مـرد، خەدیجە بەرێوەبـەرو

خاوەنی ماڵ بوو، پەروەردەکاری خێزان بوو، دایکی منداڵەکانم بوو.

ژنەکە گوتی:

بۆ ئەی پێغەمبەری خودا(درودی خودای لەسەربێت) پێتوایە هیچ ژنێک نیە قەرەبووی ئەو بکاتەوە، یان ئەگەر هیچ نەبێت هەندێك لە سۆزو بەزەیی ئەوت پێ ببەخشێت؟، من پێموایە زۆر ژن هەیە جێگای ئەوت بۆ دەگرێتەوەو لەگەڵ تۆدا زۆر بەرێکی گوزەران دەکات و سۆزو بەزەییت پێدەبەخشێت، ئیتر ژنە وازی نەهێنا، بەڵکو لەسەر قسەکانی بەردەوام بوو، تەنانەت لە کۆتاییدا ڕەزامەندی وەرگرت، ئیدی خوازبێنی بۆ کرد، لە ئاکامدا هاوسەرێکی بۆ هەڵبژارد.

بەڵام هیچ یەکێك لەهاوسەرە بەرێزەکانی نەیانتوانی جێگای خەدیجەخان (خودا لێیانڕازیبێت) بگرنەوە، تەنانەت خۆشەویستی ویادەکانی خەدیجەخانی لە دڵ دەربکەن، ڕوقییەی کچی شێوەی زۆر لە خەدیجەخانی دایکی دەکرد، بۆیە لای باوکی یەکجار خۆشەویستبوو، تەنانەت کاتێ سەیری ڕوقییەی دەکرد، جوانی و دەنگ و خەندەو جولانەوەو قسەو ئاوازی خەدیجەی بیردەهاتەوە، تەنانەت هەندێ جار ڕوقییەی لای خۆی دادەنا گوێی دەدایە قسەکانی و هەمیشە گوێی بۆ قسەکانی دەگرت، بۆیە کاتێ ڕوقییە کۆچی دواییکرد پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) زۆر بۆی گریاو خەفەت باربوو، کاتێ لەگۆڕدا ناشتیان هەستی کرد جارێکیتر خەدیجەخانی هاوسەری وەفاداری دەنێژێتەوە.

ڕۆژانە کاتێ لەماڵ دەردەچوو خەدیجەی بیردەهاتەوە(خودا لێیڕازیبێت)، هەمیشە بۆی دەپاڕایەوەو داوای لەخودای مەزن دەکرد لەبەهەشت بەیەکیان شاد بکاتەوە، تەنانەت ڕۆژێکیان خاتو عائیشەی بینی پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) زۆر بایەخ بەخەدیجەخان(خودا لێیڕازیبێت) دەدات، هەمیشە لەیادیەتی گوتی:

جا ئەو پیرێژنە چیبوو، خودا لە ئەو چاکتری پێ بەخشیوی.

توورەیی و گرژی لەڕوخساری پیرۆزیەوە دیاربوو، فەرمووی:

نا بەخودا، خودا لەو چاکتری پێنەداوم، چۆن ئـەو کاتـێ بـاوەڕی پێکـردم خـەڵك کافربوون، بەڕاستگۆی زانیم کاتێ خەڵك بەدرۆی دەخستمەوە، بەسامان و ماڵی خۆی منـی گرتـەوە، کـاتێ خـەڵك لێیـان قەدەغـەدە کـردم، خـودا تـەنیا لـە ئـەو منـداڵی پێبەخشیم.   هەروەها لەگەڵ هەموو سەرکەوتنێك خەدیجەخانی(خودا لێیڕازیبێت) دەهاتـەوە یـاد، چـونکە دڵـی بەسـەرکەوتن خـۆش دەبـوو، هـەروەها لەگـەڵ هـەموو نەهامـەتی و شکـستێکدا خەدیجـەخانی(خـودا لێیڕازیبێـت) دەهاتـەوە یـاد، چـونکە بەقسە پـڕ لـەوڕەو بەسـۆزەکانی دڵنـەوایی و ئـارامی پێدەبەخـشی، هـەروەها لەگـەڵ بەدەست هێنانی هەر دەسکەوتێکدا دەهاتەوەیادی و دەیفەرموو:

خۆزگە خەدیجە لێرەبوایـە تـا سـەرجەم ئـەم دەستکەوتەم بدابایـە ئـەو، بـەڵکو هەندێك لە چاکەکانی ئـەوم بـۆی بگەڕاندبایـەوەو بدابایـەوە، لـە هـەموو بۆنەیـەکی خۆشـی و ناخۆشـیدا لەگـەڵ گیـانی خەدیجـەدا دەژیـا، بۆیـە لەسـەرجەم بۆنەکانـدا بەخشش و چاکەو دیاری پێکەش بەکەنیزەو دەست و پێوەندەکانی خەدیجە دەکرد، هـەروەها سـەردانی دەستەخوشـك و خۆشەویـستەکانی دەکـرد، تەنانـەت ئەگـەر ئاژەڵێکی سەر ببڕیبایە خێرا دەیفەرموو:

هەنـدێك گۆشت بۆ دەستەخوشکانی خەدیجە بنێرن، من خۆشەویستەکانی ئـەوم خۆشدەوێ.

پێغەمبـەر(درودی خـودای لەسـەربێت) زۆر بـەوەفابوو بـۆ خەدیجـەخان(خـودا لێیڕازیبێت)، هەمیشە لەگەڵ یادەکانی ئەودا دەژیاو لەبیری نەدەکرد، تەنانەت تـا دوا هەناسەی ژیانی تا ئەوکاتەی بارگەی لەناکاو کۆچی کـرد بـۆلای پـەروەردگاری مـەزن هەمیشە لەیادی نەکرد.

ئـیتر خەدیجـەخان(خودالێیڕازیبێـت)هەمیـشە سـونبولی چـاکەو دڵـسۆزی و خۆبـەخت کـردن و دەربڕینـی خۆشەویـستیە بـۆ خـودای مـەزن و پێغەمبەرەکەی(درودی خودای لەسەربێت).

# زەینەبی کچە مەزن

زەینەب لەپیرۆزترین و شکۆمەندترین ماڵدا چاوی هەڵێنا، ئەو ماڵەی دەسەڵاتدارترین خانەوادە، ڕەسەنترین ڕەچەڵەکی قورەیش بوو، لە سەردەمێکدا زەینەب لەدایك بوو کچان زیندەبەچاڵ دەکران، لەدایکبوونی کچ مایەی نەنگی و شەرمەزاری بوو بۆ خانەوادەکەیان، کەچی بەپێچەوانەی داب ونەریتی قورەیش، لەم ماڵە پیرۆزە پێشوازی لەم کچە کرا، ئەو ماڵە هەمیشە لەسایەی سۆزو خۆشەویستیدا شادی و بەختەوەری باڵی بەسەر خشاندبوو، کاتێ باوکی شکۆدارو بەڕێزی سەیری زەینەبی دەکرد، لە ڕوخساری ئەم کچە نەشمیلەدا شێوەی دایکی بەدیدەکرد، ئەو دایکەی تاڵی و سوێری ژیانی هەتیوی لەبیردەوەبەهەست و سۆزی جوانی خۆی کامەرانی و ئاسوودەیی بۆ دابینکرد، هەروەها دایکی کاتێ سەیری کۆرپەکەی دەکرد، هەستیدەکرد کچەکەی پارچەیەکی زیندووە لەهاوسەرە شکۆدارو خۆشەویستەکەی، ئەو کەسایەتیە بەڕێزو شکۆمەندەی کاتێ لەیەکەم دیداردا هەستی بە پیرۆزی و ڕەوشت بەرزی و ڕووناکی خۆری مەزن کردو دڵ و دەروونی داگیرکرد، ئیتر لەم ڕۆژەوە جارێکی تر لەنوێوە هاتەوە ناوکۆڕی ژیانێکی پڕلەئاسوودەیی و بەختەوەری.

زەینەب لەم ماڵە ئاسوودەیەدا پەروەردەکرابوو، بێگومان دیارە ئەم ماڵە وەکو هەرماڵێکی تری قورەیش پابەند نەبوون بەدابو نەریتی کۆمەڵگاکە، زەینەب لەسەرەتای تەمەنیدا ڕادەستی دایەنێکی گوندنشین کرا، بەڵکو لە ژینگەیەکی کەشوهەوا سازگارو فسەپاڵاودا پەروەردەبکرێت، دوای ئەوەی لەشیرخواردن کرایەوە، گەڕایەوە نێو باوەشی دایکی، تا بەچاکترین شێوە پەروەردەی بکات.

بێگومان چونکە خەدیجە(خودا لێیڕازیبێت) پێشتر دایکایەتی بینیبوو، بۆیە لەبواری پەروەردەکردنی منداڵدا خاوەن ئەزموون و شارەزابوو، زەینەب لەسایەی پەروەردەی دروستی دایکیدا هەمیشە دوور بوو لە کێشەو گیروگرفت، لە ئاکامدا زوو

گەشەی کرد، هەرچەندە ژمارەیەکی زۆر لە خرمەتکارو کەنیزە لەمماڵەدا کاریاندەکرد، بەڵام وێڕای ئەوەش خەدیجە(خودا لێیرازیبێت)حەزی دەکرد تەنیا خۆی منداڵەکەی پەروەردە بکات، تا بۆ ئەو ئاییندەیە شکۆدارەی ماوەیەکی دوور و درێژە چاوەڕوانیەتی ئامادەی بکات، هەمیشە هیواو ئاواتی ئەوەبوو سەرجەم منداڵەکانی لەگشت خەڵکی مەککە جوانتر و رێکتر پەروەردە بکرێن.

زەینەب لەسەرەتای گەنجیەتیدا، دایکی زوو فێری ماڵ و ماڵداری کرد، بۆیە وەك کچەکانی هاوتەمەنی سەرقاڵی یاریکردن نەبوو، بەڵکو دایکێکی بچووکی فاتیمەی خوشکی بوو، هەمیشە چاودێری دەکرد، لەکاتی بێکاریدا یاری لەگەڵ دەکرد، زەینەب بێ وچان یارمەتی دایکی دەدا لەراپەڕاندنی کارەکاندا، چونکە هەستی دەکرد دایکی پێویستی بەیارمەتیە، ئەم هەڵسووکەوتەی زەینەب نێوانی ئەو و فاتیمەی زۆر خۆش کردبوو لەیەکتر نزیك ببوونەوە.

زەینەب تەمەنی گەیشتە دە ساڵ، ئیتر سەرجەم گەنجەکانی بنەماڵەی هاشمی، بگرە زۆربەی خانەوادەکانی مەککە چاویان تێبڕیبوو، پێشبڕکێیان بوو ئاخۆ کێ گرەو دەباتەوە، باوك و دایکی زەینەب کام لاوی قورەیش دەکەن بەزاوای خۆیان.

بەڵام هیچ کەس لەوانە هێندەی (ئەبی عاص کوری ئەلرەبیع) هیوایان پێی نەبوو، ئەم هەلەی بۆ ئەم پیاوە شکۆدارو دەوڵەمەندە رەخسابوو بۆکەسێکی تر نەرەخسابوو، لەبەر ئەوەی ئەو، خوشکەزای خەدیجەخان بوو، پوری خۆشیدەویست و وەك کوڕی خۆی سەیری دەکرد.

زەینەب خوشکە گەورەی چوار کچان بوو، زۆر یارمەتی دایکی دەدا، خوشکەکانی بەخێودەکرد، کاروباری ناوماڵی ڕادەپەڕاند، بۆیە هەرچەندە بەتەمەن منداڵ بوو، بەڵام بەدیمەن گەورە دیاربوو، دایکی ئەم کاتە تەمەنی لەپەنجا ساڵ تێپەڕبووبوو، سەرەڕای ئەوەش بەهۆی منداڵبوون زۆر ماندو بووبوو، چونکە هەموو منداڵەکانی بەدوای یەك لەنێوان تەمەنی چل تا پەنجا ساڵی بووبوو، ئیتر زەینەب لەئاکامی باری



قورسی ماڵداری و یارمەتیدانی دایکی، هەرچەندە لەسەرەتای تەمەنی گەنجیەتی دابوو، بەڵام گەورە دیار بوو.

ئەبولعاس گەر بچووبایە بۆ ماڵی پووری زەینەبی دەبینی، سەرنجی دەدایە شیرینی و زیرەکی و ڕەوشت بەرزی ئەم کچە، بۆیە لەدڵدا حەزی دەکردو هەمیشە ئاواتەخواز بوو بەهاوسەرگیری زەینەب شادبێت، هەروەها دەیزانی لاوانی بنەماڵەی هاشمیەکان دەیانەوێت خوازبێنی بکەن، بەڵام وێڕای ئەوەش هەستی دەکرد ئەوان وەکو ئەو، ئەم هەلەو پلەو پایەی ئەو لەماڵی موحەممەد(درودی خودای لەسەر بێت) هەیەتی ئەوان پێی ناگەن، بۆیە متمانەی بەخۆی هەبوو کەبەخت یاوەریەتی، بەڵام نەیدەویست ئەم نهێنیە بدرکێنێت تا نەکەوێتە ململانێ لەگەڵ کەسانی تر، بەڵکو پێی پەسند بوو ئەم نهێنیە تەنیا لای پوری بدرکێنێت، ئیتر ڕۆژێکیان رازی دڵی خۆی لای پوری درکاند خوازبێنی زەینەبی کرد.

بەڵام لاوێکی هوشیارو زانا بوو، پەلەی نەکرد نەیویست زەینەب بەم نهێنیە بزانێت، چونکە دەی زانی کچێکی تازە پێگەیشتوو هەمیشە شەرمنە، ئەگەر بەم کارە بزانێت ئەوا شەرم دایدەپۆشێت و هەست و سۆزی پاك و بێگەردی بریندار دەبێت، ڕەنگە لەپلەو پایەی گورە پورایەتی و ڕێزگرتنەکەی کەم بکاتەوەو کچە خۆی بپارێزێت.

ئەم هەڵوێستە بۆ ئەبولعاس زۆر نیگەران بوو، چونکە نەی دەتوانی ئەم نهێنیەو ڕازی نێو دڵی بەئاشکرا بدرکێنێت، بەڵکو ناچاربوو ئارام بگرێت و خۆی لەژێر ئەم بارە قورسە ڕابگرێت، ئیتر لە پاراستنی ئەم نهێنیەی توانی زەینەب دڵنیا بکات، شەرم نەکات و لێی دوورنەکەوێتەوە، تەنانەت لەئەنجامی گەڕان و گەشتدا ئەزموونێکی زۆری بەدەست هێنابوو، لە ژیاندا کارامەو شارەزا ببوو، ئیدی توانی سەرنجی زەینەب بۆخۆی ڕابکێشێتتەنانەت وەك برایێك لەناو سەرجەم گەنجانی قورەیشدا شانازی بە ئەبولعاس بکات، چونکە خاوەن کەسایەتیەکی بەهێزەو شارەزاییەکی فراوانی هەیە.



# خوازبێنی

خەدیجە ڕازی دڵی ئەبولعاسی بەهاوسەرەکەی(درودی خودای لەسەر بێت)ڕاگەیاند، ئەویش پێی پەسند بوو، دوای ئەوە، کوڕە خوشکەکەی ئاگادار کردەوە بۆ خوازبێنی بێتە لای باوکی زەینەب، هەرچەندە خەدیجە حەزی دەکرد کچە گەورەکەی بۆ ماوەیەکی دیکە بمێنێتەوە، بەڵام دەیزانی کوڕو کاڵ و گەنجانی قوڕەیش زۆر بەپەرۆشن ببن بەزاوای ئەمینی هاشمی، بۆیە ترسی هەبوو ئەگەر کچەکەی تا ماوەیەکی تر بمێنێتەوە ئەوا ئەوان پێش ئەبولعاس دێنە خوازبێنی زەینەب، ئیتر ئەو کاتە هاوسەرەکەی شەرمەزار دەبێت و ئەویش پێی نیگەران دەبێت.

ئەبولعاس بۆ دیداری موحەممەد(درودی خودای لەسەر بێت) هاتەلای، وەك خوڕەوشتی ئاسایی خۆی بەجوانی پێشوازی کردو گوێی بۆ قسەکانی گرت، ئەویش ئارەزو و ڕازی دڵی خۆی هەڵدەرشت، چۆن حەز دەکات دەستی زەینەبی لەناو دەست بنێت، لەکۆتایی دیدارەکەیان وەڵامی پیرۆزی باوکی زەینەب(درودی خودای لەسەر بێت) بۆ ئەبولعاس ئەمە بوو:

تۆ زاوایەکی هاوشان و لەئاستی ئێمەی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەرفەتم بدە تا ئەو ڕازەو داوایەی تۆ بەکچەکەم ڕابگەیەنم، چونکە بۆکارێکی ئاوا گرنگ و پیرۆز، پێویستە ئەو خۆی خاوەنی بڕیارو وشەی یەکەم بێت، لەبەر ئەوەی کارەکە پتر پەیوەستە بەخۆیەوە نەك بەکەسێکی دیکە.

باوکی ڕێزدار ڕەنگە هەستی کچەکەی سەبارەت بە ئەبولعاس زانیبێت چۆنە، بەڵام وێڕای ئەوەش نەی دەویست بێ ڕا وەرگرتنی کچەکەی کۆتایی پێ بێنێت، هەروەها ڕاستەوخۆ نەچووە لای، ڕووبەڕوو داواکەی ئاراستە نەکرد، تا پەشۆکاو و شپرزە نەبێت، بەڵکو دایکی ڕاسپارد پێش ئەوەی بچێتە لای باسەکەی بۆ بکات،

پاشان بە هێمنی و لەسەرخۆ بۆلای ژووری کچەکەی چوو، لەنزیکیەوە وەستا بەجۆرێك کچەکەی گوێی لەدەنگی دەبوو، بەڵام نەیدەبینی، بەدەنگێکی پڕ لەسۆزو خۆشەویستی فەرمووی:

کچەکەم زەینەب، ئەبولعاسی کوڕی پوورت ناوی تۆی هێناوە.

ئیتر چاوەڕوانی وەڵامی ڕوون و ئاشکرای نەکرد، چونکە دەیزانی شەرم ڕێگای پێنادات زمانی بڵێ لەل، تەنیا ئەوە نەبێت ئەگەر کچە قایل نەبێت شووی پێبکات، ئەوا ئەو کاتە خۆی بۆ ناگیرێت بەسەر شەرمەکەی زاڵدەبێت و دێتە ئاخاوتن، لەترسی ئەوەی نەوەك کارەکە تەواو بێت و ئەمیش لەدڵدا قایل نەبێت، ئیتر تۆزێك وەستا گوێی بۆکچەکەی گرت، بەڵام جگە لە دڵە کوتە بەم لاوە هیچی تری نەبیست، ئیتر گەڕایەوە لای ئەبولعاس، دەستی خستە ناو دەستی و پیرۆزبایی لێیکرد، داوای خۆشی و بەختەوەری بۆ کردن.

ئەم هەواڵە لەشاری مەککەدا بڵاوبووەوە، لەناکامدا ئەو گەنجانەی چاوی هیواو ئاواتیان لەزەینەب بڕیبوو، بەم هەواڵە پەست و غەمگین بوون.بەڵام وێڕای ئەوەش هیچ یەکێکیان بۆیان نەبوو باسی ئەبولعاس بەخراپە بکەن، بەڵکو گوتیان دەبوایە زەینەب بۆ ئامۆزاو گەنجانی بنەماڵەی هاشمی بوایە نەك بۆ کوڕی پووری، بەڵام وێڕای ئەوەش بەچاکە ناوی ئەبولعاسیان دەهێنا، چونکە قورەیشییەکی ڕەسەن بوو، بەڕەچەڵەك لەگەڵ باوکی زەینەبدا لەیەك پشت بوون، لەباپیرەی سێیەمیان(عەبدولمەناف کوڕی قوصەی) یەکیان دەگرتەوە، چونکە(ئەبولعاص کوڕی ئەلرەبیع کوڕی عەبدولعزا کوڕی عەبدولشەمس کوڕی عەبدولمەناف کوری قوصەی) بوو ئەمە لەلای باوکیەوە، بەڵام ڕەچەڵەکی لەلای دایکیەوە لەگەڵ زەینەب هەردووکیان نەوەی(خومیلد کوڕی ئەسەد کوڕی عەبدولعزا کوڕی قوصەی)بوون، دایکی ناوی هالە کچی خومیلد بوو، خوشکی خەدیجەی پاکیزەی هاوسەری موحەممەد(درودی خودای لەسەربێت)و دایکی زەینەب بوو، سەرەڕای ئەم

ڕەسەنایەتیەو ئەم ڕەچەڵەکەی، پیاوێکی ڕەوشت بەرزو خاوەن کەسایەتیەکی بەهێزو دڵ فراوان بوو، تەنانەت وەکو موحەممەدی کوڕی عەبدوڵا (درودی خودای لەسەربێت) نازناوی ئەمینیان لێنابوو، خەڵك متمانەی پێ دەکردو جێگای خۆی لەڕیزی پێشەوەی بازرگانەکانی مەککەدا کردبووەوە، ئەوکاتە بازرگانان دەوڵەمەندترین و ناودارترین چین و توێژی ئەم شارەبوون.

لێرە ڕەنگە یەکێك بڵێ خەدیجە(خودا لێیڕازیبێت) یارمەتی ئەبولعاسی داوە تا ببێتە هاوسەری زەینەبی کچی‌یان بڵێ ئەگەر ئەبولعاس خوشکەزای خەدیجە(خودالێیڕازیبێت) نەبوایە، ئەوا موحەممەد(درودی خودای لەسەربێت) هەرگیز کچەکەی خۆی پێنەدەدا، بەڵکو دەیدایە هاشمیەکان.

لێرە دەڵێین ئەبولعاس پیاوێکی ڕەوشت بەرزو خانەدان و خاوەن ڕەچەڵەك و بنەماڵەیەکی شکۆدارو دیاربوو لەناو قوڕەیشدا، بۆیە ئەگەر بهاتایە لەدەرگای هەرماڵێکی ناوداری قوڕەیشیەکانی بدابوایە بۆ مەبەستی خوازبێنی، ئەوا بەدڵێکی فراوانەوە دەرگاکانیان بۆ دەخستە سەرپشت، تەنانەت کامە کوڵی بویستبایە و ئارەزووبوایە لەیاخەی دەدرا.

ئیتر ماڵی موحەممەد(درودی خودای لەسەربێت) کەوتنە جموجۆڵی ئامادەکردن و پێکهێنانی ماڵی نوێ بۆ زەینەب، بۆ ئەم مەبەستە خەدیجە(خودا لێیڕازیبێت) چەند کەسێکی شارەزای ڕاسپاردبوو، تا نایابترین جۆری کەلوپەل و جوانترین و بەهادارترین بۆن وبەرام و جلوبەرگ بۆ زەینەب بکرن، وێڕای ئەوانیش ئەبولعاس هیچ کەمتەرخەمی نەبوو لەم بوارەدا، هەموو پێداویستیێکی ناوماڵی فەراهەم کرد، ماڵێکی خنجیلانەی ڕێکخستوو پێکهێنا.



# بوك گواستنەوە

لەرۆژی بووك گواستنەوەدا،خەڵكێكی زۆر بانگهێشت كرابوون و ژمارەیەكی زۆر ئاژەڵیان كوشتەوە، هەموو چین و توێژێكی شارەكە بەشداری ئاهەنگ و سەر خوانەكەیان كرد، خانەوادەی موحەممەد(درودی خودای لەسەربێت) لەگەڵ چەندین خۆشەویستان و دۆستان تا دڵی بووك ئارام و سەرەوتوبێت یاوەری بوون بۆ ماڵی تازەی، پاش ماوەیەك بووكیان لەژێر چاودێری زاوا جێهێشت و گەڕانەوە بۆماڵی خۆیان.

ژیانی زەینەب و خوشكەكانی لەماڵی باوكی زۆر ئاسوودەو كامەران بوو، هەموویان بەچاوی پڕ لەڕێزو خۆشەویستی سەیری زەینەبیان دەكرد، ئیتر دوای شووكردنی ئەو، بەهۆی دابڕانی زەینەبەوە، خوشكەكانی هەستیان بەپەستی و نیگەرانی دەكرد، چەند شەوێك دوای گواستنەوەی زەینەب، كاتێ چاویان بەپێخەف و جێگای بەتاڵ و چۆڵی ئەو دەكەوت، كپ و بێدەنگی بەرەو هەستێكی نامۆی دەبردن، ئیتر خەو لە چاوەكانیان دەتۆرا، بیریان لەشووكردنی كچان دەكردەوە، چۆن لەكەس و كاریان دادەبڕێن، بەتەنیا لەگەڵ پیاوێكی نامۆو بێگانەدا دەژین.

بەڵام فاتیمە لەبەرئەوەی لەهەموویان بچوكتر بوو، بۆیە هیچ شارەزاییەكی سەبارەت بەشووكردنەوە نەبوو، سەرەڕای ئەوەش زۆر ڕقی لێ دەبووەوە، چونكە زەینەبی دایكی بچووكی لەدەست دابوو، زەینەب هەمیشە پەروەردەی دەكردو یاری لەگەڵ دەكرد، بۆیە لەهەردوو خوشكەكەی تری دەپرسی و دەیگووت:

ئەرێ ئەوە چۆن خێزانەكەمان ئاوا بەئاسانی پێشوازی لەم بەشوودانە كردو ئاهەنگی بۆگێڕا، كەچی چاكتر وابوو زەینەبیان پێنەدابان، یان دەبوایە ئاهەنگیان نەگێڕابا.

ڕوقیە دەیزانی فاتیمەی خوشكی بەشووكردنی زەینەب زۆر نیگەرانە، بۆیە

وویستی نەختێك هێوری بکاتەوە، پێی گووت:

ئەو ئاهەنگەی سازکرا بۆ خۆشی و بەختەوەری زەینەب بوو، ئەگینا باوك و دایکمان هەرگیز لەئاهەنگێکی ئاوادا زەینەبیان نەدەدا بەهاوسەرەکەی، بەلام فاتیمە سەبارەت بەشوو کردنەکە لەسەر بۆچوونەکەی خۆی بەردەوام بوو، ئوم کەلسوم دەمی کردەوە بەخوشکەکانی گوت:

کێ دەڵێ ئاهەنگ و بەزمی بووك گواستنەوە بۆ مەبەستی ئەوە نیە بووکەکە لەخشتە بەرن؟! تا بیر لەم گۆڕانکاریەو ئەزموونە نوێیە نەکاتەوە کەڕوبەڕووی دەبێتەوە، چونکە ئەو ژینگەیەی تێیدا گەشەی کردووەو سەردەمی خۆشی منداڵی تێدا بردۆتەسەر، بە ژینگەیەکی تری جیاواز دەگۆڕدرێتەوە.

سەیری کرد بینی فاتیمەی خوشکی ئەم قسەیەی بەدڵە، بۆیە لەسەر ڕایەکەی خۆی بەردەوام بوو، هەروەها سەرنجی هەردوو خوشکەکەی بۆ پەستی و غەمگینی دایکیان ڕاکێشا، چۆن بەدابڕانی زەینەب هەمیشە پەست و خەفەتبارە، بەلام ئاشکرای ناکاتو دەری نابڕێت، ئەگینا لەڕوخساریدا ڕەنگدانەوەی دیارە، دوایی پرسیاری کرد، گوتی:

ئایە گوێتان لێنەبووە دایکم چەندجار بە هەڵە بانگی ڕوقیە دەکات و دەڵێ: زەینەب، پاشان لەپڕ ئاگادار دەبێتەوەو بەبیری دێتەوە، بەدەنگێکی بێ هێزو لاواز دەڵێ وەی لەمن! خۆمن لەبیرم نیە زەینەب لێرە نەماوە.

فاتیمە بەدەنگێکی پڕ لەتاسەوە گوتی:

ئەوەی تۆ دەڵێی وایە.

بەلام ڕوقییە پێیگوت:

نەخێر ئوم کەلسوم ئەم بۆچوونەت هەڵەیە، چونکە لەڕاستیدا دایکم زمانی لەناوی زەینەب ڕاهاتوە، بۆیە ئەگەر ئەم ناوەی هاتەسەر زار بەشتێکی سەیرو نامۆی مەزانە، لەبەر ئەوەی ئەمە لای هەموو خەڵك باوەو هەمیشە ڕوودەدات.

بەڵام ئوم کەلسوم دووبارە گوتی:

ئەگەر دایکم لەسەر ناوی زەینەب ڕاهاتوە، ئەی سەبارەت بەباوکم چ دەڵێی؟، سەرنجت نەداوە چۆن ماوەیەکە حەز بەتەنیایی دەکات، دەیەوێت لەخەڵك دوور دەکەوێتەوە، دیارە ئاواتێك و ئارەزوویێکی شاراوەی لە دڵدا هەیە، بۆیە هەمیشە کپ و بێدەنگەو تەنیا خەریکی بیرکدنەوەیە.

فاتیمە بەدەنگێکی پڕ لەسۆزەوە گوتی:

وەی بۆ باوکی خۆشەویستم، ئوم کەلسوم تۆ ڕاست دەکەیت، ماوەیەکە هەمیشە کزو کپ و بێ دەنگە.

ڕوقییە گوتی:

ئێوە چۆن دەزانن دابڕانی باوکم و دوور کەوتنەوەی لەچاوی خەڵك، پەیوەندی بە شووکردنی زەینەبەوە هەیە؟!.

ئوم کەلسوم سەری هەژاند، بەگاڵتەوە گوتی:

پێموایە ڕوقییە تۆش خۆت بۆ چارەنووسێکی وەك زەینەب ئامادە دەکەیت، ئیتر نۆرەی تۆ هاتووە.

ڕوقییە لەسەرخۆ گوتی:

خوشکەکەم هەرگیز بیرم بۆ ئەم شتە ناچێت.

فاتیمە گوتی:

خودا شووکردنی ئێوە پیرۆز بکات، بەڵام من تا بۆم بلوێت و ڕێگاچارەیەکم هەبێت هەرگیز باوکم و دایکم جێناهێڵم.

فاتیمە نەیدەزانی ئەم قسەیەی لەگەڵ ویست و فەرمانی خودای مەزن یەك دەگرێتەوە، چونکە دوای شووکردنی زەینەب، کاتێکی زۆری نەخایاند ڕوقییە و ئومکەلسوم هەردوو شویانکرد، ئەو لەماڵی باوکی مایەوە.

# بەختەوەری و باوەڕهێنان

خۆشەویستی لەنێوان زەینەب و ئەبولعاسی هاوسەری ڕۆژ لەدوای ڕۆژ پەرەی دەسەند، لەئاکامدا لەسایەی ئەم خۆشەویستیە ژیانێکی پڕ لەشادی و بەختەوەریان دابینکرد، هەمیشە بەئاسوودەیی گوزەرانیان دەکرد.

بێگومان ئەبولعاس خەریکی کاری بازرگانی بوو، ئیتر بۆ بەدەستهێنان و پەیداکردنی بژێوی ژیانیان ناوەناوە لەخێزانەکەی دوور دەکەوتەوە، بەڵام هەمیشە دڵی لای زەینەبی هاوسەری جێدەما، زەینەبیش کاتێ ئەبولعاس دەچوو بۆ گەشت ڕووی لەماڵی باوکی دەکردەوە، ئەو ماڵەی چاوەڕانی ڕۆژگارێك و ئاییندەیەکی شاراوەو نادیار دەکات، چۆن باوکی ماوەیەکە زۆر بیر دەکاتەوە، هەمیشە حەزدەکات دووربێت لەچاوی خەڵك و بەتەنیا بژیت، ڕوو لە ئەشکەوتی(حراء )دەکات، دایکیشی هەوڵ دەدات ژیانێکی ئاسوودە و ئارام و ژینگەیەکی سەرەوتوو بۆ باوکی دابین بکات.

ئەو کاتەی ئەبولعاس لە گەشتی بازرگانی بوو، زەینەب زۆربەی کارەکانی ڕۆژانەی ماڵی باوکی ڕادەپەڕاند، بۆ ئەوەی دایکی کاتی زیاتری هەبێت بۆ دابینکردن و ئامادەکردنی پێداویستیەکانی باوکی، تەنانەت ئەوکاتەی ئەبولعاس لە گەشتەکەی دەگەڕایەوە ئەوکاتە زەینەب دەچووەوە ماڵی خۆی، پەرێشانی و نیگەرانی خۆی لای هاوسەرەکەی دەدرکاند بۆ ئەم ماوەیەی لەیەکتری دابڕابوون، ئەویش دڵنەوایی پێ دەبەخشی و هەندێ لەو شیعرو پەخشانانەی بۆ دەخوێندەوە لەمیانەی گەشتەکەو دابڕاندا هۆنیبویەوە.

ڕۆژگار هاتوو ڕۆیشت، خوای بەخشندە دوو منداڵی ژیکەڵەی پێ بەخشین، گەورەکەیان کوڕێك بوو ناویاننا(عەلی)، دوای ئەویش کچێکیان بوو(ئومامە)، ئیتر لە ژیانێکی ئاسوودەو پڕ لە شادی و بەختەوەریدا دەژیان.

ڕۆژێکیان ئەبولعاس چوو بۆ گەشتی بازرگانی، زەینەب وەك هەموو جارێك

بەیانی زوو چوو بۆ ماڵی باوکی، لە بەردەم ماڵی باوکیدا سەیری کرد بینی دایکی لە سەردانێکی ناوەختدا لە ماڵی وەرەقەی کوڕی نەوفەلی ئامۆزای دەگەڕێتەوە، زەینەب هەرگیز دایکی بەمجۆرە ئاوا بەسەرقاڵی و پەشۆکاوی نەبینوو، تەنانەت هەستی کرد دایکی لەبەر بیر کردنەوە هیچ ئاوڕ نەداتەوەو ئەو نابینێت، بەڵکو یەکسەر ڕووی لە شوێنی هاوسەرەکەی کردو چووەلای ئەو، تا ماوەیەک لەوێ مایەوە دوای ئەوە هاتەوەلای کچەکانی.

دایکی بابەتێکی زۆر سەیرو نامۆی سەبارەت بەباوکی بۆ گێڕانەوە، پێیگوتن باوکتان ئەمشەو لە ئەشکەوتی(حەڕاء ) سروشی(وەحی) بۆدابەزیوە، زەینەب کاتێ ئەمەی بیست نەیزانی چی بڵێت، چونکە ئەم کارە لەناست بیرو بۆچوونی ئەودا نەبوو، بۆیە لەشوێنی خۆی هەڵنەستاو جوڵەی نەکرد، هەست و بیری پەرش وبڵاوبوو، نەیزانی لەچ ڕووێکەوە بیر لەم هەواڵە سەیرە بکاتەوە، هەستی کرد لە دەریایێکی لێڵ و تاریکدا مەلە دەکات، نازانێت چۆن تیایدا بپەڕێتەوە، تەنانەت لەگەڵ دەنگی فاتیمەی خوشکی هوشیار بۆوە کاتێ گوتی:

ئەرێ خوشکم حەزناکەیت تۆ کچی پێغەمبەری ئەم نەتەوەیەبیت؟.

زەینەب بە بێ دەنگی سەیری فاتیمەی کرد، دوایی گوتی:

ڕاستە فاتیمە، هەموو کچێك حەز لەو شکۆمەندیە دەکات، بەڵام بۆیە نیگەرانم دایکم دەڵێ خاڵە(وەرەقە)گوتوویەتی خەڵك باوکم بەدرۆ دەخەنەوە، ئازارو ئەشکەنجەی دەدەن، ئاوارەو دەربەدەری دەکەن، لە گەڵیدا دەجەنگێن.

فاتیمە بیری لەئازاردانی باوکی کردەوە زۆر نیگەران و دڵپەست بوو، دوایی سەری بەرزکرد و بە زەینەبی گوت:

گوێم لێبوو دایکم بە باوکمی گوت:

باوکی قاسم، خودا چاودێریمان دەکات و ئاگادارمانە، مژدە ئامۆزا خۆڕاگربە، بەخودا هەرگیز پەروەردگار تۆ ڕووزەردو شەرمەزار ناکات، تۆ هاموشۆی خزمان



دەکەیت، پیاوێکی ڕاستگۆ و ئەمینی، ڕێـزت هەیـە بـۆ میوانـان، یارمـەتی ستەمدیدە دەدەیت.

زەینـەب و فاتیمـە نەیانـدەزانی دواڕۆژ چ نهێنییێکـی تێـدا حەشـاردراوەو چـۆن دەبێت، بەڵام زەردەخەنەیەك لێوەکانی لەیەکتر ترازاندن.

## نیگەرانی و دوو دڵی

ئـەبولعاس لەگەشـتە بازرگانیەکـەی گەڕایـەوە، لەسـەرەتای گەیـشتنی بـۆ شـاری مەککە هـەواڵی ئاییـنی نـوێی موحەممـەدی کوڕی عەبـدوڵڵای بیـست، چـۆن گوایـە ئاینێکی نوێی بە سروش پێ ڕاگەیاندراوە!.

خێرا زۆر بەپەرۆشەوە ڕووی لەماڵەوە کرد، زەینەبی هاوسەری بەڕووێکی گەش و پڕ لەشـانازیەوە هـەواڵی پێغەمبەرایـەتی بـاوکی بەڕاسـتی و دروسـتی پێڕاگەیانـد، بەڵام بینی ئەبولعاس کپ و بێدەنگ دانیشتوەو هیچ وەڵامێك و سەرنجێکی سەبارەت بەم هەواڵە گرنگە نیەبۆیە گوتی:

کوڕە پوورەکەم چیتە، بۆ ئاوەها کپ و بێدەنگ بوویت؟.

ئەبولعاس زەینەبی گرتە باوەشی و گوتی:

ئازیزەکەم هیچ نیە، بەڵام من دەترسم!.

ئەختێ بێ دەنگبوو، دیسان گوتی:

ئایینی بـاوك و بـاپیرانی جێهێـشتوە بـۆ ڕەزامەنـدی ژنەکـەی و چـەند کەسـێکی دەوروبەری، ئەگەر سەرپێچی بکات ......... .

زەینەب نەیهێشت وتەکەی تەواو بکات پێیگوت:

بەڵکو بە پێچەوانەوە تۆ هەوڵ بدە بێیتە سـەر ڕێگـای ڕاسـت و ڕەوا، بـە قـسەی خەڵك گومڕاو سەرگەردان مەبە، پاش ئامۆژگارییێکی زۆر زەینەب گوتی:



کوڕە پوورەکەم من باوەڕم بە ئایینی نوێ هێناوەو بوومەتە موسڵمان.

ئەبولعاس کە ئەمەی بیست کشایەوە دواوەو گوتی:

زەینەب چۆن ئەم کارەت کردوە!؟.

زەینەب گوتی:

هەرگیز باوکم بەدرۆ ناخەمەوە، چونکە بە دڵنیاییەوە دەزانم پیاوێکی ڕاستگۆو ئەمینە.

ئەختێ بێ دەنگبوو، دوایی گوتی:

دایکم و خوشکەکانیشم باوەڕیان بە ئایینی نوێ هێناوەو بوونەتە موسڵمان، هەروەها عەلی کوڕی مامم ئەبوتالیبیش، لەگەڵ ئەبوبەکر، لە هۆزەکەی تۆش عوسمانی کوڕی عەففانی کوڕی ئەبوعاسی کوڕی ئومەییەی کوڕی عەبدوشەمس و زوبەیری کوڕی عەوامی کوڕی خوەیلد واتە کوڕی خاڵت باوەڕیان بە ئایینی باوکم هێناوە.

هەرچەندە شێوەی ئەبولعاس لەوە دەچوو گوێی لە زەینەب نەگرتبێت، بەڵام وێڕای ئەمەش بە دەنگێکی پڕ لەتاسەو گلەییەوە هاتە ئاخاوتن و گوتی:

زەینەب کاتێ باوەڕت بەم ئایینەی باوکت هێنا ئایا بیرت لە ئایندەو دوارۆژی خۆمان نەکردەوە؟، ئەگەر من لەسەر ئایینی باوك و باپیرانم بمێنمەوە، ئاخۆ ئەنجام و ڕەنگدانەوەی ئەم کارەی تۆ چی دەبێت و چی ڕوودەدات؟.

زەینەب سەری هەژاندو گوتی:

ئەخێر کوڕە پوورەکەم هەرگیز بیرم لە ئایندەی خۆمان نەکردۆتەوە، بەڵکو تکا دەکەم و ئاواتەخوازم تۆش لەپێشەنگی موسڵمانان بیت، وەك عوسمانی ئامۆزات و زوبەیری کوڕی خاڵت.

ئیتر دوای ئەمە ئەبولعاس بە خەفەت و نیگەرانیەوە چووە دەرەوە، بەرەو خانەی کۆڕو دانیشتنی قوڕەیش واتە(دارالندوە)چوو، تابزانێت دواترین هەواڵ و

پێشهاتەکانی ئایینی نوێ چیەو کاریگەری و ڕەنگدانەوەی لەناو سەرجەم شاری مەککەدا چۆنە.

زەینەبیش لەماڵەوە زۆر بەنیگەرانی و خۆزگەو ئاواتەوە چاوەڕوانی وەڵامی هاوسەرەکەی دەکرد، تاریکی شەو باڵی بەسەر زەویدا کێشابوو کاتێ ئەبولعاس گەڕایەوە ماڵەوە، کپ و بێدەگ و پەست و غەمگین و نائارام دیاربوو، تەنانەت سەری بەرز نەکردەوە، زەینەب نەیوویست باری دەروونی لێڵ ترو نیگەرانتر بکات، بۆیە نەیدواند و بە هێمنی دانیشت، بەڵام ئەبولعاس پاش نەختێك بە دەنگێکی شپرزەو غەمبارەوە گوتی:

زەینەب ئەمڕۆ باوکتم لە کەعبە بینی، داوای لێکردم موسڵمانبم و باوەڕ بە ئایینەکەی بێنم.

دوای ئەوە بێدەنگبوو باسی ئەنجامی دیدارەکەی نەکرد، بەڵام لەشێوەی پەستی و نیگەرانیەکەی زەینەب زانی وەڵامەکەی چیبووە.

ئیدی تا دوو بەشی ئەم شەوەیان بەڕێ کرد هەردووکیان کپ وبێ دەنگ دانیشتن، هەمیشە خەریکی بیرکردنەوە بوون، تەنانەت شەکەت و ماندووبوون، دوایی بەدڵێکی هەراسان و پڕ لەتاسەو ئاوات و ترس و پەژارەوە خەریکبوون بچنە ناو پێخەفەکانیان، لە کاتی هەستانەوەیاندا لەیەکتر نزیك کەوتنەوە وویستیان دەست لەملی یەکتری بکەن، بەڵام چۆن بڵێی بەربەستێکی شاراوەو نادیار لە نێوانیاندا هەبێت، لەپڕ لە یەکتر دوور کەوتنەوەو هەست و سۆزیان بۆلای یەکتری نەچوو، ئیدی ئەم شەوە ئەو دوو هاوسەرە خەو لە چاوەکانیان تۆرا، بگرە چەند شەوێکی دیکەش پێڵوی چاوەکانیان تامی خەویان نەچەشت، تەنیا ئەوەندەبێت ئەگەر لەشکری خەو هێرشێکی زۆر بەهێزی بۆ هێنابن، ڕەنگە ئەو کاتە سەرخەوێکی پچڕپچڕو کەمیان بە پەشۆکاوی شکاندبێت.

شەوێك ئەبولعاس سەرنجیداو بینی زەینەب زۆر خەفەتبارە، بۆیە پێیگوت:

بەخودا من باوكت بەتاوانبار نازانم، بگرە هیچ شتێكیش بەلای منەوە لەمە خۆشتر نیە لەگەڵ تۆی ئازیزدا هەمان ڕێچكەو ئایینزا بگرمەبەر، بەلام بۆیە باوەڕناهێنم، نەوەك خەڵك بڵێن ئەبولعاس بۆ ڕەزامەندی ژنەكەی باوەڕی بە ئایینی نوێ هێناوەو ملی بنەماڵەكەو هۆزەكەی شۆڕكردوە، ئازیزەكەم دەتۆش وەكو من بیربكەرەوەو لەمن تێبگە، هەڵوێستی منیش وەكو هەڵوێستی ئەبوتالیبی مامت بێنە بەرچاوت، چۆن لەسەر ئایینی باوك و باپیرانی ماوەتەوە كەچی موحەممەدی لەكوڕەكانی خۆی خۆشتر دەوێت، وێڕای ئەمەش هیچ گومانی لە ڕاستگۆیی موحەممەد نیە.

بەم وتانەی ئەبولعاس، زەینەب فرمێسكی چاوەكانی قەتیس وەستا، چونكە زانی ئەم هەورە ڕەشەی نائومێدی بەم زوانە نا ڕەوێتەوەو ناڕوات، هەروەها خەدیجەی دایكی هەمیشە ئاواتەخوازبوو ئەبولعاس باوەڕ بەئایینی نوێ بێنێت، بەلام ئەم هیواو ئاواتەیان نەهاتەدی.

# دژایەتی كردنی موسڵمانان

قوڕەیشیەكان دەستیانكرد بە دژایەتی و دوژمنایەتی كردنی پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت)، كەوتنە ئازارو ئەشكەنجەدان و چەوساندنەوەی شوێنكەوتوانی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێت)، تەنانەت برینداریان كردن، لەكۆتاییشدا لەناو ماڵ خێزانەكانیان دەربەدەریان كردن، بەمەش نەوەستان، بەڵكو دەستدرێژیان كردەسەر بنەماڵەی هاشم و نەوەكانی عەبدولموتەلیب، چونكە موحەممەدیان نەدایە دەست كافرەكان، ئیتر بە شێوەیەكی دڕندانەو نامرۆڤانە ئابلووقەیەكی سەخت و دژواریان خستە سەر موسڵمانان و نەوەكانی ئەو دوو ڕەچەڵەكە، ناوەڕۆكی ئابلووقەكە لە لاپەڕەیەك نووسرایەوەو لە دیوارەكانی (كەعبە) هەڵواسرا، بەمەش

نەوەستان سەرجەم موسڵمانان و هاشمیەکانیان لە دۆڵە چیای (ئـەبوتالیب) کۆکردەوە، ئیدی تا سێ ساڵ لەم دۆڵە چیایەدا بـە مەرگەسـاتی و قـاتوقڕی و دەردەسـەری ژیانیـان بردەسەرو مانەوە.

هەرچەندە زەینەب نەچووبوو بۆ ئـەم دۆڵە چـیایەو ئابلووقـەی لەسـەر نـەبوو، بـەڵام ڕۆژانــە هــەواڵ و ســەرو ســەربردەی کەســوکارو موســڵمانانی پــێ دەگەیــشت، دەیزانی لەچ جۆرە قاتوقڕی و دەردەسەریدا دەژین و گوزەران دەکەن، بۆیە هەمیشە خەفەتبارو نیگەران بوو بۆیان.

قـەیرانی ئابلووقەکـە درێـژەی خایانـد، تروسـکایی هیـوای تێـدا بـەدی نـەدەکرا، شـەوە زەنگێکـی تاریـك و نـەبڕاوەبوو کۆتـایی نـەدەهات، سـێ سـاڵ بـوو ئـەم لاپەڕەیـەی پەیماننامەی ئابلووقەکەی تێدا نووسرابوەوە لە دیواری کەعبەی پیرۆز هەڵواسرابوو، تەنانــەت ڕۆژێــك قورەیــشیەکان ســەیریان کــرد بینیــان(مۆرانەــ مێروولــەی ســپی) پەیماننامە نووسراوەکەی خواردوە، ئینجا ئەو کاتە ئابلووقەکەیان لەسەر موسڵمانان هەلگرت.

# نیگەرانی و نا ئارامی

شەش مانگ دوای هەڵگرتنی ئابلووقەکە ئەبوتالیب کۆچی دوایی کرد، تەنیا سێ ڕۆژ دوای مردنـی ئـەو، دایکـی یەکـەمی موسـڵمانان و پـەروەردەکارو بەرێوەبـەری خانــەوادەو هەڵــسوڕێنەری کاروبارەکــانی پێغەمبــەر(درودی خــودای لەســەربێت) خەدیجەی مەزن ـ خـودا لێڕازیبێت ـ کۆچـی دوایـی کـرد، ئیـدی بـەمردنی ئـەم دوو کەسـایەتیە بـەهێزە، هیـوای مـردووی قورەیـشیەکان سـەبارەت بەسـەرکەوتن و زاڵ بـوون بەسـەر موحەممـەد(درودی خـودای لەسـەربێت)و موسڵمانان زینـدوو بـووەوە، ماوەیــەکبوو دوای نــەمانی ئابلووقــە شــوومەکە قورەیــشیەکان دەســتیان لــە ئەشــکەنجەدان وئــازاردانی موســڵمانان هــەلگرتبوو، بــەڵام دوای مردنــی ئــەم دوو



کەسایەتیە، ئیتر کەوتنەوە گیانی موسڵمانان، بەڵام ئەمجارەیان زۆر لە جارانی پێشوو دژوارترو توندو تیژتربوو.

لەم قۆناغەدا موسڵمانان ڕووبەڕووی توندترین ودژوارترین ستەم و ئەشکەنجەو ئازار بوونەوە، نەیانتوانی چیتر خۆیان لەبەر ئەم توندو تیژیەی قورەیشیەکان ڕابگرن، بەڵکو بۆ ڕزگار کردنی جەستەو بیرو باوەڕیان ناچاربوون یەك لەدوای یەك کۆچ بکەن، تەنانەت لە ئەبوبەکری صدیق و عەلی کوڕی ئەبوتالیب بەملاوە کەس لەگەڵ پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) لە مەککە نەمایەوە، بەڵکو سەرجەم یارو یاوەرانی کۆچیان کرد بۆ شاری مەدینە.

ڕۆژێك زەینەب بیستی سەرانی قورەیش بەنیازن بە بەشداری هەموو تیرەیەك و بنەماڵەیەکی قورەیش موحەممەد(درودی خودای لەسەربێت) بکوژن و لەناوی بەرن تا لەچنگ ئاینەکەی ڕزگاربن و بحەسێنەوە، کەچی چەند ڕۆژێك دوای ئەم پلانە زەینەب سەری سوڕمابوو کە سەرجەم خەڵکی مەککە باسی ڕزگاربوونی باوکی دەکەن، چۆن بە یاوەرێتی یاوەری خۆشەویستی ئەبوبەکری صدیق(خودا لێیڕازیبێت) کۆچیان کردوە، قورەیشیەکان بەرد بەبەرد و بست بەبست چیاو دەشتی ناوچەکەیان تەنیوەو پشکنیوە نەیاندۆزیونەتەوە، زەینەب بەم هەواڵەو ڕووداوە زۆر نیگەران و پەرێشان بوو، دەترسا قورەیشیەکان باوکی و یاوەرەکەی بدۆزرێنەوەو بیانکوژن، بۆیە هەمیشە زۆر بە پەرۆش بوو بۆ بیستنی هەر هەواڵێك سەبارەت بەباوکی خۆشەویستی، تەنانەت دوای چەند ڕۆژێك هەواڵی گەیشتنی باوکی لەناو شاری مەککەدا بڵاو بووەوە، چۆن موحەممەد خۆی و ئەبوبەکری یاوەری گەیشتوونەتە لای یاوەران و لایەنگرانی لەشاری مەدینە.

باوکی پاش ماوەیەك بە نهێنی نێردراوێکی ڕاسپارد ئومکەلسوم و فاتیمەی گەیاندە لای باوکیان لە شاری مەدینە، بەڵام زەینەب لای ئەبولعاسی هاوسەری مایەوە، چونکە ئەو کاتە هێشتا ئاینی پیرۆزی ئیسلام فەرمانی لەیەکتر جیاکردنەوەی هاوسەرانی موسڵمان و کافری دەرنەکردبوو، زەینەب بەتەنیا لە

مەککە مایەوە، کاتێ سەیری خانووی ماڵی باوکی دەکرد چۆن دەرگاکەی داخراوە، جگە لەتارمایی وێنەی خەیاڵاوی خۆشەویستان وئازیزانی بەملاوە هیچی تری تێدا بەدی نەدەکرد، بەنائومێدی دەیگوت ئەرێ کوا ئەوانەی دوێنێ ئەم خانوبەرەیان پڕ شادی و کامەرانی کردبوو ئێستاکە لەکوێن؟کوا موحەممەد(درودی خودای لەسەربێت)و کوا خەدیجە، کوا ڕوقییە و کەلسوم و فاتیمە؟ کوا قاسم و عەبدوللا؟، بەڕاست هەموویان کۆچیان کردوە، بەڵام بەداخەوە خەدیجەو دوو کوڕەکەی ئیتر هەرگیز ناگەڕێنەوە، موحەممەدو کچەکانیش دەربەدەرو ئاوارەبوونە بەنامۆیی گوزەران دەکەن، دوای ئەوەی گرکانی دەروونی جۆشی سەند لەبێ کەسی و لانەوازی رووی لە گۆڕی دایکی کردو باوەشی کرد بە گۆڕەکەیدا، بە ئەسرینی چاوەکانی ئاوڕشێنی کرد، تەنانەت دڵی ئۆقرەی گرت و سرەوت هەر گریا، دوایی کپوبێدەنگ بوو بە غەمباری چاوەکانی مۆڵق وەستابوو، سەیری گۆڕی دایکی دەکرد، کەوتە ناو دەریای ئەندێشەوە، دەیگوت زۆر سەیرە کەسوکارو ئازیزە زیندووەکان دووربن و مردووەکان دراوسێ و نزیکتبن، ئیتر ژیانی پڕ شادی و بەختەوەری و ئاسوودەیی رابردووی هاتەوە یاد و بیرکەوتەوە، هەناسەیەکی قووڵی بێ ئومێدی هەڵکێشا، چونکە ئەگەر ئەبولعاسی هاوسەری باوەڕی بەئایینی باوکی بهێنابوایەبێگومان لە باوك و خوشکەکانی دانەدەبڕا، بەتەنیا لەمەککە نەدەمەیاوەو ئێستا لە مەدینەبوو.

## دیل کردنی ئەبولعاس

موحەممەد(درودی خودای لەسەربێت) لەشاری مەدینە مزگەوت، خانوو، جیگاوڕێگا، وێڕای ئەمەش یارمەتیدەرو لایەنگری زۆری پەیدا کرد، یاوەرە کۆچبەرەکانی ماڵ و سامانی خۆیان لە مەککە جێهێشتبوو، بۆیە لە تۆڵەی ئەمە دەیانەوێت ڕێگای بازرگانی گرنگ و سەرەکی نێوان مەککەو شام بخەنە ژێر کۆنترۆڵی خۆیان و لە قوڕەیشیەکانی قەدەغە بکەن، ڕۆژێك هەندێ لە یاوەران

توانیان لەسەر ئەم ڕێگا سەرەکیە، دەست بەسەر کاروانێکی بازرگانی قورەیشیەکاندا بگرن، کاروانەکەو هەندێ دیلیان هێنایەوە مەدینە، (عەمری ئەلحەضرەمی) سەرکردەی کاروانەکەبوو کوژرا، تەنانەت لاشەکەی لە بیاباندا مایەوە.

قورەیشیەکان هەمیشە دوودڵبوون و باوەڕیان نەدەکرد ئەم ژمارە کەمەی شوێن کەوتووی موحەممەد، لە ئاوارەیدا بتوانن بێ چەك و ماڵ و سامان دەست درێژی بکەنە سەر کاروانە بازرگانیەکان، بەڵام لەناکاو ڕۆژێك سەرجەم دانیشتوانی مەککە بە هاوارو دادی (چەمچەم کوڕی عەمری ئەلغەفاری) ڕاچڵەکین، ئەم پیاوە لەگەڵ ئەبوسوفیان بۆ بازرگانیەتی چووبوو بۆ وڵاتی شام، کاتێ گەیشتەوە شاری مەککە لەسەر پشتی وشترەکەی وەستاو کراسەکەی دادڕی و بڕ بەدەم هاواری کردو گوتی:

ئەی هاوار کۆمەڵانی قورەیش ئیتر کاتی شین و ماتەمە، ئەو ماڵ وسامانەی لای ئەبوسوفیان بوو، موحەممەدو یاوەرانی بەرنگاری بوون، پێموایە بەهانای ناگەن و بۆتان ڕزگار ناکرێت، ئەی هاوار ، ئەی هاوار.

ئیدی لەهەموو لایەکەوە خەڵك گوتیان:

بۆ موحەممەد و یاوەرانی پێیانوایە کاروانەکەی ئەبوسوفیانیش وەکو کاروانەکەی کوڕی ئەلحەضرەمیە؟، نەخێر بەخودا دەبێ بزانن ئەمە ئەو نیە.

زەینەب بەم هەواڵە نیگەران و پەشۆکاو بوو، چونکە زانی جەنگ و پێکدادان لە نێوان موسڵمانان و قورەیشیەکان ڕوودەدات و بەرپادەبێت، بێگومان باوکی، پێغەمبەری خودا (درودی خودای لەسەربێت) لە لایەنی یەکەمدایە، ئەبولعاسی باوکی عەلی و ئومامە جەنگاوەری لایەنی دووەمە، بۆیە ئەم شەوە لەشاری مەککەدا کەس لە زەینەب نیگەرانترو غەمبارتر نەبوو، بەیانی لەگەڵ گزنگی خۆر زەینەب سەیری لەشکری قورەیشیەکانی کرد، ژمارەیان هەزار جەنگاوەربوو، بەرەو شاری مەدینە ڕۆیشتن، هەموو پێداویستی و کەلوپەل و تفاقی جەنگیان بۆ فەراهەم

کرابووهیچ کەموکوڕیەکیان نەبوو، زەینەب بیری لە لەشکری باوکی کردەوە، ئاخۆ ژمارەیـان چـەند کەسـە؟ سەدێدووسـەدێیان سـێ سـەد کەسـە؟، سـەرەڕای ئەمـەش نەیدەزانی ئەنجامی ئەم جەنگە نا بەرامبەرە ترسناکە چۆن دەبێت؟.

ئیتر بەنائومێدی و نیگەرانیەوە گەڕایەوە لای عەلی و ئومامە، بە چاوێکی پڕ لە فرمێسك و بەدڵێکی بەژانەوە لایلایەی بۆ دەگوتن و لاواندنـەوەی بـۆ دەنواندنـەوە، بەڵکو خەو بیانباتەوە، دوایی بەهێمنی و بەدەنگێکی پڕ لەتاسەو ئاواتەوە گوتی:

ڕۆڵەکانم پێموایە ڕۆژانی داهاتو یان من هەتیو دەبم یان ئێوە.

فرمێسکەکانی چاوی قەتیس وەستابوون، چاوەڕوانی ئایێندەو چارەنووسی خۆی دەکرد، ڕۆژانی دواتر حەزی نەدەکرد هەواڵ و باسوخواسی جەنگ وکوشتار لـەدەمی کەس ببیسێت، چونکە پێیوابوو زەینـەبی کچی موحەممـەد یان هـەتیوبوون، یان بێوەژنێتی چاوەڕوانیەتی.

دوای چـەند ڕۆژێـك زەینــەب بــەداماوی دانیــشتبوو،لەپڕ عاتیکــەی کـچی عەبدولموتەلیبی پووری باوکی هاتە ژوورەوەو گوتی:

زەینەب ئەم هەواڵە سەیرەت بیستوە؟.

زەینەب بە چاوێکی پڕ لـە نائومێـدی و دوودڵیـەوە سـەیری کـردو هـیچ وەڵامـی نەدایەوە.

پوورە عاتیکە دووبارە هاتەوە ئاخاوتن و گوتی:

موحەممەد ویاوەرانی سەرەڕای کـەمی چـەك و ژمارەیـان، سـەرکەوتنیان بەسـەر قورەیشدا بەدەست هێناوە.

زەینەب بەبیستنی ئەم هەواڵە ڕاچڵەکی و بە دەنگێکی بەرز گوتی:

باوکم سەرکەوت!، ئای لەم خۆشی و شادیە.

بەڵام لەناکاو ئەبولعاسی هاوسەری بیرکەوتەوە، ئـیتر هـەردوو منداڵەکـەی گرتـە باوەشی، لە ناخیدا قوڵپی گریانی سەرکەوت و لەپرمەی گریانیدا.



پوورە عاتیکە خێرا موژدەی پێداو گوتی:

ئەبولعاس نەکوژراوە، بەڵکو ئێستا لای خەزوورە دڵ فراوانەکەی بەدیل گیراوە.

کاتێ زەینەب ئەمەی بیست، باوەشی بە ملی پووریداکرد، ماچی کرد، لەخۆشیا فرمێسکی شادی دەباراند، بە بیستنی ئەم هەواڵە دڵی ماندوو کۆست کەوتووی ئۆقرەو ئارامی گرت.

ئیتر دوای گەڕانەوەی لەشکرە بەزیی و دۆڕاوەکەی قوڕەیش، زەینەب ئینجا سەرجەم باسوخواس و ڕووداوەکانی جەنگی زانی، چۆن ئەم لەشکرە لاشەی سەرکردەو کورە جەربەزەکانی لەدەوروبەری ئاوی (بەدر) جێهێشتووەو بە ملشۆڕی گەڕاوەتەوە مەککە.

هەروەها ناوی دیلەکان بڵاوبووەوەو زانرا، ئیدی کەسوکاریان هەوڵیاندا ماڵ و سامان کۆبکەنەوە بۆ ڕزگار کردن و بارمتە کردنیان، ئەبولعاس پیاوێکی دەوڵەمەندبوو، بۆیە خزمەکانی خەریکبوون لەبری ئەو سامانێکی زۆر دابین بکەن، بەڵام زەینەب ویستی شتێکی لە ماڵ و سامان بەهادارتر بکاتە بارمتەو فەرمبووی ئەو.

دیلەکانیان بردن بۆشاری مەدینە، پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) بەوردی سەیری کردن، پاشان بەسەر یاوەرەکانیدا دابەشی کردن، بۆ ئەوەی هەریەکێك دیلێك بەخێو بکات و فەرمووی لەگەڵ دیلەکان چاك بن، بەڵام ئەبولعاسی زاوای لای خۆی هێشتەوە، ئیتر ئەبولعاس لای پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) مایەوە، تەنانەت ئەو کاتەی نوێنەرانی قوڕەیش هاتن پول و سامانیان بەخشی لە بری ڕزگار کردنی دیەلەکان، بەهای دیلەکان لەسەر شانی قوڕەیشیەکان زۆر قورس وەستا، چونکە لەنێو خۆیاندا بەتایبەتی ژنەکانیان شانازیان بەو برە پول و سامانە زۆرە دەکرد کە لەبری دیەلەکە داویانە، تەنانەت بری دیل گەیشتە چوار هەزار درهەمی ئەو کاتە.

عەمر کوڕی ئەلڕەبیع، برای ئەبولعاس هاتەلای پێغەمبەر(درودی خودای



لەسەربێت) گوتی:

زەینەبی کچی موحەممەد، ئەم شتەی بەمن سپاردوە، تەنانەت لەبری ئەمە ئەبولعاسی کوڕی ئەلرەبیعی برام، هاوسەری زەینەب لە دیلیەتی ڕزگار بکەن.

دوایی پارچە پەڕۆیەکی لە گیرفانی کراسەکەی دەرهێناو پێشکەش بە پێغەمبەری (درودی خودای لەسەربێت)کرد، ئەویش کاتێ پەڕۆیەکەی کردەوە بینی ملوانکەیەکی تێدایەبەڵام پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێت)بەبینینی ئەم ملوانکەیە خورپەیەك کەوتە ناو دڵیەوە، موچڕکێك سەرتاپای جەستەی گرتەوە، یادەوەریەکانی بیرکەوتەوە، چۆن ئەمە ملوانکەی خەدیجەبوو، بەدیاری دابوویە زەینەبی کچی ئەو ڕۆژەی بە بووکێنی گوازرایەوە بۆ ئەبولعاسی کوڕی هالەی خوشکی.

ئیتر بە بینینی ئەم هەڵوێستە غەمگینە، سەرجەم یاوەرەکان پەست و نیگەران بوون، چۆن کچەکەی پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) ملوانکەی خۆشەویسترین کەس لەبری ڕزگارکردنی هاوسەرەکەی بۆ پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت)دەنێرێت، ئیتر دوای بیرکردنەوەو ماوەیەك کپوبێدەنگی پێغەمبەری باوك (درودی خودای لەسەربێت) بە دەنگێکی پڕ لەسۆزو میهرەبانیەوە فەرمووی:

ئەگەر دەتانەوێت دیلەکەو ملوانکەکەی بۆ بنێرنەوە ئەوا بیکەن، بەڵام ئەگەر بەمە قایل نین مەیکەن، یاوەرەکان هەموویان لە کانگای دڵەوە گوتیان:

بەڵێ ئەی پێغەمبەری خودا ڕازین.

ئەبولعاس کاریگەری ئەم هەڵوێستەی بە ڕوخسارەوە دیاربوو، پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت)سەری ئەبولعاسی لە دەمی خۆی نزیك کردەوەبەنهێنی ئاخاوتنێکی لەگەڵ کرد، کوڕی هالەش سەری بۆ دانەواند، وادیاربوو فەرموودەکەی پەسند کرد، پاشان ماڵئاوایی کردو ڕۆیشت، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێت) ئاوڕی لە یاوەرەکانی دایەوە فەرمووی:

بەخودای لەبەر ئەوە پەنامان نەداوە کە زاوامانە.

# لە یەکتر دابڕان

ئەبولعاس گەڕایەوە ماڵەوە، کاتێ زەینەب چاوی پێیکەوت خورپەیەك کەوتە ناو دڵیو نەیتوانی لەشوێنی خۆی ببزوێت، سەری هەڵبڕی بۆ ئاسمان سوپاسی پەروەردگاری کرد چۆن هاوسەرەکەی بەخۆشی و شادی گەڕایەوە لای ئەم و دوومنداڵەکەی، هەروەها تکاو نزاو پاڕانەوەی کرد تا دڵی ئەبولعاس نەرم بێت و بێتە سەر ئایینی پیرۆزی ئیسلام، لە خۆشیانا سەرنجی نەدایە ڕوخسارو دیمەنی هاوسەرەکەی، چۆن پەستی و نائومێدی تێدا دیارو ئاشکرابوو،

ئەبولعاس چاوەکانی خستە سەریەك، وەك چۆن نەیەوێت کاریگەری وتەکانی لە ڕوخساری زەینەب بەدی بکات، گوتی:

زەینەب، هاتووم خوداحافیزیت لێ بکەم!.

زەینەب بە لێوێکی لەرزۆك و بە پەشۆکاویەوە گوتی:

ئاوا بە ئاسانی، خۆ ئێمە هێشتا یەکتریمان نەبینیوە؟.

ئەبولعاس چاوەکانی لەیەکناو نەیکردەوە، نەیدەویست کاتێ ئەم هەواڵە جەرگبڕە دەردەبڕێت، سەیری زەینەب بکات، گوتی:

من ناڕۆم زەینەب، بەڵکو ئەمجارەیان تۆ دەڕۆیت و کۆچ دەکەیت!.

زەینەب گومانی لا دروست بوو، چونکە پێیوابوو ئەبولعاس داواکاری قوڕەیشیەکان جێبەجێ دەکات، دەیەوێت وەکو ڕوقییەو ئومکەلسومی خوشکی ئەویش بەربدرێتو بچێتەوە ماڵی باوکی، بۆئەوەی باوکیان سەرقاڵی کێشەی ئەوان بێت، بەڵام کاتی خۆی ئەبولعاس ئەم داوایەی ڕەت کردەوە، هەرچەند پێیانگوت دەستبەرداری زەینەب بە، ئیتر کام ژنت دەوێت بۆت دەهێنین، کەچی ئەو ئەم کارەی هەرگیز نەکردو گوتی:

بەخودا من دەستبەرداری هاوسەرەکەی خۆم نابم، حەزناکەم بەژنێکی دیکە بیگۆڕمەوە.



بەڵام ئایا دوای جەنگی (بەدر) دووبارە داوایان لـە ئـەبولعاس كردۆتـەوە، دەست لە هاوسەرەكەی بكاتەوە!؟.

زەینــەب زۆر غــەمگین بــوو، هەســتی كــرد دەســت و قاچــەكانی ســارد دەبێــت، ساردیەكە خەریكە بەرەو سنگ و دڵی تەشـەنە دەكات، بـە پەشـۆكاوی و دوودڵیـەوە پشتی دایە دیوارەكەی پـشتی، زۆر بەنائومێـدی چاوەڕوانی وتـەی دەمـی ئەبولعاسـی كرد تا بزانێت چی دەڵێت.

ئەبولعاس زانی زەینەب بیر لەچی دەكاتەوەو چی لە دڵدایـە، بۆیـە بـە دەنگێكـی بەسۆزو بە دڵێكی پڕ لە جۆش و خرۆشەوە گوتی:

ئازیزەكەم بەزەییت بەخۆت بێتـەوە، باوكت داوای لێكـردووم تـۆ بنێرمـەوە لای ئەو!، چونكە ئیسلام نێوانی من و تـۆی قەدەغـە كـردوە، دەبـێ لەیـەكتر جیابینـەوە، منیش پەیمانم بـە باوكت داوە تـۆ بنێرمـەوە لای ئەو، ئینجا نامـەوێت پەیمانەكـەم بشكێنم.

زەینەب كاتێ ئەم هەواڵەی بیست، كەوتـە نـاو دەریای ئەندێشەوە، بیری لەمـە كـردەوە چـۆن لـە مەدینـە بـاوكی مـاچ دەكـات و دەسـت لـەملی خوشكەكانی دەكات، دیدەی شـاد دەبێـت بـە بینینـی خـزم و دۆسـت و ناسیاوە كۆچبەرەكان و یـاوەران و لایەنگرانی باوكی.

لـەناو دەریـای ئەندێـشەو بیركردنـەوەدابوو كاتـێ چـاوی بـە ئـەبولعاس كـەوت، سەیری كرد زۆر پەرێشان و غەمبارە، لەسەرخۆو بە هێمنی گوتی:

ماوەی بەیەكەوە ژیانمان چەند ماوە؟.

ئەبولعاس بە دەنگێكی بێ هێزو لاوازەوە گوتی:

زۆر نەماوە، چەند ڕۆژی داهاتوو خۆت ئامادە دەكـەیت بـۆ كـۆچ كردنەكـە، دوای ئەوە دادەبڕێیت و كۆچ دەكەیت.

زەینەب پرسیارێكی تری مابوو، ئەرێ تۆ دەبیتە یاوەرم تاكو مەدینە؟.

فرمێسك لە چاوەكانی ئەبولعاس قەتیس مابوو، بەڵام خۆی گرت و گوتی:

نەخێر كچە پوورەكەم، بەڵكو زەیدی كوڕی حارسەی برات، بەیاوەری یەكێك لـە

لایەنگرانی باوکت دێن تەنانەت دەگەن بە ناوچەی(بەتن یاجج)(هەشت میل لە مەککەوە دوورە)، لەم شوێنە چاوەڕوانت دەبن تا تۆ دەچیتە لایان، ئیتر ئەوان یاوەرت دەبن تا دەگەیتە لای باوکت لە شاری مەدینە.

هیند کچی عوتبە ژنی ئەبوسوفیان، لە جەنگی بەدردا عوتبەی باوکی و شەیبەی مامی و وەلیدی برای و ئامۆزاکانی عوبەیدەو ئەلعاس کوڕانی سەعید کوڕی ئەلعاس کوڕی ئومەییە وعوقبەی کوڕی ئەبی مەعیت وزرکوڕێکی بەناوی حەنزەلەی کوڕی ئەبوسوفیان کوڕی حەرب،هەموویان کوژرابوون، بۆیە زۆر ڕقی لە موحەممەدو موسڵمانان دەبووەوە، بەیانی لەگەڵ گزنگی خۆر هیند لەماڵەوە دەرچوو تا بچێتە(دارولنەدوە)ی شوێنی کۆبوونەوەی قورەیشیەکان، وویستی هانیان بدات و سوورتریان بکات بۆ تۆڵە کردنەوەی کوژراوەکانیان، لەڕێگادا چاوی بە زەینەب کەوت، هیند ژنێکی زیرەك و شارەزابوو، کاتێ چاوی بە زەینەب کەوت یەکسەر زانی خەریکە خۆی ئامادە دەکات بۆ کۆچ کردن تا بگاتەلای باوکی، بەڵام بۆدڵنیابوون و نەمانی گومان خۆی لە زەینەب نزیك کردەوەو بەڕوویێکی گەشەوە گوتی:

ئەرێ کچی موحەممەد زانیومەو دەڵێن دەتەوێت بچیتە لای باوکت!؟.

زەینەب سەرسام بوو نەیزانی چۆن و چی وەڵام بداتەوە، هیند بۆ مەبەستی دواندنو ئاخاوتن گوتی:

ئامۆزا ئەگەر پێویستیت بە کەرستەیەك یان شتێکبوو بۆ کۆچەکەت و بۆ ڕێگا، من سەرجەم پێداویستیەکانم هەیە، تۆ خۆت لەمن مەگرە ئێمە ژنان کارمان بە نێوانی پیاواندا نیە، بەم قسە نەرم و نیانە خەریکبوو دڵی زەینەبی پاك و بێگەرد نەرم بکات و نهێنیەکانی بۆ بدرکێنێت، کە دەیەوێت بەم نزیکە کۆچ بکات، بەڵام ترسێك ڕای دڵی کەوت و کۆچەکەی لە کچی عوتبە شاردەوەو باسی نەکرد، ئیتر هەریەکەو بەلای کاری خۆیدا ڕۆیشت، زەینەب لە دڵی خۆیدا گوتی:

بەخودا پێموایە ئەوەی گوتی جێبەجێی دەکرد بۆم، بەڵام من ترسام و نەوێرام بڵێم دەمەوێت بچم بۆ مەدینە.

هیند ڕۆیشت تا ئاگری تۆڵەسەندنەوە لە دڵی قورەیشیەکان گڵپە بکات و گەشەتربێت، سووتەمەنی ڕقوقینەی بەسەر دابکات و گڕبگرێت.

کاتی کۆچ کردنەکە زۆر خێراهات، ئیتر زەینەب بێ هیچ ناکۆکیێك و سڵ بونێك و زویر بوونێك ماڵئاوایی لە ئەبولعاس کرد، تەنانەت مەبەستی کۆچکردنیشی نەبوو، وێڕای ئەمەش کۆرپەڵەیەکی لە سکدابوو تەمەنی نزیکەی چوار مانگبوو، لەکاتی بەرێکردن و ماڵئاواییدا ئەبولعاس هەوڵیدا دان بەخۆیدا بگرێت و گوتی:

هەرچۆنی بێت زەینەب تا ماوم لەژیاندا خۆشمدەوێیت و هەرگیز لەیادت ناکەم، ئێمە لەم ماڵەدا ڕۆژگارێکی پڕ لە بەختەوەریمان بەیەکەوە بەسەربردووە، ئیتر تارمایی وێنەکەت لە هەموو سووچێك و ژوورێکدا هەمیشە بەرامبەرم دەوەستێت و هەرگیز لێم دانابڕێت و جیانابێتەوە.

ئیتر ئەبولعاس خۆی بۆنەگیرا خەریکبوو قوڵپی گریانی سەربکات، بۆیە خێرا ڕووی خۆی وەرگێڕا، زەینەبی لەگەڵ کەنانەی برای ناردە ئەم شوێنەی زەیدو هاوەڵەکەی تێیدا چاوەڕوان بوون.

کەنانە هەگبەیەك تیری هەڵگرت و کەوانەکەی لە ملی خۆی کرد، بەڕۆژی ڕووناك و لەبەرچاوی خەڵك دەستی کرد بە لێخوڕینی وشترەکەی زەینەب، قورەیشیەکان کاتێ ئەمەیان بینی خۆیان بۆنەگیرا، چەند پیاوێکیان بەدوای زەینەبدا، نارد تەنانەت لە شوێنی(ژی گوی) پێیگەیشتن، (هوببار کوڕی ئەلئەسوەد ئەلئەسەدی) پێش هەموویان گەیشتەلای زەینەب، ئەم پیاوە تازە سێ برای لەشەڕی بەدردا بەدەستی یاوەرەکانی موحەممەد(درودی خودای لەسەربێت) کوژرابوو، هەمیشە خەفەتبارو غەمباربوو، زۆر ڕقی لە موسڵمانان دەبووەوە، ڕمێکی لە وشترەکەی زەینەبدا وشترەکە ترساو ڕەویەوە، زەینەبی فڕێداو کەوتە سەر بەردێك، کەنانە کاتێ ئەمەی بینی هەگبەکەی کردەوە تیرێکی خستە ناو کەوانەکەی و لەسەر چۆك دانیشت نەڕاندی و گوتی:

بەخودا هەر یەکێك لێم نزیك بکەوتێەوە تیر بارانی دەکەم.

هــەموویان ترســنۆکانە کــشانەوە دواوە، ئەبوســوفیان لــەدوورەوە وەســتابوو، بەکەنانەی گوت:

ئەم تیرە لادە، من هەندێ قسەت لەگەڵ دەکەم.

کەنانە تیرەکەی لادا، ئەبوسوفیان چووە پێش تەنانـەت لێـی نزیـك کەوتـەوەو گوتی:

کوڕی ڕەبیع تۆ بە ئاشکرا بەڕۆژی ڕوونـاك و لەبـەر چاوی خـەڵك، بـێ ئـەوەی گوێ بەهیچ شتێك بدەیت ئەم ژنە دەنێریتە دەرەوە، دەزانی موحەممـەد چ کارەساتێك و نەهامەتییێکی بەسەر ئێمەدا هێناوە، خەڵك وادەزانێت ئێستا تۆ لەبەر ئەو شکستەی بەسەر ئێمەدا هاتووە ئەم کارە دەکەیت و ئێمەت بەلاوە هیچ نیە، بێگومـان ئەمـەش بۆ ئێمە نەنگی و لاوازی و شەرمەزاریە، ئەگینا سوێند بە ئـایینم هـیچ پێویـستیمان بەمە نیە ئـەم ژنـە لـە بـاوکی قەدەغە بکەین، بۆیـە ئێـستا بیگەڕێنـەوە مەککە تـا ئەوکاتەی خەڵکەکە هێور دەبنەوەو دەڵێن ئەوەتا گەڕاندیانەوە، ئـیتر تەنانـەت کاتـێ ئەم ڕووداوە کۆن بوو لەبیرکرا ئینجا بە نهێنی بیگەیەنە لای باوکی.

کەنانە ئەمەی بەلاوە زۆر ناڕێك و ناشیاوبوو، لەبـەر تـیرو تـوانجی خـەڵك چۆن دەڵێن قوڕەیش زەینەبیان گەڕاندۆتەوەو قەدەغە کردوە، سەرەڕای ئەمـەش دوایی بە دزی و بە نهێنی دەربازی بکات و بیباتەلای باوکی، ویستی گوێ ڕایـەڵی ئەبوسـوفیان نەبێت، بەڵام لەپڕ گوێی لە ئاهوناڵەی زەینەب بوو، کاتێ ئاوڕی دایەوەو سەیری کرد بینی زەینەب خوێنی لەبەر دەڕوات و کۆرپەکەی لەبار چووە لەم بیابانەدا.

لـە ئاکامـدا کەنانـە بەناچـاری گەڕایـەوە بـۆ مەککـە، ئـیتر ئـەبولعاس بـوو بـە پەرستاری زەینـەب، شـەو و ڕۆژ چـاودێری دەکـرد، تەنانـەت بـۆ مـاوەی یـەك چرکە بەتـەنیا جێـی نەدەهێـشت، ڕۆژ لـەدوای ڕۆژ زەینـەب بـەرەو چـاکبوونەوە دەچـوو، تەنانەت هێزو توانای هاتەوەبەر، بەڵام خوێنی هەرمابوو، دوای ئەم ماوەیـە دووبـارە ژوانێکی تر داندرایەوە، زەیدی کوڕی حارسە لەکات و شـوێنی دیـارکراودا ئامـادەبوو، کەنانە زەینەبی ڕادەستی زەید کرد، بەڵام ئەمجارەیان کەس بەدوایدا نەچوو، بـەڵکو

ئەوانەی دوێنێش چاوپۆشیان کرد، چونکە لەئاکامی کارەکەیاندا تەنیا شەرمەزاری و سەرشۆڕیان بۆمایەوە، بەتایبەتی هیند کچی عوتبە بە گاڵتە پێیگوتن:

ئەوە ئێوە شەڕتان لەگەڵ ژنێکی بێ دەسەڵات کردوە!؟، ئەی بۆ لە بەدر ئاوەها ئازاو دلێر نەبوون، ئێوە لە ئاشتیدا توندو تیژو ڤین لەدڵن، لەشەڕیشدا دەڵێی ژنی شەرکەرن.

دوای ئەوەی کەنانە لە دەرچوونی زەینەب دڵنیابوو، گەڕایەوە لای ئەبولعاسی برای و پڕ بەدەم دەیگوت:

لام سەیرە هەببارو گەوجانی هۆزەکەی

دەیانەوێ ئاگاداری کچی موحەممەدبم

منیش لە زۆریان هیچ باکم نیە تا بژیم

هەرگیز دەستەکانم نەبرد بۆ گۆی شمشێر

چەمکی شیعرەکەی کەنانە ئەوە دەگەیەنێت پیاوێکی ئازاو بوێرو بێ باك بووە، بۆیە هەرگیز دەستی نەبردوە بۆ شمشێرەکەی، چونکە لێیان نەترساوە، بایەخ و بەهایان لای ئەو نەبووە.

# زەینەب لەشاری مەدینەدا

زەینەبی کچی پێغەمبەر(دروودی خودای لەسەربێت) بەجۆرێك لە مەدینە پێشوازی کرا، غەم و پەژارەی مەککەیان لەبیر بردەوە، تەنانەت شاعیرێك چەند دێرە شیعرێکی سەبارەت بە چەوساندنەوەی زەینەب نووسیبوو، تێیدا گەفی لە قورەیشیەکان دەکردو ئاماژەی بە تۆڵە سەندنەوە دەکرد، بەتایبەتی لە ئەبوسوفیان چۆن ناوی لە شیعرەکەدا هاتبوو، لەمیانەی ڕێبوارانـدا هەرەشەی موسڵمانان دەگەیشتە بن گوێی قورەیشیەکان، تەنانەت ئەمەشیان پێگەیشت چۆن پێغەمبەر(دروودی خودای لەسەربێت) بەهۆی ئەم ستەم و ئازارەی بە زەینەبیان داوە، ڕقی لە هەببارو هاوەڵەکەی هەڵساوە فەرمانی بە یاوەرەکانی کردوە، ئەگەر کەوتنە بەر دەستیان بیانسووتێنن، بەڵام پێغەمبەر(دروودی خودای لەسەربێت)

دواتر بیری کردەوەو بە بڕیارەکەیدا چووەوە، هەستی کرد سەبارەت بە سنووری ئازاردان و تۆڵەکردنەوە زیادەڕۆیی کردوە، ئیتر بەیانی زوو بەشوێن پاوەرەکانیدا ناردو پەشیمان بووەوە، فەرمانیدا لەجیاتی سووتاندن تەنیا بیانکوژن:

هەروەکو (ئەبوهورەیرە ـ خودا لێیڕازیبێت) ئەم بەسەرهاتەمان بۆ باس دەکات و دەڵێ:

پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) چەند کەسێکی نارد منیش، یەکێك بووم لەوان فەرمووی:

ئەگەر سەرکەوتن بەسەر هەبباری کوڕی ئەلئەسوەد یان پیاوەکەی دیکەی لەگەڵ ئەو هاتنە سەر زەینەب، ناوی بە ئیبن ئیسحاق هێنا کە(نافیع کوڕی عەبدوقەیس)بوو، فەرمووی بەئاگر بیانسووتێنن، ڕۆژی دواتر یەکێکی نارد پێیڕاگەیاندین فەرمووی:

من فەرمانم پێکردن ئەگەر ئەم دوو پیاوەتان گرت بیانسووتێنن، دوایی سەیرمکرد لە خودا بەملاوە کەس بۆی نیە بەئاگر ئازاری کەس بدات، بۆیە ئەگەر سەرکەوتن بەسەریاندا بیانکوژن.

ئیتر شەش ساڵی پڕ لە ڕووداوی گرنگ و مەزن تێپەڕبوو، زەینەب لەماوەی ئەم شەش ساڵەدا هەرچەندە لە مەدینە دەژیا، بەڵام هەمیشە بە هیواو ئومێدی ئەوەبوو بەڵکو خودای مەزن دڵی ئەبولعاس بە ڕووناکی ئایینی ئیسلام ڕۆشن بکات و ببێتە موسڵمان.

بەدرێژایی ئەم شەش ساڵە هەگیز هەواڵی ئەم دوو هاوسەرە نەدەبیسترا و کەس باسی نەدەکردن، ئەگەر چی زەینەب لەناو کۆمەڵێك زرداپك و مشتومڕی ئەواندا دەژیا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دوورە پەرێزبوو هەرگیز ناوی نەدەهات، سەبارەت بە ئەبولعاس بەهەمان شێوە، هەرچەندە ئاشی شەڕی نێوان موسڵمانەکانی مەدینەو قوڕەیشیەکانی مەککە لەم ماوەیەدا تەنانەت بۆ یەك چرکەش نەوەستابوو، بەڵام ئەو لە دوای شەڕی بەدر هەرگیز بەشداری هیچ شەڕێکی دیکەی نەکرد.

# دیدارێکی چاوەڕوان نەکراو

شەوێك لە شەوەکانی مانگی جمادی یەکەمی ساڵی شەشی کۆچی، زەینەب لەناو جێگاکەیدا یادی ڕۆژانی ڕابردووی هاتەوەیاد، ئیتر خەو لەچاوەکانی تۆرا، بیری لە ژمارەو هێزی موسڵمانان دەکردەوە، چۆن هەموو ڕۆژێك زیاد دەبێت و بەهەزاران کەس موسڵمان دەبن، تەنانەت هەندێکیان دوژمنایەتی زۆر سەخت و دژواریان لەگەڵ موحەممەدو موسڵماناندا هەبوو، کەچی ئێستا بوونەتە موسڵمانان.

زەینەب گومانی لە سەرکەوتنی ئایینی ئیسلام و موسڵمانان نەبوو، هەروەك پەروەردگاری مەزن بەڵێنی بە پێغەمبەری خۆیدابوو (درودی خودای لەسەربێت)، بۆیە خەونی بە پاشەڕۆژێك و ئاییندەیەکی ئاسودەو بەختەوەر دەبینی کە ماوەیەکی درێژە چاوەڕوانی دەکات، ئاخۆ دەبێ ئەبولعاس موسڵمان نەبێت؟.

ئەم شەوە نزیك بەرەبەیان بوو، زەینەب هێشتا لەبیرکردنەوەدابوو پێڵوی چاوەکانی تەواو لەیەکتر نەنابوو، هەستی کرد دەرگای ژوورەکەی بە دوودڵی و زۆر لەسەرخۆ کرایەوە، لەپڕ ئەبولعاسی کوڕی ئەلڕەبیع بە ڕەنگێکی بزرکاو و زەرد، پەشۆکاوی و ماندوویتی بە ڕوخساریەوە دیاربوو هاتە ژوورەوە، زەینەب گومانی لە هوشیاری و بە ئاگابوونی خۆی کرد، تەنانەت پێیوابوو ئەمە تارمایی و وێنەی خۆشەویستەکەیەتی لە کپ و بێدەنگی شەوەزەنگدا هاتۆتە پێش چاوی تا ڕابردوویێکی پڕ لەبەختەوەری لەبیر نەکرێت، زەینەب لە ژیانیدا شتی ئاوا نامۆی نەبینی بوو، چەندین جاری تر بیری لە ڕابردوو، لە دوارۆژی خۆی و هاوسەرەکەی کردۆتەوە، بە خەفەت و پەژارەوە پێڵوی چاوەکانی لەیەکترنابوو، بەڵام هەرگیز وێنەو تارمایی ئەبولعاس بەم شێوەیە قنج لەبەردەمی نەوەستابوو، هەرچەندە باوەڕی بە دیدەو چاوەکانی نەبوو کە ئەمە ئەبولعاسە، بەڵام خۆی بۆ نەگیرا لەبەرخۆیەوە بە دەنگێکی پڕ لەتاسەو بێ هێزەوە ترمانی و گوتی:

ئەبولعاس!!.

تارماییەکە بە دەنگێکی ئاسایی وەڵامی دایەوە گوتی:

بەڵێ ئەی خۆشەویسترین کەسم، ئەبولعاس چارەنووس فرێیداوەتە نزیک مەدینە، هەوڵیداوەو رایکردوە، تەنانەت بۆ خۆ ڕزگارکردن بگاتەلای تۆ، چۆن خەڵك بەدواوەمن تا بمگرن.

زەینەب باوەڕی نەکرد، بەڵکو بە چاوێکی سەیرو خەواویەوە سەیری دەکرد، دڵی بەم تارماییە ئاسوودەو شادبوو، چۆن بێ ژوان و لەناکاو لەپێشی ئامادەبووە، ئەوەندە ئەم وێنەیەی بەلاوە سەیربوو، ئیدی چاوەکانی لێی وەرنەگێڕا هەمیشە سەیری دەکرد، تەنانەت کازیوەی بەیان داهات، گوێی لە دەنگی بیلالی کوڕی ڕەباح بوو، بەدەنگە زوڵاڵەکەی بانگیدا، ئیتر خەڵك بۆ نوێژی بەیانی بەرەو پیری بانگەکە دەچوون و بەدەم ڕێگاوە وەڵامی بانگەکەیان دەدایەوە، زەینەب هەستی کرد یەکێك هەنگاوەکانی نزیکە لە ژوورەکەی ئەو، زانی ئەمە باوکیەتی(دروودی خودای لەسەربێت) دەچێتە مزگەوت تا پێش نوێژ بۆ موسڵمانان بکات.

ئیتر زەینەب لەبەر خۆیەوە گوتی:

ئەی خودایە چەند سەیرە چۆن دەڵێی بە ئاگام و دەڵێی باوکی عەلی لەلام وەستاوە!.

ئیتر ئەوەی زەینەب بە وێنەو بە تارمایی دەزانی وەڵامی دایەوە گوتی:

بەڵێ زەینەب ئەوە خۆیەتی ئەبولعاسە میوانی تۆیە، چاوەڕوانی بەخێر هاتنی تۆ دەکات، سەرەڕای ئەوەی ئەم شەو زۆر ماندوو بووە لە ڕاکردن و ڕاوەدوونان، ئاگری دابڕان و تەنیاییش چاوچنۆك و بێزاری کردوە.

مووچڕکێك سەرجەم جەستەی زەینەبی گرتەوە،هەستایەوە ویستی بەخێرهاتنی بکات، تەنانەت هەنگاوێك مابوو بگاتە ئەبولعاس، لەناکاو وەستا، وەك بڵێی شتێکی بیر کەوتبێتەوە، بەڵام نەیتوانی بەزار هیچ بدرکێنێت، وتەکان و پرسیارەکان لەناو قوڕگیدا خنکان، تەنیا هەردوو چاوەکانی تێ بڕی، ئەبولعاس سەری بۆی هەژاند، وەڵامی پرسیارە بێ دەنگەکەی دایەوەو گوتی:

نەخێر زەینەب بۆ موسڵمانبوون نەهاتوومەتە مەدینە، بەڵکو بۆ بازرگانی دەچووم، کاڵاو کەلوپەلی خۆم و هەندێ قورەیشیەکانم بردبوو بۆ وڵاتی شام، لە گەڕانەوەمدا کۆمەڵێك لە پیاوانی باوکت، نزیکەی سەدوحەفتا کەس دەبوون، لەگەڵ زەیدی کوڕی حارسە گەیشتنە کاروانەکەمان و دەستیان بەسەرداگرت،منیش دەرفەتم بوو لە چنگیان ڕامکرد، ئیتر کاتێ تاریکی شەو باڵی بەسەر زەویدا کێشا، بەنهێنی دزەم کردو پەنام هێناوە بۆتۆ، بەڵکو تۆ پەنام بدەیت.

زەینەب کاتێ ئەمەی بیست، گەڕایەوە دواوە بۆ شوێنی خۆی، بە دەنگێکی پڕ لە نائومێدی گوتی:

بەخێربێیت کوڕەپوور، بەخێر بێیت باوکی عەلی و ئومامە.

ئیتر کپ و بێدەنگی، پەژارەو نائومێدی، سەرتاپای ژوورەکەی داپۆشی، هیچ شتێك جوڵەی نەدەکرد، بەڵکو هەموویان لەدەریای مێتبووندا خنکابوون، تەنانەت پێیانوابوو جیهان بۆ چرکەیەك هەناسەی ڕاگرت، دوایی زەینەب گوێی لە دەنگی باوکی بوو، کاتێ دەیگوت (الله اکبر) موسڵمانانیش وێڕای ئەو بەیەك دەنگ لەدوای ئەو دەیانگوتەوە، ئیتر زەینەب خۆی کۆکردەوە، هەستا چووەلای دەرگا وەستا، دوایی پڕ بەدەم هاواری کردو گوتی:

هۆ خەڵکینە، من ئەبولعاسی کوڕی ئەلرەبیعم کردوە بە پەناهەندەی خۆم!.

شنەی بەرەبەیان ئەم دەنگەی زەینەبی بەمزگەوت ڕاگەیاند، کاتێ پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) سڵاوی نوێژی دایەوە فەرمووی:

ئەرێ خەڵکینە ئەوەی من بیستم ئێوەش بیستتان؟.

گوتیان:

بەڵێ ئەی پێغەمبەری خودا(درودی خودای لەسەربێت).

فەرمووی:

بەڵام سوێندم بەوە کە خودی موحەممەدی بەدەستە، هیچ لەم شتە ئاگادارنیم!، تەنیا ئەوەی من بیستوومە ئێوەش بیستووتانە.

پاش تۆزێك بێدەنگی فەرمووی:



کـەم پـەنادەهێنن بـۆ موسـڵمانان، ئـەوەی زەینـەب پـەنای داوە ئێمـەش پـەنای دەدەین.

دوایـی پێغەمبـەر(درودی خـودای لەسـەربێت) لەمزگـەوت هاتـەدەر چـووە لای زەینەبی کچی، کاتێ زەینەب چاوی بە باوکی کەوت تکای کردو گوتی:

ئەی پێغەمبەری خودا(درودی خودای لەسـەربێت)، مـن بۆیـە پـەنای ئەبولعاسـم داوە، چونکە کاتێ لەناو ئێمەدا دەژیت ئامۆزای ئێمەیـە، ئەگـەر دووریـش بێـت ئـەوا باوکی منداڵەکانە.

ئیتر باوکی دڵفراوان بەچاوێکی پڕ لە سۆزەوە سەیری کردن، پاشان فەرمووی:

کچی خۆم زۆر ڕێزی بگرە، قەدەغەیە نەیەتەلات، چونکە تـۆ حـەرامی لـە ئـەو، ئیتر جێیهێشتن و هاتەدەرەوە، بەڵام نەیانزانی سەبارەت بەوان ڕای چیبوو، بۆیـە تـا دوور کەوتەوە سەیریان کرد، دوای ئەمە سەیری یەکتریان کرد، زەینەب بە گلەییەوە گوتی:

ئەرێ ئەبولعاس تۆ دابڕانی ئێمەت بەلاوە هیچ گرنگ نیەو بێ بایەخە!؟.

ئەبولعاس لەوەڵامدا گوتی:

زەینــەب خۆشەویــستی ناخۆشــە، بــەخودا دوای تــۆ هــەرگیز بەختــەوەری و ئاسوودەیم لە ژیاندا نەبینوە، بگرە هەمیشە نیگەران و پەشۆکاو بوومە.

زەینەب گوتی:

جا کەوایە ئەم نیگەرانیەو ئەم ئازارە تاکەی؟.

ئەبولعاس گوتی:

مەگەر تەنیا خودا بیەوێت جێبەجێی بکات و چارەی بکات.

ئیتر فرمێسکی چاوەکانی بـەگوڕ هاتـەخوار، بـەڵام هـەردوو دەسـتی خـستە سـەر ڕوخساری تا لەزەینەب بیشارێتەوە.

زەیەنەب لەسەرخۆو بە هێمنی گوتی:

کوڕە پوورەکەم، تکام وایە خودا بەزەیی پێمان بێتەوە.

ئەبولعاس سەری بەرز کردەوەو بە هێمنی گوتی:

دوێنێ پێیان گوتم وەرە باوەڕ بەئاینێنی نوێ بهێنەو موسڵمانبە، سەرجەم کاڵاو کەلوپەل و سامانی کاروانە بازرگانیەکەی کافرەکان بۆخۆت بێت، بەڵام من نەمویست و گوتم:

ناڕێکترین و خراپترین شت ئەوەیە لە سەرەتاو دەسپێکی موسڵمانبوونمدا خیانەت لە ئەمانەتدا بکەم.

زەینەب چاوەکانی تێبڕی، تەنانەت بزانێت ئەم قسەیەی چی بەدواوەیە، بەڵام ڕووی خۆی وەرگێڕا سەیری دوو منداڵەکەی کرد هێشتا لە خەوێکی خۆشدابوون.

بەیانی پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) لەگەڵ کۆمەڵێك لە یاوەرانی لە مزگەوت دانیشتبوو، هەندێکیان لەم یاوەرانەبوون دوێنێ دەستیان بەسەر کاروانەکەی ئەبولعاس داگرتبوو، پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) بەشوێن ئەبولعاسی ناردو هاتە مزگەوت، دوای ئەمە فەرمووی:

ئێوە دەزانن ئەم پیاوە یەکێکە لە ئێمە، ماڵ و سامانتان گرتووە، ئەگەر چاکەی لەگەڵ دەکەن و ئەوەی گرتووتانە دەیدەنەوە ئەوە منیش پێم باشە، ئەگەر نایدەنەوە ئەوە خودای مەزن بە ئێوەی داوەو مافی خۆتانە مەیدەنەوە.

یاوەرەکان هەموویان بەیەك دەنگ گوتیان:

ئەی پێغەمبەری خودا، کاڵاو سامانەکەی بۆ دەگەڕێنینەوە.

ئیتر بەپەلە سەرجەم کاڵاو کەلوپەلەکەیان هێنایەوە، تەنانەت دەولکی ئاو، دەفرو قاپی بچووك، کۆنە کوندەی ئاو، هەموویان بۆی گەڕاندەوە و کۆکردەوە، هیچیان بەپاش نەدا، کاتێ بەڕێیان کرد پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) فەرمووی:

باوەڕ بێنەو من بەڕاستگۆ بزانە، بەڵێنم پێبدەو وەفاداربە بۆم.

ئەبولعاس بۆ مەبەستی ماڵئاوایی لەدوورەوە ئاوڕێکی لە خانوەکەی زەینەب دایەوە، ئیتر ملی ڕێگای گرت و ڕۆیشت، بەڵام لە دڵدا نیازی ئەنجامدانی کارێکی هەبوو.

# باوەڕهێنان و کۆچکردن

ئـەبولعاس گەیـشتەوە شـاری مەککـە، قورەیـشیەکان کاتـێ بینیـان خـۆی و کاروانەکـەی بـە سـەرکەوتوویی و بـە قازانجـەوە گەڕاوەتـەوە زۆر دڵـشادبوون، بەپەرۆشەوە پرسیاری گرتن و ئازاد کردنیان لێی دەپرسی، ئەویش بەسەرهاتەکەی بۆ دەگێڕانەوە، دوای ئەوەی سەرجەم سوود و قازانج و کاڵاو کەلوپەلـەکانی دایەوە خاوەنـەکانی و هیـچی لا نـەما، ئینجـا ئـەبولعاس لەشـوێنێکی بـەرز وەسـتا، تـا لـە هەموویان دیاربێت و دەنگی ببیستن، پڕ بەدەم بەدەنگێکی بەرز گوتی:

ئـەی کۆمـەڵانی قـورەیش، کـەس مـاوە لـەئێوە مـاڵ و سـامانی خـۆی وەرنەگرتبێتەوە؟.

گوتیان:

نەخێر خوداکان پاداشتت بدەنەوە، تۆ پیاوی و وەفاداریت.

پاشان چاوی خۆی بەناویاندا گێڕاو سەیری کردن، زۆر لەسەرخۆ چۆن بیەوێت سەنگێك بۆ وشەکانی دابنێت گوتی:

بەڕاسـتی مـن گـەواهی دەدەم هـیچ خودایـەك نیـە جگـە لـەخودای مـەزن و موحەممەدیش بەندەو نێـردراوی ئـەوە، بەخودا بۆیـە لەمەدینـە موسڵمان نـەبووم، ترسام گوتم نەوەك ئێوە بڵێن لە پێناو ماڵ و سامانی ئێمە ئەم کارەی کـردو بوومـە موسڵمان، بەڵام ئێستا دوای ئەوەی خودای مەزن هـەمووی بـۆ گەڕاندنـەوەمو هـیچ لـە ئەستۆی من نەماوە، ئینجا موسڵمان بووم.

قورەیشیەکان کاتێ ئەمـەیان بیـست چـۆن بـەر هـەورە تریـشقە کـەوتبن ئاوەهـا حەپەسان و لە شوێنی خۆیان نـەجوڵان، ئـیتر ئـەبولعاس ئـەوانی جێهێـشت و بـەرەو شاری مەدینە، شاری کۆچبەران کەوتەڕێ و ڕۆیشت.

سەرەتای مانگی موحەڕەمی ساڵی حەوتـەمی کۆچی بـوو، پێغەمبـەر و (درودی خـودای لەسـەربێت) یـاوەرانی، تـازە لـە حودەیبییـە گەڕابوونـەوەو لەگەڵ کافرەکان

لەسەر پەیماننامە مێژووییەکە ڕێککەوتبوون،پەیماننامەکە بە دواترین هەوڵی نەزۆکی کافرەکانی مەککە دادەنـدرێت پێش بەرپابوونی جەنگی یەکلاکەرەوە، سەرجەم خەڵکی مەدینە باسی وتە پیرۆزو بەهادارەکانی پێغەمبەریان(درودی خودای لەسەربێت) دەکرد، ئەو ڕۆژەی قورەیشیەکان ڕێگایان پێنەدا بەئاشتیانەو بێ شەڕ بچێتە ناو شاری مەککە، بۆ مەبەستی جێبەجێکردنی(زیارەت و عومرە)، چۆن فەرمووی:

هاوار بۆ قورەیش، شەڕ ئەوانی خواردوە، دەبینن چیان بەسەردێت کاتێ واز لەمن و نێوان هۆزەکانی تری عەرەب دێنن، ئەگەر ئەوان بەسەر مندا زاڵ بوون، ئەوا ئەو کاتە بەدڵی ئەوان دەبێت، ئەگەر منیش خودای مەزن بەسەر ئەوانی سەرخستم،ئەوا زۆربەیان دێنە ناو ئیسلام، ئەگەر ئەم پەیمانە واژوو نەکەن و هێزیان هەیە، با شەڕ بکەن!، قورەیش پێیانوایە چۆنە؟ سوێندم بەخودا من هەمیشە بەردەوام تێدەکۆشم لەپێناو ئەو پەیامەی خودا بۆمنی ناردوە، تەنانەت خودا سەرکەوتووی دەکات، یان ئەوەتا ئەم لایەی ملی من بەتەنیا دەمێنێتەوە(ئاماژەی بۆ لایەکی ملی خۆی کرد).

فەرموودەکەی پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) ڕاست و دروست بوو، شەڕخوازی قورەیشیەکانی خوارد، کەچی هەمیشە لەسەر گومڕایی و سەر ڕەقی خۆیان بەردەوام بوون، سەرەڕای ئەوەی دەیانزانی لەشەڕکردندا دۆڕاوون، کەچی ڕۆڵەکانیان دەکردە سووتەمەنی شەڕەکە.

گەرچی قورەیش هۆزو کەسوکارە، شاری مەککە بۆ موسڵمانە کۆچبەرەکان نیشتمانەو خزم و دۆستانی تێدایە، بەڵام شاری مەدینە، شاری کۆچ، هەمیشە دەرگای دڵی خۆی بۆ موسڵمانە کۆچبەرەکان دەکردەوە، پێش ئەوەی دەرگاکانی شارەکە ئاڵاو والابێت، چۆن هەر موسڵمانێکی کۆچبەر کاتێ دەگەیشتە ئەم شارە لەلایەن لایەنگرانیانەوە هەوارگەو شوێنی حەوانەوەی بۆ دابین دەکرا.

ئەوەتا لەسەرەتای مانگی موحەڕەمدا پێشوازی لە ئەبولعاس کوری ئەلرەبیع دەکەن، ئەم پیاوە بێ هیچ فشارێك موسڵمان بووەو هاتۆتە مەدینە، موسڵمانان



گەشبینن بەم کۆچەی ئەم پیاوە، چونکە هاوکاتە لەگەڵ یاد کردنەوەی کۆچکردنی پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت)، ئەبولعاس لە سەرەتای گەیشتنی بۆ مەدینە، ڕووی لە مزگەوتی پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) کرد، موسڵمانان کاتێ بینیان بۆ دانپێنان و باوەڕهێنان بە ئایینی پیرۆزی ئیسلام دەستی خستە ناو دەستی پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت)، هەموویان گوتیان(لا الـه الا الله الله اكبر)، پاشان ئەبولعاس یەکە یەکە دەستی خستە ناو دەستی هەموویان و پیرۆزبایی و بەخێرهاتنیان کرد، بەڵام ڕەنگە دڵی لای ئەوکەسانەی دەوروبەری نەبووبێت، بەڵکو سەرقاڵی ئەوەبووبێت، ئایا پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) زەینەبی بۆ دەگەڕێنێتەوە؟، دوودڵ و پەشۆکاو بوو، دوایی بیری کەوتەوە ئایینی ئیسلام کارو کردەوەی ڕابردوو بەلاوە دەنێت، بۆیە ورەی هاتەوەبەر، ئیتر داواکاریەکەی خۆی بە پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) ڕاگەیاند سەبارەت بە گەڕانەوەی زەینەب.

پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) تکاو پاڕانەوەی چاکەی بۆ کردن لەلایەن خوداوە، دوای ئەوە هەستا بەرەو ماڵەوەچوو، ئەبولعاس بەدوای ئەودا چوو، کاتێ چووە لای ژوورەکەی زەینەب بانگی کردو گەڕاندیەوە لای ئەبولعاسی هاوسەری، ئیدی (هەندێ کەس دەڵێن لەسەر مارەیی پێشوو دایەوە ئەبولعاس، هەندێکیش دەڵێن مارە بڕینێکی نوێی بۆ کردن).

ئیتر ئەم دووهاوسەرە خۆشەویستە دوای دابڕان و جیابوونەوەیەکی دوورودرێژ بەیەکتری شادبوونەوە.

## جیابوونەوەی یەکجارەکی

دوای بە یەکتر شادبوونەوە تەنیا ساڵێك بەیەکەوە ژیان، دوای ئەم ساڵە بۆ یەکجاری و هەتاهەتایە لە یەکتری دابڕان، ئەو دابڕانەی هەمیشە دیدارو بەیەکتر گەیشتنی بەدواوەدا نیە لەم ژیانەدا، زەینەب لەسەرەتای ساڵی هەشتەمی کۆچیدا

مرد، هۆکاری سەرەکی مردنەکەی لەبارچوونی کۆرپەڵەکەی بوو لە مەککە، چونکە هەمیشە کاریگەری بەسەر جەستەیەوە هەبوو، بەدەم ئاکام و ئازارەکانی ئەم نەخۆشیە دەیناڵاندو دەتلایەوە، تەنانەت دەرەنجام سەرینایەوە، بەم کارەساتە جەرگبڕە ئەبولعاس هەموو جەستەو گیانی هاتە هەژان، بەدیار تەرمی زەینەب دانیشتبوو قسەی بۆ دەکرد، تەنانەت خەڵکانی دەوروبەری کاتێ چاویان بەم دیمەنە تراژیدیایە کەوت، قوڵپی گریانیان سەری کردو لەپڕمەی گریانیاندا، ئیتر کەس نەیتوانی لەم شوێنە دووری بخاتەوەو دڵ نەوایی بکات.

تەنانەت باوکی زەینەب(درودی خودای لەسەربێت) هات بەدڵێکی پڕ لە غەم و پەژارەوە ماڵئاوایی لە زەینەبی کچی کردو بەخودای مەزنی سپارد، دوایی بە ژنانی گوت:

بەژمارەی تاك، سێ جار یان پێنج جار تەرمەکەی بشۆن، لە جاری کۆتاییدا بە کافور بیشۆن.

ئیتر ئەم کاتە ئەبولعاس بەلاشەیەکی قورس هەستا چووە دەرەوە، لەبەر کاریگەری مردنی ئازیزەکەی بەملاو بەولادا دەڕۆیشت و نەیدەتوانی بەپاوە خۆی ڕابگرێت، بۆیە لەبەر دەرگاکە وەستا چاوەکانی مۆڵق وەستابوون، تەنانەت تەرمەکە ئامادەکرا بۆ کۆچێکی نەبڕاوەو کەس تێیدا ناگەڕێتەوە، لەمزگەوت باوکی(درودی خودای لەسەربێت) نوێژی لەسەر کرد، پاشان بۆ ئارامگەی خۆی بەڕێکراو نێژرا.

ئەبولعاس گەڕایەوە ماڵەوە، ئەو ماڵەی تەنانەت دوێنێ بەهەشتی خۆشەویستی بوو، کەچی ئەمڕۆ دوای مردنی زەینەب هەوارگەی غەم و پەژارەیە، بەڵام هەرچەند سەیری عەلی دەکرد غەمەکانی کەم دەبووەوەبەبینینی ئومامە پەژارەکانی بەبادەداو برینەکانی سارێژ دەبوو، چونکە شێوەی زۆر لە زەینەبی دایکی دەکرد، بۆیە هەوری ماتەمی و خەمۆکی لەسەر ماڵەکە دەڕەواندەوە، هەروەها پێغەمبەریش(درودی خودای لەسەربێت) بە بینی ئومامە دڵشاد دەبوو خەفەتی کەم دەبووەوە، گێڕراوەتەوە لەکاتی نوێژدا لەسەر شانی خۆی دایناوە، لەکاتی کڕنوش

بردندا دایناوە، تا نوێژەکەی تەواوبووە، پاشان دووبارە دایناوەتەوە سەر شانی.

عائیشەخانی دایکی موسڵمانان(خودا لێیڕازیبێت) گوتی:

پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) ملوانکەیەکی مێرووی سپی و ڕەشی بەدیاری پێشکەشکرا، فەرمووی:

ئەم ملوانکەیە دەدەم بە خۆشەویسترین کەسم، ژنان گوتیان کچی ئەبوقەحافە ملوانکەکەی برد، بەڵام پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) بانگی ئومامەی کچی زەینەبی کرد ملوانکەکەی لەملی ئەوکرد.

خۆشترین و خۆشەویسترین ناو لای پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) ناوی زەینەب بوو، زەینەبی کچی ئەبوسەلەمە زڕکچی پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت)بوو، گوتی من ناوم بیرە(برّە) بوو، پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت)ناوەکەی گۆڕیم و کردی بە زەینەب، هەروەها زەینەبی کچی جەحش هاتەلای پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) ناوی بیرەبوو ناوەکەی گۆڕی کردیە زەینەب.

گریەو زاری فاتیمە بۆ زەینەب چۆن بنووسرێت و چەند باسبکرێت تەواو نابێت، زۆر پەرێشان و غەمباربوو،چونکە زەینەب بۆ ئەو دایك و خوشك و یاوەرو هۆگربوو، ڕۆژگاری ڕابردووی کەوتەوە یاد، کاتێ خانەوادەکەیان بەئارامی و ئاسوودەیی لەمەککەدا دەژیان.

ئیتر دوای مردنی زەینەب ڕۆژگار هات و ساڵ تێپەڕبوو، فاتیمە کچێکی بوو، بۆ ئەوەی یادەوەری ئەم خوشکە ئازیزو بەڕێزەی بە زیندوویی ڕابگرێت و هەمیشە ناوەکەی لەسەر زار بێت و بمێنێت ناوی کچەکەی نا زەینەب.

ئەبولعاس کوڕی ئەلڕەبیع لەسەردەمی حوکمڕانی ئەبوبەکر(خودا لە هەردووکیان ڕازیبێت) لەمانگی (ذی الحجە)ی ساڵی دوازدەی کۆچی گیانی لەبەرزایی ئاسمانەوە بە دیداری زەینەب شادبوو، کۆچی دوایی کرد.

ئەبولعاس لەسەرەمەرگدا ئومامەی کچی بە زوبەیری کوڕی عەوامی کوڕی



خومیلدی کوڕی ئەسەد سپارد، وەك لەڕەچەڵەکەکەی دیارە کوڕی خاڵی بوو، زوبەیریش دوای مردنی فاتیمە، ئومامەی کردە هاوسەری عەلی کوڕی ئەبوتالیب(خودا لە هەموویان ڕازیبێت)، ئومامە لای عەلی مایەوە تەنانەت عەلی(خودا لێیڕازیبێت) شەهید کرا، دیمەنی گریانی ئومامە بۆ عەلی هاوسەری دڵ و جگەری لەت دەکرد، کاتێ عەلی برینداربوو لەناو جێگادا کەوتبوو، ئومامە بەدیاریەوە دانیشتبوو دەگریاو ناخی هەڵدەکێشابۆی، هاوسەرە شەهیدەکەی لەسەرەمەرگدا پێیگوت:

ئەگەر هاتوو پێویستیت بە پیاوبوو، ئەوا من ڕازیم تۆ شوو بە موغەییەرە کوڕی نەوفەل کوڕی حارس کوڕی عەبدولموتەلیب بکەیت، خزمێکی نزیکی خۆمە.

ئیتر ڕێك دوای چوار مانگ و دە ڕۆژ پاش مردنی عەلی، واتە دوای (عیددەی شەرعی)، معاویە(خودا لە هەدووکیان ڕازیبێت) نامەیەکی ئاراستەی مەڕوانی کوڕی ئەلحەکەم کرد، تێیدا فەرمانی پێیکرد خوازبێنی ئومامەی بۆ بکات، ئەویش سەد هەزار دیناری بۆ هێنا، بەڵام ئومامە قسەی هاوسەرە خوالێخۆشبوەکەی بیرکەوتەوە گوتی:

بەڵێ بەقسەت دەکەم.

ئیتر هەتا کۆچی دوایی کرد، ئومامە ژیانی خۆی لەگەڵ موغەییەرە بردەسەر، بەڵام لە هەردوو هاوسەرەکەی هیچ منداڵی نەبوو.

عەلی برای ئومامە هەروەکو (ئیبن حەزم و موصعەبی زوبەیر) لە کتێبەکانیاندا باسیان کردوە، زوو لە هەڕەتی گەنجیەتی و لاویدا سەری ناوەتەوە، ئەوەی سەبارەت بە عەلی زانراوەو لە ئارادا هەیە، تەنیا ئەوەیە پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) لەکاتی ڕزگارکردنی شاری مەککەی پیرۆزدا لەپشت خۆی سواری ئەسپی کردبوو.

ئیدی بەمردنی ئومامەو عەلی سۆزاغ و بەدواداچوونی زەینەبی کچی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێت) کۆتایی هات.

# خوازبێنی و هاوسەرگیری

دوای شوکردنی زەینەب و هاوسەرگیری لەگەڵ ئەبولعاسی کوڕی ئەلرەبیع، زۆری نەخایاند بنەماڵەی عەبدولموتەلیب چەند کەسێکیان هاتنەماڵی موحەممەد ئەمینی ئامۆزایان بۆ خوازبێنی کچەکانی، ئەوەك وەکو زەینەب گەنجەکانی قورەیش دەسپێشخەری لە خوازبێنیان بکەن.

ڕوقییەو ئومکەلسوم هەمیشە بەیەکەوەبوون، تەنانەت کاتێ میوانەکان هاتن بەیەکەوە دانیشتبوون، ئومکەلسوم زۆرزان و تێگەیشتوو بوو، کاتێ چاوی بەمیوانەکان کەوت زوو زانی بۆچی هاتوون، بە ڕوقییەی گوت:

پێموایە نۆرەی تۆ هاتووە.

پێش ئەوەی ڕوقییە وەڵام بداتەوە، فاتیمە گوێی لە ئومکەلسوم بوو گوتی:

بەڵکو نۆرەی هەردووکتان هاتووە.

کاتێ میوانەکان هاتن فاتیمە لەگەڵ باوکی یاری دەکرد، پێیوابوو میوانەکان ماوەیەکی کەمیان پێدەچێت و دەڕۆن، ئیتر دوای ڕۆیشتنیان ئەو دەست بەیاریەکەی دەکاتەوە، بۆیە لای میوانەکان مایەوەو نەچووە دەرەوە، گوێی لێبوو کاتێ ئەبوتالیبی ڕیش سپی بنەماڵەکەیان گوتی:

برازاکەم، تۆ زەینەبی کچت داوەتە ئەبولعاسی کوڕی ئەلرەبیع، بێگومان پیاوێکی چاکە، بەڵام ئامۆزاکانت دەڵێن ئێمەش وەکو کوڕە خوشکی خەدیجە مافی هاوسەرگیری کچەکانی تۆمان هەیە، لە ڕووی ڕەچەڵەك و بنەماڵە لە ئەبولعاس کەمترنین، بگرە شکۆدارترن.

موحەممەد(درودی خودای لەسەربێت) فەرمووی:

ڕاست دەڵێی مامە.

ئەبوتالیب یەکسەر گوتی:

هاتووینەتە خوازبێنی ڕوقییە و ئومکەلسوم، پێموایە تۆش ئامۆزاکانت بە

نائومێدی ناگەڕێنیتەوە.

موحەممەد(درودی خودای لەسەربێت) فەرمووی:

بێگومان ئامۆزاکانم خزمی نزیکن، بەڵام مامە ڕێگام بدەن تا ڕای کچەکانم وەربگرم.

ئیتر فاتیمە ئەم گفتوگۆو وتووێژەی بیست خۆی بۆنەگیرا، خێرا چووەلای خوشکەکانی، ئەم هەواڵە گرنگەی پێڕاگەیاندن، هەردوو خوشکەکان حەپەسان و پێدەنگبوون، چونکە خوازبێنیەکە بەلایانەوە سەیرو لەناکاو بوو، بۆیە کپو بێدەنگی باڵی بەسەر ژوورەکەدا کێشا، هەریەکەیان سەیری ئەوەی تری دەکرد، چۆن هانا بۆ ئەوەی تریان بەرێت، یان بیەوێت هەڵوێستی ئەوەی تر بزانێت سەبارەت بەم خوازبێنیە، بەڵام چاوەکانیان بێ وەڵام دانەواندو بەیەکەوە ئاوڕیان لە فاتیمە دایەوەو گوتیان:

نەتزانی مامە پیرە بۆ کام ئامۆزا هەوڵ دەدات.

کچە بچکۆڵەکە گوتی:

نەخێر نەمزانی، چونکە کاتێ ئەمەم بیست ئیتر ئارامم نەماو هاتم بەئێوەم گوت، نەمتوانی چاوەڕوان بم ئاخۆ باسی چی و کێ دەکەن.

پاشان فاتیمە سەری دانەواندو کەوتە بیرکردنەوە، بەدەنگێکی کزو لەسەرخۆ گوتی: دووکەسە خوازبێنی کارەکە کێ بێت بەمن چی، سەبارەت بەمنەوە هەڵوێستەکە ناگۆڕێت و هەریەکە، بەڵکو ئەوەی بەلای منەوە گرنگە لەماوەیەکی کورتدا ڕوقییەو ئومکەلسوم لەمماڵە دەردەچن و لە ئێمە دادەبڕێن، چۆن لەمەو پێش زەینەب لێمان دابڕا، ئیتر هەمان دەردەسەری و هەست بەتەنیایی کردن دووبارە دەبێتەوەو من بێ خوشك دەمێنمەوە.

فاتیمە خەریکی ئاخاوتنبوو دایکی هاتەژوورەوە، تەنانەت سەبارەت بە میوانەکان ڕای کچەکانی وەربگرێت، کاتێ چاوی بەدایکی کەوت فرمێسکی چاوەکانی بە گوڕ هاتەخوار، دایکی هاتەلای بەسۆزەوە پێیگوت:

کچە بچکۆڵەکەم بۆ دەگریت؟.

فاتیمە دەستی خستە ملی دایکی و گوتی:

لێنەگەڕێیت کەس من لەتۆو باوکم بستێنێت، چونکە من بەرگەی دابڕانی ئێوە ناگرم.

خەدیجە پێکەنینی بەقسەی ئەم کچە بچکۆڵەیە هات و گوتی:

دڵنیابە کچە شیرین و جوانکیلەکەم تا خۆت حەزنەکەیت تۆ جێمان ناهێڵیت.

فاتیمە بەسادەو ساویلکەیی خۆیەوە گوتی:

بەڵام من هیچ حەزناکەم لە ئێوە دابڕێم.

دایکی دەستی بە قژی فاتیمە داهێناو پێیگوت:

کچی خۆم ئێستا تۆ ئاوا دەڵێیت، ئێمەش جاران کە منداڵ بووین ئاوامان دەگوت.

ئیتر دایکی کەوتە ناو دەریای یادەکانی ڕابردووی، وەکو خەو چواردەساڵ پێش ئەو کاتەی هاتەوە یاد، چۆن ئەو کاتە بەتەنیا دەژیاو نیازی شووکردنەوەی لەدڵدا نەبوو، بەڵام کاتێ چاوی بە موحەممەد(درودی خودای لەسەربێت) کەوت، بێ ئەوەی گوێ بدات بەقسەی ئەم و ئەو، خۆی هەوڵیدا شووی پێبکات و ناردی بەشوێنیدا، بگرە هەرگیز بایەخی بەتیرو توانجی قورەیشیەکان نەدا، ئاخۆ کاتێ بزانن خۆی هەوڵیداوە شوو بە گەنجێکی هەژارو نەدار بکات چی پێدەڵێن ، کەچی چەندین پیاوی سەرمایەدارو ناوداری قورەیش خوازبێنیان کرد وەڵامی نەدانەوە، ئێستا ئەگەرچی نزیکەی ماوەی پازدە ساڵە بوومتە هاوسەری موحەممەد (درودی خودای لەسەربێت)، بەڵام هەرگیز ڕۆژی بەیەکتر شادبوونی لەبیر ناچێتەوە، هەمیشە بەلایەوە ڕۆژێکی پیرۆزو شکۆدارو بەختەوەرە، یادەوەریەکان وزەو گەرمیان بەجەستەی دەبەخشی، بۆیە ئەگەرچی تەمەنی گەیشتبووە پەنجا و پێنج ساڵ کەچی هەستی بە سەرمای زستان نەدەکرد، بەڵام زنجیرەی یادەوەریەکانی بە دەنگی فاتیمەی کچی پچڕا کاتێ گوتی:

ئەرێ دایە! دووکەسەکەی خوازبێنی خوشکەکانم دەکەن کێنە؟.

ڕوقییەو ئومکەلسوم لەنزیکیانەوە وەستابوون، دایکیشی بەکورتی وەڵامی دایەوەو گوتی:

عوتبەو عوتەیبەی کوڕەکانی مام عەبدولعوزای کوڕی عەبدولموتەلیبی ئامۆزای باوکتن، دوای ئەمە خەدیجە بەوردی سەیری کچەکانی کرد، تا بزانێت کاریگەری قسەکەی لەسەر کچەکانی چۆنە، بەڵام ئەوان بە هێمنی و بەبێ دەنگی چوونەوە ژوورەکەی خۆیان، فاتیمە هەستی کرد دایکی هەراسان ونیگەران و دڵ تەنگە، وێڕای ئەمەش چووەلای خوشکەکانی، نەیزانی هۆکاری نیگەرانی و دڵ تەنگیەکەی دایکی چیە؟، پێیوابوو بەهۆی دابڕانی دووکچەکەیەوە لە ئێستاوە پەست و نیگەرانە، کەچی دوای بیرکردنەوەو هەست ڕاگرتن لە ڕازو وتەکانی دایکی، زانی نیگەرانیو پەستیەکەی بەهۆی(ئومجەمیل)ی کچی حەربە، دایکی عوتبەو عوتەیبە هاوسەری عەبدولعوزا، چونکە گەمژەیەو گێلەژنە، بە پێچەوانەی ژنانی گەورەماڵانی قوڕەیش ڕەفتار دەکات، ژنێکی زمان شڕو دڵڕەقە، خۆی بەگەورە دەزانێت و گوێ لەڕاو بۆچوونی کەس ناگرێت، چۆن ژنە خانەدانەکانی قوڕەیش هەموویان زۆر بەڕێز و گران و لەسەرخۆو هێمنن، ئیتر ئومجەمیل بەم جۆرە ناکارو خەسڵەتانەی بەهاو گەورەیی خۆی لەناو بنەماڵەکەدا لەدەستداوە.

خەدیجەخان دەیزانی کچەکانی هێشتا بچووکن، ڕەنگە نەتوانن لەگەڵ ئەم ژنە گەمژەیە بەڕێوەبچن و تووشی دەردەسەری و نەهامەتی و پەژارەبن، بۆیە نیگەران و دوودڵ بوو، ڕەنگە ئەگەر کارەکە بەدەست ئەوبوایە، ئەوا هەرگیز کچەکانی خۆی نەدەدایە ماڵی ئومجەمیل، بەڵام لەوە دەترسا لە ئاکامدا سەرجەم بنەماڵەی هاشمیەکان ڕووبەڕووی ببنەوەو بکەوێتە بەر تیرو توانج و گلەیی ئەوان،بڵێن خەدیجە دەیەوێت پەیوەندی نێوان موحەممەد و خزم و کەسانی بپچڕێنێت، وێڕای ئەمەش زۆر لە زمان و پڕوپاگەندەی ئومجەمیل دەترسا، چونکە دوور نیە لەلای سەرجەم قوڕەیشیەکان درۆو ناوو ناتۆرەی بۆ هەڵبەستێت و خەڵکی بووروژێنێتە

سەر و ژیانی لا تاڵ بکات.

هەرچەندە خەدیجە هیچ نهێنییەکی ژیانی نەمابوو لای هاوسەرەکەی باسی نەکردبێت و نەیدرکاندبێت، بەڵام ئەم نهێنییەی ئومجەمیلی لەدڵی خۆیدا هێشتەوەو نەیدرکاند،نەوەك ببێتە هۆی تێکچوون و هەڵوەشاندنەوەی خوازبێنییەکە، ئیدی لە ئاکامدا هاوسەرە خۆشەویستەکەی نیگەران و گیرۆدەبێت، چونکە خەدیجەخان بەزیرەکی و بلیمەتی خۆی و خۆشەویستی بۆ موحەممەد، زانی کارێکی گرنگ و پڕبایەخ کاریگەری کردۆتە سەر هەست ونەستی هاوسەرەکەی، ماوەیەکە سەرقاڵە، هەمیشە بیردەکاتەوە، بگرە هیچی بەلای ئەم ژیانەو جیهانەیەوە نییە، ئەگەر چی خەدیجەخان نەیدەزانی ئەم سەرقاڵیەو بیرکردنەوەیەی هاوسەرەکەی سەبارەت بەچییەو لەپێناوی چییە؟، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نەیدەویست داوای لێبکات و نهێنییەکانی تایبەتی و ناوەرۆکی بیرکردنەوەکەی بزانێت، بەڵکو حەزی دەکرد هاوسەرەکەی خۆی دەست پێشخەربێت لە درکاندنی ئەم نهێنییەی، بۆیە ویستی کەش وهەوایێکی لەبارو گونجاوی بۆ بێنێتە ئاراوە، ژینگەیەکی پڕ لە هێمنی و ئۆقرەو ئارامی بۆ دابین بکات، شەونخوونی بۆ بکات و ئاگاداری بێت وچاودێری بکات، بێ ئەوەی هەراسانی بکات و تەنیاییەکەی بشڵەژێنێت.

ئیتر خەدیجەخان لە سۆنگەی ئەم پەرۆشییەی بۆ هاوسەرەکەی، هەرگیز نەیدەویست بیرکردنەوەکەی لێڵ بکات، ئەم مەترسیەی لەدڵی ئەودا هەیە سەبارەت بە ئومجەمیلەوە لای ئەو بیدرکێنێت و سەرقاڵی بکات بەم کارەوە، نەوەك بکەوێتە ململانێ و دوودڵی لە نێوان هەڵبژاردن و دابین کردنی دواڕۆژێکی بەختەوەرو شاد بۆ کچەکانی و نێوان ڕێزگرتنی مامەکانی و شانازی کردن بە هۆزو بنەماڵەی هاشمیەکان، سەرەڕای ئەمەش بکەوێتە بەر دژایەتی کردنی عەبدولعوزای مامی و ڕق و قینەی ئومجەمیلی ماموژنی.

ئیدی لەژوورێکی نزیك دایکیان، هەردوو کچەکە ڕەنگیان بزرکاوبوو، سەریان دانەواندبوو، چاوەکانیان مۆلق وەستابوو، فاتیمە بەسەرسامیەوە سەیری دەکردن،



چونکه کاتێ زەینەبی خوشکه گەورەکەیان خوازبێنی کرا بۆ ئەبولعاس، ئەو وەك ئەم دووخوشکەی نەبوو، بەڵکو زەینەب شادمان و دڵخۆش بوو، بەشەرمەوە خەریکی خۆ ئامادەکردن بوو بۆ ڕۆژی گواستنەوەی، کەچی ئێستا ڕوقییەو ئومکەلسوم خەمۆکی و پەشۆکاون، بێگومان فاتیمە منداڵ و کاڵفام بوو، نەیدەزانی خوازبێنی ئەم دوو خوشکەی لەسەر بنەمای سۆزو خۆشەویستی و هاوشانی نەهاتۆتە کایەوە، بەڵکو لەسەر بنەمای پەیوەندی هۆزایەتی و بنەماڵەیی هاتۆتەدی.

هەرچەندە ڕوقییەو ئومکەلسوم حەزیان دەکرد پەلە نەکرێت لە بەشوودانیان، تابتوانن بیر لە دوارۆژو گۆڕانکاری ژیانیان بکەنەوە، هەوڵبدەن خۆیان ئامادەبکەن بۆ ماڵی تازە، بەڵام وێڕای ئەمەش ناقایلبوونیان پێوە دیارنەبوو دەربارەی عوتبەو عوتەیبە، چونکە خاوەن ڕەچەڵەکێکی ماقوڵی هاشمیەکان بوون، سەرەڕای ئەمەش ئەبوسوفیانی خاڵیان یەکێکبوو لەپیاوە بەناوبانگەکانی قورەیش و ڕیش سپی و خانەدانی بنەماڵەی عەبدوشەمس، وێڕای ئەمەش خانەوادەی موحەممەد (درودی خودای لەسەربێت) هەرگیز پیاوەتی و چاکەی عەبدولعوزای مامیان لەبیر ناچێتەوە، چۆن کاتێ (سوەیبە)ی کەنیزە مزگێنی لەدایکبوونی موحەممەدی برازای پێدا لە خۆشیانا ئازادیکرد، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەم دوو کچە بە گواستنەوەیان بۆ ماڵی ئەم مامەیان نیگەرانبوون، ڕەنگە نیگەرانیەکەیان لەبەر ئەوەبێت دەرفەتی بیرکردنەوەیان کەم بووبێت بۆ ئاشنابوون و خۆ ئامادەکردن بۆ ئەم گۆڕانکاریانەی دێتە سەر ژیانی ئایندەیان، یان ڕەنگە پێیان ناخۆش بووە ژیانی پڕ لە ئاسوودەییان لە سایەی دایکێکی خاتون و نەرمونیان و بەڕێز بگۆڕنەوە بە گوزەران و ژیان لەپاڵ ئومجەمیلی دڵ ڕەق و کەللەڕەق و گەمژەدا ، یان ڕەنگە حەزیان کردبێت وەك هەموو ژنێك حەز بەوەدەکات، هاوسەرەکانیان خاوەن دەسەڵات و ماڵ و حاڵی خۆیان بن، چونکە دەیانزانی ئومجەمیل دەسەڵاتی تەواوی بەسەر هەردوو کوڕەکەیدا هەیەو بەسەریاندا زاڵە، بێگومان ئەوەش لە پیاوەتی و کەسایەتیان کەم دەکاتەوە.

ئومکەلسوم بە ڕوقییەی گوت:

تۆ دەزانی باوکم ئەم کارە بەبێ ڕای ئێمە ئەنجام نادات، پێمبڵێ تۆ چ نیازێکت لە دڵدایە؟.

ڕوقییە ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا لە وەڵامدا گوتی:

من لەو کەسانە نیم سەرپێچی لە قسەی باوکم بکەم، نامەوێت لەبەردەم کەسوکارو بنەماڵەو هۆزەکەی دڵشکاو و نیگەران بێت، دوایی دەمی لەگوێی ئومکەلسوم نزیک کردەوە لەسەرخۆ زۆر بەهێمنی بە دەنگێکی پڕ لەسۆزەوە پێیگوت:

خوشکم غەم مەخۆ هەردووکمان بەیەکەوەین.

بەمجۆرە کارەکە بە هێمنی و نیمچە پەشۆکاوییێك ئەنجامدراو جێبەجێ کرا، ڕوقییە بوو بەهاوسەری عوتبە، ئومکەلسومیش بوو بەهاوسەری عوتەیبە، دەرەنجام ئەم دوو خوشکە گواسترانەوە بۆماڵی ئەبولەهەب، موحەممەد(درودی خودای لەسەربێت)لەڕۆژی گواستنەوەیاندا پیرۆزبایی لەکچەکانی کردو بەڕێی کردن بۆ ماڵی ئەبولەهەب، دوایی گەڕایەوە بۆ شوێنی تایبەتی خۆی، تا بەردەوام بێت لە بیرکردنەوەو سەرنجدان.

# هاتنەخوارەوەی سروش

نهێنییێك لەناخ و دڵ و دەروونی موحەممەد دا (درودی خودای لەسەربێت) خۆی حەشاردابوو، بۆیە هەمیشە بیری دەکردەوە، لە خەڵك دوور دەکەوتەوە، حەزی لە تەنیایی و کپ وبێدەنگی دەکرد، ئەم نهێنییەی تەنانەت لای خەدیجەخانیش کە خۆشەویسترین کەس و جێگای باوەڕ و متمانەو ئۆقرەو ئارامی بوو نەدەدرکاند، بەڵام خەدیجەخان هەستی دەکرد هاوسەرە خۆشەویستەکەی لەچ بارودۆخێکی دەروونیدایە، بۆیە زۆربەی هەرەزۆری کاتەکانی خۆی بۆ ئەو تەرخان کردبوو، هەموو هەوڵەکانی بۆدابینکردن و هێنانەکایەی ژیانێکی پڕ لە ئارامی و ئاسوودە

خستبووە گەڕ، ئیتر سەبارەت بەمە دوو کچەکەی لەبیر چووبووەوە، ئاواتەخوازبوو ئەم نهێنییەی لابدرکێنێت، تەنانەت هاوبەشی دەردو پەژارەکانی بێت، بەڵکو بتوانێت یارمەتی بدات و ئەختێك ئەو ئەرکەی لەسەرشان سووك بکات.

شەوێکی کپ و بێدەنگ بوو، لەپڕ تیشکی ڕووناکی باڵی بەسەر شەوە زەنگی تاریکیدا خشاند، سەرجەم بوونەوەرانی ئەم جیهانەی گرتەوە، لەقووڵایی ئەم شەوە زەنگە بێ دەنگەدا، خەدیجەخان وتەی (وەرەقەی کوڕی نەوفەل) ئامۆزای لەبن گوێدا زرنگایەوە، چۆن کاتێ موحەممەد(درودی خودای لەسەربێت) لە بازرگانیەتی شام گەڕایەوە، (مەیسەرە) چی لەموحەممەد بینیبوو لەگەشتەکەدا هەمووی بۆ گێڕایەوە، ئەویش هەمووی بۆ وەرەقەی ئامۆزای باس کرد ئەو کاتە وەرەقە پێیگوت:

خەدیجە ئەوەی تۆ باسی دەکەیت ئەم پیاوە ئەو پێغەمبەرە چاوەڕوانکراوەیە کتێبەکان باسی دەکەن، کەوا لەم وڵاتە سەرهەڵدەدات و تێکڕای جیهان ڕۆشن دەکات.

زرنگانەوەی ئەم یادەوەریە ئەما، کپ و بێدەنگی باڵی بەسەر تەواوی ماڵی خەدیجەدا پۆشی، ئیتر خەدیجەخان تا ئەو کاتە بەدەست شەونخوونیەوە بێزار و شەکەت و ماندوو بوو، دوای ئەوە کەوتە ناو دەریای قوڵی خەوەوە.

موحەممەد(درودی خودای لەسەربێت) ماوەیەکبوو زوو زوو دەچوو بۆ ئەشکەوتی (حەڕا)، خەدیجەخان ئەگەرچی لەماڵەوە دەمایەوە، بەڵام دڵ و گیانی هەمیشە لەگەڵ هاوسەرەکەیدابوو، تەنانەت ئەوەندە بەپەرۆش بوو بۆی خۆی بۆ نەدەگیرا، بۆیە یەکێکی بە شوێندا دەنارد تا پاسەوانی بکات و هەواڵ و باس و خواسی بۆ بێنێتەوە، چونکە هەمیشە بە هیواو ئاواتی دەرکەوتنی خۆری پرشنگداربوو لە هاوسەرەکەی، سەرەڕای ئەمەش هەست و سۆزی دایکایەتی، ڕوقییەو ئومکەلسومی خستەوە یاد، بەزەیی پیاهاتنەوە، چونکە لە چنگ ئومجەمیلدا لە ژیانێکی مەرگەساتیدا دەژیان، بەڵام بەهۆی ئەم کارە پیرۆزەی بۆ ماوەیەکی دوورو درێژە چاوەڕوانیەتی و سەرجەم ژیانی خۆی بۆی تەرخان کردوە خێرا دوو کچەکەی لەبیر دەچووەوە.

# کاردانەوەی پێغەمبەرایەتی

ئەو هیوایەی چەندین ساڵبوو خەدیجەخان بەپەرۆشەوە چاوەڕوانی دەکرد هاتەدی، موحەممەد(درودی خودای لەسەربێت) پەیامی پەروەردگاری مەزنی بەسروش بۆ دابەزیە خوارەوە، دەستی کرد بەبانگەوازی خەڵك بۆ ڕێگای ڕاست و ڕەواو باوەڕ هێنان بە خوایەکی تاك و تەنیاو مەزن، قورەیشیەکان بۆ بەرپەچدانەوەو دژایەتی کردنی ئەم بانگەوازە پیرۆزە کۆبوونەوە، دەرەنجام بڕیاریاندا گوتیان:

بۆ ئەوەی موحەممەد سەرقاڵ بێت و کێشەی دەروونی و خێزانی بۆ ببێتە کۆسپ و تەگەرە، ئیتر بەری بەبانگەوازکردنی ئایینەکەی نەمێنێت، پێویستە هەرسێ زاواکەی دەستبەرداری کچەکانی بن.

بۆ جێبەجێ کردنی ئەم بڕیارە یەك لەدوای یەك داوایان لە هەرسێ زاواکان کرد تا دەستبەرداری هاوسەرەکانیان بن، پێیانگوتن:

ئەگەر دەست لە هاوسەرەکەت بەربدەیت، بۆخۆت سەرپشکبە کامە ژنی قورەیشیت دەوێ بۆت دەهێنین.

ئەبولعاس ئەم داواکاریەی جێبەجێ نەکرد، دەستبەرداری زەینەبی هاوسەری نەبوو، چونکە زەینەبی لەسەرجەم ژنانی قورەیش بەلاوە چاکتربوو، بەڵام دوو کوڕەکەی ئەبولەهەب ئەم داواکاریەیان جێبەجێ کرد، ڕوقییەو ئومکەلسومیان ناردەوە ماڵی باوکی، تەنانەت عوتبە لە شوێنی ڕوقییەدا ژنێکی لە بنەماڵەی سەعیدی کوڕی عاس هێنا.

سەرەڕای ئەمەش دووکوڕەکەی ئەبولەهەب پێویستیان بەم داواکاریەی قورەیش نەبوو، تا دەستبەرداری دوو کچەکەی موحەممەد(درودی خودای لەسەربێت) بن، چونکە ئومجەمیلی دایکیان ئەنجامدانی ئەم کارەی گرتبوە ئەستۆی خۆی، کاتێ

سوێندی خواردو گوتی:

من لە ژێر سێبەری ئەم خـانووە دانانیـشم کـە کـچەکانی موحەممـەد لەسایەیدا بژین، دوای ئەمە لەبن گوێچکەی ئەبولەهەبی خوێند، هەوڵیدا تەنانەت ڕقی هەستا لە ئاست دوو کچە بێ تاوانەکەدا، لە ئاکامدا ئەبولەهەب بە کوڕەکانی گوت:

دیدارو بینینی ئێوە لەمن حەرام بێت، ئەگـەر دەسـت لـە کچەکانی موحەممـەد بەرنـەدەن، ئەگەرچی هەرگیز چاوەڕوانی ئەم هەڵوێستە لەم پیاوە نەدەکرا دەربارەی نەوەکانی عەبدوڵڵای برای چۆن لەکاتی خـۆی کارکـەرێکی بـۆ مزگێنـی لـەدایکبوونی موحەممــەدی بــرازای ئــازاد کردبــوو، هــەروەها لــە دوو کوڕەکــەش چــاوەڕوانی دەســتبەردابوونیان لێ نــەدەکرا، بــەڵام ئومجـەمیل دەســەڵاتی خـۆی بــە جۆرێــك ســەپاندبوو بەســەر بــاوك کوڕەکــانی، لەئاســت ئــەودا هــیچ پیــاوەتی و ویــست و دەســەڵاتێکیان نــەبوو، بـەجۆرێك کاریگـەری لەسـەر ئەبولەهەبـدا هـەبوو تەنانـەت خــوێنی لاشــەکەی ژەهــراوی بــوو لەئاســت بنەماڵەکـەی خـۆی، واتــە بنەماڵــەی هاشمیەکان، چونکە سەرجەم مافەکانی مام و برازایەتی دەربارەی موحەممەد(درودی خودای لەسەربێت) لەبیر چووبووەوە، بگرە لە هەموو کەسێك زیاتر دژایەتی دەکرد، ئومجەمیل لە بنەماڵەی عەبدوشەمس بوو، بنەماڵەی هاشمیـەکان دەسـەڵات و نـاو و ناوبانگیان لە بنەماڵەی ئەو زیاتربوو، ڕەنگە بۆیە هەوڵەکانی خستبێتە گـەڕ تـا درز بخاتە نێوان بنەماڵەی هاشمیـەکان، تەنانـەت لـە یـەکتر دابـڕێن و دژایـەتی یـەکتری بکەن، بەڵکو دەرەنجام مایە پووچ بـن و بنەماڵەی خـۆی بەسـەریاندا زاڵ بکـات، یـان ڕەنگە لە ئاکامی ئەم ڕفوفینە بووبێت کەبۆ خەدیجەخانی هەبێت، چونکە خەڵك بە چاوی پڕ لە ڕێزو خۆشەویستی و ڕێزەوە سەیری خەدیجەخانیان دەکـرد، ئـیتر بۆیـە هـەوڵی دەدا خـەڵك دژایـەتی موحەممـەد(درودی خـودای لەسـەربێت) بکـەن تـەنیا بۆئەوەی بتوانێت نائارامی و ئاژاوە بخاتە ناو خێزانەکـەیان، تەنانـەت ئـەو خۆشـی و ئاسوودەیی و بەختـەوەریـەی هەیانـە لـەناو بـەرێت، چونکە خێزانەکـەیان نموونـەی



خێزانی بەختەوەربوو، بۆیە تەنیا بە دەستبەردابوونی دوو کچەکەی نەوەستا، بەڵکو خۆی و ئەبولەهەبی هاوسەری دژوارترین و سەرسەخترین کەس بوون لە ئاست پێغەمبەردا(درودی خودای لەسەربێت)، بگرە ئەو پەڕی دوژمنایەتیان دەکرد، هیچ کەسێك لەبنەماڵەی هاشمیەکان هێندەی ئەبولەهەب پارمەتی قوڕەیشیەکانی نەداوە بۆ دژایەتی کردنی برازا مەزنەکەی، پێموایە ئەم هەڵوێستە سەیرەی ئەبولەهەب پێویست بە هەڵوەستەیەك دەکات، چونکە هەرچەندە زۆربەی هاشمیەکان لەسەر ئایینی باوك و باپیرانیان مابوونەوە، باوەڕیان بە ئایینی پیرۆزی ئیسلام نەهێنابوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا وەك ئەبولەهەب لەگەڵ کوڕی عەبدوڵڵادا نەکەوتنە ململانێ و دژایەتی و بەگژداچوونەوەو پلان داڕشتن و دەست تێکەڵکردن لەگەڵ ناحەزانی بۆ لەناوبردنی.

بۆ نموونە: سەیرکە هەڵوێستی حەمزەی کوڕی عەبدولموتەلیب برای ئەبولەهەب تەواو بە پێچەوانەی ڕەفتاری ئەبولەهەبە، حەمزە هێشتا موسڵمان نەبووبوو، ڕۆژێك کەوانەکەی لە ملی خۆی کردبوو لە ڕاو دەگەڕایەوە بۆ مەککە، ژنێك لە ڕێگادا حەمزەی بینی و پێیگوت:

حەمزە خۆزگە نەختێك پێش ئێستا دەهاتی، ئینجا دەتبینی ئەبولحەکەمی کوڕی هوشام چ سووکایەتییەکی بەبرازاکەت کرد، کاتێ لێرە دانیشتبوو، هات ئازارو ئەشکەنجەیدا جنێوی پێداو قسەی ناشیرین و ناڕێکی پێگوت.

حەمزە کاتێ ئەمەی بیست ڕقی هەستا، بە توندی ڕۆیشت بەدوای ئەبولحەکەمدا گەڕا، جا دۆزیەوە بینی لەگەڵ چەند کەسێك لای (کەعبە) دانیشتبوو، حەمزە چوو لەسەر سەری وەستا، کەوانەکەی لەملی خۆی کردەوە بەرزی کردەوە لەتەوقی سەری ئەبولحەکەمی دا، پێیگوت:

جنێوی پێ دەدەیت، نازانی من لەسەر ئایینی ئەوم؟، ئەوەی ئەو بانگەوازی بۆ دەکات، منیش باوەڕم پێی هەیە، ئەگەر دەتوانی ئەوەی بە برازاکەمت گوتوە بەمن

بڵێ.

ئیتر بەمجۆرە حەمزە(خودا لێیڕازیبێت) موسڵمان بوو، بەڵام سەیرکە چۆن نەیتوانی لەئاست ئازاردانی برازاکەی بێ دەنگ بێت و دەستەوەستان بوەستێت، سەرەڕای ئەمە لەمێژوودا باسی هیچ یەکێك نەکراوە لەبنەماڵەی هاشمیەکان یان لەکوڕەکان و نەوەکانی عەبدولموتەلیب، ئەگەر موسڵمانیش نەبووبێت، لە ئەبولەهەب بەملاوە دژی موحەممەد (درودی خودای لەسەربێت) وەستابێت و ئازاری دابێت.

ئیبنی عەباس(خودا لێیڕازیبێت) دەڵێ:

کاتێ خودای دەسەڵاتدارو پڕ توانا ئایەتی پیرۆزی دابەزاندو فەرمووی: ﴿ وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ ٱلْأَقْرَبِينَ ﴿٢١٤﴾ ﴾ الشعراء: ٢١٤

واتە:گەف لەخزمە نزیکەکانی هۆزەکەت بکە.

پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) بە نیازی جێبەجێکردنی ئەم فەرمانە پیرۆزە لەماڵ دەرچوو، تەنانەت گەیشتە (صەفا)، لەوێ سەرکەوت لە شوێنێکی بەرز وەستا بەدەنگێکی بەرز فەرمووی:

ئەی کۆمەڵانی قورەیش.

خەڵکەکە گوتیان ئەمە کێیە؟.

ئیتر بەدەوریدا کۆبوونەوە، پاشان فەرمووی:

ئەرێ ئەگەر پێتان بڵێم وڵاخێك لە دامێنی ئەم شاخە هاتۆتە دەرەوە، ئێوە باوەڕم پێدەکەن؟.

خەڵکەکە گوتیان:

هەرگیز درۆمان لەتۆ نەبیستوەو نەبینیوە.

فەرمووی:

مـن پێتـان ڕادەگەیـەنم و ئاگادارتـان دەکەمـەوە، کـە دواڕۆژێکی پـڕ لـە ئـازار و ئەشکەنجەی دژوارو توندو تیژ چاوەڕوانتانە.

ئەبولەهەب گوتی:

دەك لەناو بچیت و نەمێنیت، تەنیا بۆ ئەمە ئێمەت لێرە کۆکردۆتەوە ؟.

بۆ ڕسواکردنی ئەبولەهەب خودای مەزن و کاربەجێ ئەم سوڕەتە پیرۆزەی ناردە خـــــوارەوە: ﴿ تَبَّتْ يَدَا أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ ﴿١﴾ مَا أَغْنَىٰ عَنْهُ مَالُهُ وَمَا كَسَبَ ﴿٢﴾ سَيَصْلَىٰ نَارًا ذَاتَ لَهَبٍ ﴿٣﴾ وَامْرَأَتُهُ حَمَّالَةَ الْحَطَبِ ﴿٤﴾ فِي جِيدِهَا حَبْلٌ مِّن مَّسَدٍ ﴿٥﴾ ﴾ المسد: ١ – ٥

واتە: ئەبولەهەب لەناوبچێت و نـەمێنێت و ڕسوابێت، هـەروەك نـەماوەو ڕسوا بووە، ئەم سامان و ناوبانگەی هەیبوو بەدەستی هێنابوو، هیچ سوودێکی نەبوو بـۆی، دەخرێتــە ئــاگرێکی گڵپــەدارو بڵێـسەدار، ژنەکەیـشی دەخرێتــە ئــاگری گڵپــەدارو بڵێسەدارەوە، چـۆن ئـەو ژنـە دارو دڕکـی بەشـەو دەهێنایـە سـەر ڕێگـای پێغەمبـەر (درودی خودای لەسەربێت)بۆیە تەنافێك(کندرێك)وەك لیفکە لەملی ئاڵاوە، چونکە ملوانکەیەکی گەوهەری زۆر نایابی هـەبوو لـە ڕێگـای ئـازاردانی موحەممـەد (درودی خودای لەسەربێت) فرۆشتبووی.

ئیبن ئیسحاق دەڵێ:

بیستوومە کاتێ ئومجەمیلی دارکێش ئەمەی بیستوو گوێی لێبوو چی دەربـارەی ئەوو مێردەکەی هاتووە، بەردێکی پڕ بەچنگی خۆی هـەڵگرتوو بـەدوای پێغەمبـەردا (درودی خودای لەسەربێت) چوو، کە لەگـەڵ ئەبەبـەکری صدیق(خـودا لێیڕازیبێـت) لـەلای کەعبـەی پـیرۆزدا دانیـشتبوو، کاتـێ گەیـشتە لایـان لەسـەر سـەری ئەبوبـەکر وەستاو گوتی:

ئەبوبەکر ئەی کوا برادەرەکەت لەکوێیە؟.

خودای مەزن و باڵادەست ئەم ژنە دارکێشەی لەئاست پێغەمبەردا(درودی خودای لەسەربێت) کوێرو نابینا کرد، هەروەها گوتی:

بیستوومە گاڵتەی بـەمن کـردوە!، بـەخودا ئەگـەر بیدۆزمـەوە ئـەم بـەردە لـەناو دەمی دەدەم، پاش ئەوە گوتی خۆمن شاعیریش نیم بەڵام:

سەرزەنشت کراوە لێی یاخیبووین

لەکارو فەرمانەکانی قەدەغەبووین

ئایینەکەیشمان بەلاوەنا

دوای ئەمە ڕۆیشت، ئەبوبەکر(خودا لێیڕازیبێت) گوتی:

ئەی پێغەمبەری خودا(درودی خودای لەسەربێت) ئەو ژنە تۆی نەبینی؟.

فەرمووی:

خودا لەئاست من دیدەی کوێرکرد، منی نەبینی.

سـەبارەت بـەم ژنــە دارکێـشە، شـاعیرێکی ئەنـصاری ( (ئەلئـەحوەص کـوڕی عەبدوڵڵا کوڕی موحەممەد کوڕی عەبدوڵڵا ئەلدوسی) دەڵێ:

**هەموو کەس ژنە تەناف لەملەکە لەناوەڕاستی**

**دۆزەخدا دەبینێت و لەکەس نابێت شاراوە**

**تەنافەکەی ئەو لەتەنافی سەرجەم دۆزەخیەکان**

**جیاوازە لەشێـــوەی لیـفکەی چنـــراوە**

ئەبولەهەبی باوکی عوتبە، بەدرێژایی تەمەنی تەنیا یەك جار هەست و سۆزی بۆ موسڵمانان جووڵاوەتـەوە، ویـستوویەتی بـەرگریان لێبکات، هەرچـەندە مەبەستی بەرگریەکـەی بـۆ بنەماڵـەی هاشمیـەکان بـوو، بـەڵام سـەبارەت بـە موسـڵمانەکانبوو ڕووبەڕووی قورەیشیەکان بووەوە، چۆن دەگێڕنەوەو دەڵێن:

ئەبوسەلەمەی ئەلەخزومی کوڕی بیرەی کچی عەبدولوتەلیب دەبێتە موسـڵمان، کاتێ قورەیـشیەکان بـۆ پەشـیمان کردنـەوەی دەیانـەوێت ئـازاو ئەشـکەنجەی بـدەن،

ڕادەکـات و پـەنا بـۆ مـاڵی ئـەبوتالیبی خـاڵی دەبـات، هەنـدێ پیـاوانی بنەماڵـەی ئەلەخزوم بەدوای ئەبوسەلەمەدا دێنە لای ئەبوتالیب، پێیدەڵێن:

دەســتبەرداری موحەممــەدی بــرازات نــەبوویت و نەتدایــە دەســت، بــەڵام ئەبوسەلەمە لەبنەماڵەی ئێمەیە، هیچ پەیوەندییێکی بەتۆوە نیەو بیدەرەوە خۆمان.

ئەبوتالیب گوتی:

ئەبو سەلەمە کوڕی خوشکمە، پەنای بۆمن هێناوە، ئەگەر بەرگری لە کوڕی خوشکم نەکەم، کەواتە بەرگری لە کوڕی براشم ناکەم.

ئەبولەهـەب ئەوکاتـە لای ئـەبوتالیبی بـرای دانیـشتبوو، لـەناکاو بەتوڕەییـەوە گوتی:

کۆمەڵانی قوڕەیش، ئێوە زۆرتان لەم پیاوە پیرەکرد، دەتانەوێ بەزۆرداری لەناو ماڵو کەسوکاریدا پەنابەرەکەی لە دەست دەربێنن، بەخوا گەر واز نـەهێنن، ئێمـەش پاڵپشتی لـە ئـەبوتالیب دەکـەین و هەرچی بیـەوێت بۆی جێبـەجێ دەکـەین هـەتا دەگاتە مەبەستی خۆی.

ئـیتر مەخزومیـەکان ویـستیان ئەبولەهـەب لەگـەڵ کافرەکـان بمێنێتـەوە، بۆیـە گوتیان:

بـاوکی عوتبـە! تـۆ کەحەزناکـەیت ئـەبوتالیب دەسـتبەرداری پیاوەکـەبێت و ڕادەستی ئێمەی نەکات، ئەوا ئێمە دەڕۆین.

بەڵام لەم هەڵوێستە زیاتر نەمانزانیوە ئەبولەهەب جارێکی تر، یان لـەوە زیـاتر یارمـەتی لایـەنگران و دۆسـتانی برازاکـەی و بنەماڵەکـەی خـۆی دابێـت، بـەڵکو بـە پێچەوانەوە هەمیشە یارمەتی دوژمنانی داوە، تەنانەت تاکو مردن دژی بنەماڵەکەی خۆی، واتە هاشمیەکانیش وەستاوە، چونکە نومجەمیل بەجادوگەری و تەڵەکەبازی واکوێری کردبوو لە ئاست بنەماڵەی هاشمیەکان، بۆیـە نـەپیاوەتی و نەمرۆڤایـەتی و نەهاشمیەتی لەدڵ و دەروونی ئەبولەهبدا نەمابوو بگرە هەمووی بەلاوەنابوو.

لە کتێبەکانی ژیاننامەی پێغەمبەردا (درودی خودای لەسەربێت) هاتووە، کاتێ بنەماڵەی هاشمیەکان و موسڵمانان لە دۆڵی ئەبوتالیبدا ئابلووقەیان بەسەردا سەپێندرا، لەبارو دۆخێکی سامناکدا گوزەرانیان دەکرد، هەمیشە لە مەرگەساتی و قاتوقڕییەکی یەکجار مەترسیداردا دەژیان، تەنانەت ئەگەر کاروانێکی بازرگانی بهاتبوایە بۆ شاری مەککە، یەکێکیان بچووبایە بۆ کڕینی بڕەخۆراکێك لەکاروانەکە، ئەوا ئەبولەهەب خێرا دەچووە لای بازرگانەکان پێیدەگوتن:

نرخی کەلوپەل وکاڵاکانتان بەرزبکەنەوە بۆیاوەرانی موحەممەد، بەڵکو نەتوانن بیکڕن، من زامنی زیانەکانی ئێوەم، ئێوە خۆشتان دەزانن من خاوەنی چ ماڵ و سامانێکی زۆرم و چەند وەفاداریشم بۆ ئەو بەڵێنانەی دەیانگرمە ئەستۆ، ئیتر بازرگانەکان بەهای کاڵاکانیان چەند جار لە نرخی خۆی زیاتر دەکرد، لە ئاکامدا موسڵمانان یان هاشمیەکان بەدەستی بەتاڵ دەگەڕانەوە بۆلای ماڵ و منداڵە برسیەکانیان، هیچیان بۆ نەدەکڕا، تا دەرخواردیان بدەن، بازرگانەکانیش ئەگەر لە ئەنجامی ئەم کارەیاندا زیانیان بەرکەوتبوایە، ئەوا دەچوونە لای ئەبولەهەب زیانەکانی بۆ قەرەبوو دەکردنەوە.

ئەمە ڕەفتاری ئەبولەهەب بوو لەگەڵ موسڵمانەکان و بنەماڵەی هاشمیەکان، بۆیە ئابلووقەکە کاریگەری زۆری کردە سەر موسڵمانەکان و تەواو بێزاربووبوون لە چنگ برسیەتی و ڕووتی و ڕەجاڵیدا.

ڕەفتارەکانی ئەبولەهەب لەئاست موسڵمانان و بنەماڵەی هاشمیەکاندا سەرنجی زۆر ڕاکێشام، بۆیە نەختێك بایەخم پێیدا لەبابەتی سەرەکی دووری خستمەوە.

ئیتر لەمیانەی ئەمەی ڕابردوو دەزانی هەڵسوکەوتی ئەم ژنە گەمژەیە کاڵفامە چۆن بووە لەگەڵ دووکچەکەی موحەممەد(درودی خودای لەسەربێت)، بێگومان ئەم دوو کچە، ڕوقییەو ئومکەلسوم لەبەختەوەرترین خێزانی مەککەدا پەروەردەکرابوون و ژیانیان بردبووە سەر، ئەو خێزانەی هەمیشە خۆشەویستی و ئارامی باڵی بەسەردا



کێشابوو، بەڵام لەماڵی ئەبولەهەبدا لە جیاتی پێشوازی گەرم و ڕوویێکی خۆش و گەش، ڕووبەڕووی چاودێری ژنێکی ڕەزاقورس بووبوونەوە، لەهەموو جووڵەیەك و هەستان و دانیشتنێکیان دەکۆڵێتەوە، لە هەموو ئاوڕدانەوەیەك و سەیرکردنێك و چپەیەك لێپرسینەوەیان لەگەڵدا دەکات، ئومجەمیل هەرچەند ئاکارو خەسڵەتی جوانی و ماقوڵی وخانەدانی لەم دووکچەدا بەدیدەکرد، خەدیجەخانی دایکیانی بیردەکەوتەوە، بێگومان زۆر ڕقی لە خەدیجەخان دەبووەوەو ئیرەیی هەبوو بۆی، ئیتر جامی توڕەیی و ڕقوقینەی دایکەکەشی بەسەر سەری ئەم دووکچەدا دەڕشت و تۆڵەی ئەویشی لەم دووکچە دەکردەوە.

ئەگەر بهاتایە ئەم دوو بووکە لەئاست خەسویاندا بێدەنگ بوونایەو هەڵوێستیان نەرمبوایە، ئەوا ئەو بەهەڵە ئەم هەڵوێستەی وەردەگرت و لووتی بەرزدەبوو، لەخۆی بایدەبوو، هێندەی تر لە ئاستیان دڵڕەقترو خراپتر دەبوو، سەرەڕای ئەمەش ڕۆژێ لە ڕۆژان ئەم دوو کچە بیریان لەوە نەکردەوە سکاڵاو کێشەکەیان بەرنەلای باوك و دایکیان، تەنانەت هیچ گلەییێکیان لای ئەوان نەدەدرکاند، نەوەك بە ڕەفتاری ئومجەمیل نیگەران و سەرقاڵ بن، بەڵکو ئەگەر بهاتایە ئومجەمیل لەماڵ دەرچووبا کە ئەمەش زۆر دەگمەن بوو، ئەو کاتە هەردوو خوشکەکە هەریەکەو گلەییەکەی خۆی لای ئەوەی تر باس دەکردو دەدرکاند، ئیتر هەناسەیەکیان دەهاتەوەبەرو گرێی ناو دڵیان بۆ یەکتری دەکردەوەو تۆزێك ئاسوودە دەبوون، چونکە ئومجەمیل هەرگیز دەرفەتی پێنەدەدان بەیەکەوە کۆببنەوەو دابنیشن، بەڵکو ئەگەر بۆی برەخسابوایە بەربەستێکی لەنێوانیاندا دروستدەکرد تەنانەت بەیەك نەگەن، تا بەمجۆرە بێدەنگو هێمنبوون، خۆڕاگربوون لەئاست ئەم دەردو پەژارەیە، هەتا خودا لەچنگ دەردو خەفەتی ئەم ژنە دارکێشە تەناف لەگەردنە ڕزگاری کردن.

# گەڕانەوە بۆ ماڵی باوك

ژیان و گوزەرانی ماڵی باوکی ڕوقییە وەك جارانی پێش شووکردنی نەبوو، بەڵکو گۆڕانکاری و جیاوازییێکی زۆری لەگەڵ سەردەمی پێشوو هەبوو، ڕوقییە وەك جاران بەختەوەری و هێمنی تێدا بەدی نەدەکرد، چونکە سەرجەم ئەندامانی خێزانەکەی تەنانەت کارکەرو دەستوپێوەندەکانیش سەبارەت بە ئایینی پیرۆزەوە هەمیشە لە شەونخونی و چەوسانەوەو ئەشکەنجەو ئازاردابوون، باوکی(درودی خودای لەسەر بێت) هەرکاتێك لەماڵ دەردەچێت، لە ئاکامی گاڵتەو تیروتوانج و قسەی ناڕێك و ناشیرینی هۆزەکەی و قەدەغەکردنی لە بڵاوکردنەوەی ئایینەکەی بەدڵێکی پڕ لەغەم و پەژارەوە ڕووەو ماڵ دەبێتەوە، بەڵام خەدیجەخانی دایکی بەدەربڕینی وتەی پڕ لەسۆزو خۆشەویستی و نەرمونیانی هێوری دەکاتەوە، بگرە ورەی بەرزتر دەکاتەوەو خۆڕاگرتری دەکات، غەم و پەژارەکانی لەبیر دەباتەوە.

سەرەڕای ئەم ئەهامەتی و دەردەسەرییە، ڕوقییە و ئومکەلسوم ژیانی ماڵی باوکیان زۆربەلاوە خۆشتربوو لەژیانی پڕ لەمەرگەساتی ماڵی ئومجەمیلی دارکێش، هەمیشە هەستیان بە ئاسوودەیی و کامەرانی دەکرد، کە هاوبەشی ئازارو مەینەتیەکانن لە پێناو ئایینی پیرۆزی خودای مەزندا.

ئەم گومانەو بۆچوونەی قورەیشیەکان پلانیان بۆی دارشت هەڵەبوو، چونکە بەهاتنەوەی ڕوقییەو ئومکەلسوم بۆماڵی باوکیان، موحەممەد(درودی خودای لەسەر بێت) نیگەران و سەرقاڵ نەبوو، بەڵکو زۆر ئاسوودەو شاد بوو، کە کچەکانی لەم ژیانە ناخۆشە ڕزگاربوون و بەئاسانی دەستیان لەم دوژمنە دڵ ڕەق و سەرسەختە بەربوو، ئەوەندەی نەخایاند ڕوقییە هاوسەرێکی چاکتری پێبڕا، پیاوێکی خانەدان و ماقوڵ و دڵفراوان بوو، یەکێکبوو لە پێشەنگی موسڵمانبووەکان، هەشتەم کەس بوو موسڵمان بووبوو، لەم دە کەسەبوو لە ژیاندا مژدەی چوونە بەهەشتی پێدرابوو، بوو



بەهاوسەری عوسمانی کوڕی عەففانی کوڕی ئەبی عاصی کوڕی ئومەییەی کوڕی عەبدوشەمس، جگە لەوەی موسڵمانە، لە سەرجەم گەنجەکانی دیکەی قوڕەیش ڕەسەنترو ناسراوترە، لەگەڵ ڕەچەڵەکی باوکی، لە عەبدومەناف کوڕی قوصەی دەبنەوە یەك پشت و یەکتر دەگرنەوە، سەرەڕای ئەمە نەنکی عوسمان واتە(داپیرەی) دایکی دایکی، بیچاو ئوم حەکیم کچی عەبدولموتەلیبی باپیرەی باوکی ڕوقییە بوو، واتە دایکی عوسمان کچە پووری باوکیەتی.

عوسمان وێڕای ئەم ڕەچەڵەکە بەرزو دیارەی، پیاوێکی گران و سەنگین و بەشەرم و بە ئابڕوو بووبڕەوشت بەرزو دەوڵەمەندبوو، سەبارەت بلیمەتی و لێهاتوویی ئەم کەڵەپیاوە، عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود(خودا لێیرازیبێت) دەڵێ:

عوسمان لە هەمووومان زیاتر هاموشۆو سەردانی خزمانی دەکرد، بە دڵنیاییەوە یەکێك بوو لەو موسڵمانانەی ئەم ئایەتە پیرۆزە دەیگرێتە خۆی کە خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿ وَءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ثُمَّ ٱتَّقَوا۟ وَّءَامَنُوا۟ ثُمَّ ٱتَّقَوا۟ وَّأَحْسَنُوا۟ ۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٩٣﴾ ﴾ المائدە: ٩٣ .

واتە: یەکێك بوو لەم موسوڵمانەی باوەڕیان بەخودای مەزن و ئایینی پیرۆزی ئیسلام هێناو چاکەکاریان ئەنجامدا، دوایی خواپەرستیان کردو باوەڕیان تۆکمەترو زیاتربوو، دووبارە خۆیان لە هەموو کردەوەیەکی نارێك پاراست و خواپەرستیان کردو کارو ڕەفتاری چاکیان ئەنجامدا، خودای مەزن چاکەکارانی خۆشدەوێت، خودای مەزن عوسمانی بەرزو دەسەڵاتدارکرد، یەکێبوو لە پێشەنگ و پێشەوای موسڵمانان.



# هاوسەرگیری عوسمان و ڕوقییە

عوسمانی کوڕی عەففان(خودا لێیڕازیبێت) هەتا شکۆمەندبێت و زۆر لە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێت) نزیك بێتەوە، داخوازی ڕوقییەی کرد، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێت) قایل بوو، کچەکەی خۆی کردە هاوسەری.

ڕوقییەو عوسمان دوو هاوسەری لەبارو بۆ یەکتر گونجاو بوون، دەگێڕنەوە ژنان لە کاتی زەماوەندی ئەم دوو کەسەدا بەدەم گۆرانییەوە دەیانگوت:

مرۆڤ چاکترین دووکەسی بینی ڕوقییەو عوسمانی هاوسەری

بەڵام لە ئاهەنگی بووك گواستنەوەکەدا، جگە لە ژمارەیەکی کەمی موسڵمانان نەبێت خەڵکی مەککە بەشداریان تێیدا نەکرد، قورەیشیەکان لە ئاست ئەم دوژمنەیان سەرسام بووبوون، چونکە هەرچەند زیاتر تووشی مەینەتی و دەردەسەری دەبێت، خۆڕاگرترو بەهێزتر دەبێت، خۆی و ئەم ژمارە کەمەی یاوەرەکانی لەبەردەم سەرجەم هۆزو بنەماڵەکانی قورەیشدا وەستاوون و بوونەتە خاوەن دەسەڵات و هێز، یاوەرەکانی موحەممەد، موحەممەدیان لا خۆشەویسترە لە خۆیان و ماڵ و منداڵیان، ئامادەن خوێن و گیان و ماڵیان بەخت بکەن لە پێناویدا، تەنانەت خۆبەخت کردنیان لەپێناو ئایینەکەیدا بەلاوە سەرکەوتن و سەربەرزیە، هەندێ لە یاوەرانی تا دوێنی دژایەتیان دەکرد، هێندێکی تریان تا ماوەیەك دوودڵبوون لە باوەڕهێنان بە ئایینەکەی، کەچی کاتێ موسڵمانبوون و باوەڕیان بە خودای تاك و تەنیاو ئایینی ئیسلام هێنا، هەموویان خۆشەویستییەکی بێ هاوتایان بۆ موحەممەد (درودی خودای لەسەربێت) لە دڵدا جێگیر دەبێت، کە هاوشێوەی نیە لە جیهاندا.

ئیتر لەشەوی گواستنەوەی ڕوقییە بۆ عوسمان(خودا لێیان ڕازیبێت)، خەڵك تەنیا باسی عوسمانیان دەکرد، چونکە لەناو هۆزەکەیدا پیاوێکی ماقوڵ و خاوەن



جێگاو ڕێگایەکی دیارو ڕێزداربوو، پێیان سەیربوو چۆن ژیانی خۆی جێهێشتو بووە موسڵمان، سەرەڕای ئەوەی دەیزانی ئەوانەی دەبنە موسڵمان چجۆرە ئازارو ئەشکەنجەیەك دەچێژن لەدەست بنەماڵەکانیان، کەچی سەرەڕای ئەمەش لەپێناو ڕەزامەندی موحەممەدو خوداکەی، کەسوکارو بنەماڵەی جێهێشت و موسڵمان بوو، باکی بەوە نەبوو دەکەوێتە بەر ڕقوقینەو دوژمنایەتی سەرجەم قورەیشیەکان.

ئیدی قورەیشیەکان کەوتنە بیرکردنەوە لەم ئازارو ئەشکەنجانەی بە موسڵمانانیان دابوو تاکو پەشیمان ببنەوە، لێدان و کوتەك، برسیەتی، تێنویەتی، ئەشکەنجە و ئازاردان لە قرچەی خۆرەتاوی نیوەڕۆی مەککەدا، کەچی وێڕای هەموو ئەم دەردەسەریە، مردنیان لاچاکتربوو لەپەشیمان بوونەوە لەئایینەکەیان و گەڕانەوەیان بۆناو ڕیزی هەرەزۆری هۆزەکەیان

# کۆچکردن

ماوەیەکی کەم بەسەر هاوسەرگیریەکەیاندا تێپەڕیبووبوو، شەوێك لاوچاکی بنەماڵەی ئومەییە عوسمانی کوڕی عەفان(خودا لێیرازیبێت) مەککەی وڵاتی باوکو باپیران و ئەو شارەی تێیدا چاوی بە جیهان هەڵێناو تێیدا گەشەی کرد، جێیهێشت و بەرەو وڵاتێکی دوورو میللەتێکی نامۆ کەوتە ڕێ.

پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) دەیبینی ڕۆژانە یاوەرەکانی ڕووبەڕووی ئازارو ئەشکەنجەو ستەم دەبنەوە، ئەویش ناتوانێت بەهیچ شێوەیەك ئەم نەهامەتی و ئازارەیان لەسەر لابەرێت و ناحەزان و دوژمنانیان قەدەغەبکات، بۆیە لە ئاکامی ئەم ستەم و زۆرداریەو بۆ ڕزگارکردنی یاوەرەکانی فەرمووی: ئەگەر کۆچ بکەن و بچن بۆ وڵاتی(حەبەشە)، پادشایێکی دادپەروەرو مرۆڤ دۆستی هەیە، لای ئەو، کەس ستەمی لێناکرێت، لەسایەی ئەودا حەبەشە وڵاتی ڕاستگۆییە، لەم وڵاتە بمێننەوە،

هەتا خودای باڵادەست و مەزن چارەیەکتان دەکات و لەم ژیانە مەرگەساتیە ڕزگارتان دەکات.

ئیتر عوسمان و ڕوقییە لە پێشەنگی کۆچبەران بوون بۆ وڵاتی حەبەشە، تاریکی شەو تەواو باڵی بەسەر زەویدا خشابوو، عوسمان بەئەسپایی لەشاری مەککە چووە دەرەوە، پاشان بەمەبەستی ماڵئاوایی کردن لە شارە خۆشەویستەکەی لە شوێنێکی بەرز وەستاو ئاوڕی دایەوە، قوڵپی گریان پاڵەپەستۆی خستبوە سەر قوڕگی خەریکبوو سەربکات، فرمێسک لە چاوەکانیدا قەتیس وەستابوو، بەڵام توانی دان بەخۆیدا بگرێت، ئەگەرچی نەیتوانی یەك وتە دەربڕێت، بۆ ساتێکی کەم ڕوقییە لە عوسمان دابڕا ڕووی لەماڵی باوکی کرد، کاتێ چاوی بە خانووبەرەی ماڵی باوکی کەوت شوێنی یادەوەریەکانی تەمەنی منداڵی، فرمێسکەکانی چاوی بۆ نەگیرا، یەکەیەکە دەستی لە ملی باوك و دایك و سێ خوشکەکانی کرد، ماڵئاوایی بەدەم گریانەوە لەماڵی باوکی کرد، پاشان بەرەو ئەم شوێنە چوو کە کاروانەکە تێیدا چاوەڕوانی کۆچبەرانی دەکرد.

کاروانەکە بەڕێکەوت، ڕوقییە بۆ ئەوەی تێر سەیری مەککە بکات، لەسەر پشتی وشترەکەی ئاوڕێکی دایەوە، بەڵام فرمێسکی چاوەکانی بواری سەیرکردنیان نەداو ئەم حەزو ئاواتەی نەهاتەدی، ئیدی لە سەرەتادا کاروانەکە لەسەرخۆ ڕێگای دەبڕی، تەنانەت وشترەکان خەریکی مرومۆکردنی هەندێ گژوگیای بیابانی بوون، بەڵام کاتێ گەیشتنە ناو جەرگەی بیابان و لەوەڕ نەما وشترەکان ملی ڕێگایان گرت و خێرا دەڕۆیشتن، کۆچبەرانیش لە خەفەتی دابڕانیان لە کەسوکارو خزم و وڵاتەکەیان بەدەم ڕێگاوە بە لاواندنەوە دەیانگوت:

دابـڕان لـە کەسـوکارو نیـشتمان زۆر گرانـە
بـەڵام دڵ و گیـان و جەسـتە قوربـانی باوەڕبێـت
پەروەردگار وەریبگرێت پـەروەردگار وەریبگرێت

دەنگ و ئاوازی پڕ لە جۆشی لاواندنەوەکە، کاریگەری لەدڵی ڕوقییە کرد، جەستەی هەموو هێنایە لەرزین و هەژان، پاشان ئارامی نەما سەری خۆی لەناو کەژاوەکەی سەرپشتی وشترەکە دەرهێنا، بەڵکو مەگەر بۆدواجار لەدوورەوە چاوی بە بینینی شاری مەککە شادبێت، بەڵام کاتێ سەری هەڵبڕی سەیری کرد عوسمانی هاوسەری تەنیا یەك هەنگاو لێی دوورەو بە چاوێکی پڕ لەسۆزەوە تێیدەڕوانێت، ڕوقییە هەستی کرد هاوسەرە خۆشەویستەکەی بیر لەچی دەکاتەوە، بۆیە بەخەندەیەکی شیرین و بەڕوویێکی گەشەوە گوتی:

ئێمە خودای مەزن و پڕتوانامان لەگەڵدایە، هەروەها ئەوانەی لەلای ماڵی پیرۆزی خودای مەزن جێمانهێشتوون خودای مەزن دەیانپارێزێت.

دوای ئەمە پشتی لە خۆشەویسترین وڵات کرد، دڵی پڕ لەخەفەت و پەژارەی خۆی بە عوسمانی هاوسەریەوە خۆشدەکرد، کە هەمیشە لە تەنیشتیوەبوو.

پاش ماوەیەك سەرجەم کۆچبەران بەیەك گەیشتن و پشووێکی کەمیاندا، ژمارەیان دەیان کەسبوو، لەچەندین بنەماڵەی قوڕەیش پێکهاتبوون، ناودارترین کەسایەتی و بنەماڵەکان بریتیبوون لە:

بنەماڵەی عەبدوشەمس:

عوسمانی کوڕی عەففان و ئەبوحوزەیفەی کوڕی عوتبەی کوڕی ڕەبیعەی کوڕی عەبدوشەمس واتە(برای هیند هاوسەری ئەبوسوفیان) هەروەها هاوسەرەکەی سەهلەی کچی سوهەیل کوڕی عەمری ئەلعامریە.

بنەماڵەی ئەسەدی کوڕی عەبدولعزای کوڕی قوصەی، واتە خاڵوانی ڕوقییە:

زوبەیری کوڕی عەوام کوڕی خوەیلد.

بنەماڵەی عەبدودار کوڕی قوصەی کوڕەمامەکانی عوسمان و ڕوقییە:

مەصعەبی کوڕی عومەیری کوڕی هاشمی کوڕی عەبدولەنافی کوڕی عەبدودار.

بنەماڵەی زەهرە خاڵوانی پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت):

عەبولڕەحمانی کوڕی عەوفی ئەلزەهری.

بنەماڵەی مەخزومیەکان:

عەبدوڵلای کوڕی عەبدولئەسەدی مەخزومی(پوورزای پێغەمبەردرودی خودای لەسـەربێت - کـوڕی بـەڕەی کـچی عەبدولموتـەلیب) خـۆی و هاوسـەری هینـدی کـچی زادئەلڕەکب ئەبونومەییە کوڕی موغەییەرەی مەخزومی.

ئـیتر دوای بەیـەك گەیـشتن و هەواڵپرسـین و پـشوویەکی کـەم، نوێـژی بـەیانیان کرد، عوسمانی کـوڕی مـەزعونی ئەلجـەمحی پێشنوێژی بـۆ کۆچـبەران کـرد، لـەدوای جێبەجێ کردنی نوێژەکەیان، هەموویان دەستیان بـەرزکرد بـۆ ئاسمـان و لـە خـودای بەرزو باڵادەست پاڕانەوە تا ئایینەکەیان سەربخات و پێغەمبەرەکەیان(درودی خودای لەسەربێت) لە چنگ کافرەکان ڕزگار بکات،ئیتر دوایی لەگـەڵ کازیوەی بـەیان بـەرەو خواروو بەڕێکەوتن، ئەوەندە ئازاریان چەشتبوو بۆیە ئاگری نامۆیی و دووره وڵاتیان بـەلاوە ئاسـایی بـوو لـەپێناو ئـایینی ڕاسـتوڕەوایان، هـەموویان بـۆ یـەکتری بـراو کەسوکاری یەکتری بوون، بۆیە فەرامۆشی و دابڕانـیان لـە ئـازیزان و مـاڵ و منـداڵ و کەسوکاریان کاریگەری ئەوتۆی نەبوو بەسەریانەوە، چونکە قـەرەبووی خۆشەویـستی ئازیزانیان لە یەکتریدا بەدی دەکرد، چۆن هاوڕێ بوون لە کۆچدا وێڕای برایـەتی لـە ئایینداْ.

## ژیانی نامۆیی

موسـڵمانە کۆچـبەرە پێـشەنگەکان لـە وڵاتـی حەبەشـە پێـشوازیان لێکـرا، ڕێوشوێنیان بۆ دابینکرا، دوای ماوەیەکی کـەم پـۆلێکی دیکـەی موسـڵمانان گەیـشتنە حەبەشە، تەنانەت ژمارەیان جگە لە منداڵەکان هەشتاوسێ کەس بـوو، ڕوقیـیە کاتـێ چاوی بە کۆچبەرەکان کەوت، فەرامۆشی و هەستی تـەنیایی و نـامۆیی کـەم بـووەوە،



چونکە چەندین خزم و خوێش و دۆست و ناسیاوی لە ناو کۆچبەرانی تازەدا بەدی دەکرد، وەکو: جەعفەری کوڕی ئەبوتالیبی ئامۆزای باوکی چۆن خۆی و خێزانەکەی ئەسمای کچی عمیس هاتبوون، هەروەها لەبنەماڵەی عوسمانی هاوسەری واتە ئومەییەکان، عەمرو خالیدی کوڕانی سەعیدی کوڕی ئەلعاص کوڕی ئومەییەو هاوسەرەکانیان هاتبوون، لە بنەماڵەی ئەسەدیەکان دوو پوورزای باوکی،کوڕەکانی ئومەیمەی کچی عەبدولموتەلیب عەبدوڵلا و عوبەیدوڵلای کوڕی جەحش خۆی و خێزانەکەی ئوم حەبیبەی کچی ئەبوسوفیان کوڕی حەرب هاتبوون، لەبنەماڵەی خاڵوانی عامری کوڕی ئەبو وەققاص کوڕی ئوهەیب کوڕی عەبدومەناف کوڕی زەهرە هاتبوو، هەروەها لەبنەماڵەی عامر هەشت کەس هاتبوون لەوانە سەکران کوڕی عەمر خۆی و هاوسەرەکەی سەودەی کچی زەمعەی کوڕی قەیس. کۆچبەرانی پێشەنگ بە چواردەوری کۆچبەرە تازەکاندا کۆبوونەوە، لە سەرەتادا پرسیاری پێغەمبەریان( درودی خودای لەسەربێت) کرد ئاخۆ دوای ئەوەی ئەوان لێیدابڕاوون چۆنە؟، ئیتر دوای ئەمە هەریەکێك پرسیاری خزم و کەسوکاری خۆی و یاوەرانیان دەکرد، ئەوانیش سڵاوی هەموویانیان پێگەیاندن و گوتیان هەمیشە خاوەن پەیمان و بەڵێنن ئێوەیان لەبیرەو هەرگیز لەیادیان نەکردوون، هەروەك چۆن ئێوە لەپێناوی خودادا کۆچتان کردوە.

هەروەها گوتیان: پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) هیچ سەرو سۆراغی کچەکەی دەست نەکەوت، تەنانەت ڕۆژێك ژنێك هاتەلای و پێیگوت ڕوقییەو عوسمانی بینیوە، ئەمیش(درودی خودای لەسەربێت) فەرمووی: خودا بیان بەخشێت، عوسمان یەکەم کەس بوو کۆچی بە هاوسەرەکەی کرد.

حەبەشیەکان بە هاتنی ئەم هەشتاوسێ کەسە نیگەران و دڵ تەنگ نەبوون، بەڵکو وەکو ئەوانەی پێشوو، جێگاو شوێنیان بۆ دابین کرا، نەجاشی واتە پادشای ئەم وڵاتە دڵنیای کردن لە سەربەستی و ئازادی خوداپەرستن بێ هیچ مەترسیێك و

ئاستەنگێك، ئیتر موسڵمانان لە سایەی دادوەری نەجاشیدا لە وڵاتی حەبەشە بە دڵنیایی و ئاسوودەیی گوزەرانیان دەکرد و دەژیان، بگرە چاکترین ئارامگەو شوێنی داڵدەدانیان بوو.

قورەیشیەکان کاتێ هەواڵی موسڵمانە کۆچبەرەکانیان پێگەیشت چۆن لە حەبەشە بە ئاسوودەیی و بەئازادی دەژین و خواپەرستی دەکەن، هەستیان بەنیگەرانی و نائارامی کرد لە دەرەنجامی ئەم کارە، بۆیە سەبارەت بەمە کۆبوونەوە، لە ئاکامدا ڕێککەوتن دوو پیاوی جەربەزەو لێهاتوو زانا بنێرن بۆلای نەجاشی، تا مەبەست و نیازی کۆچبەرانی بۆ ڕوون بکەنەوە، بەڵکو پەیوەندی نێوان نەجاشی و کۆچبەران تێکبدەن، ئیدی بۆ جێبەجێ کردنی ئەم ئەرکە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبورەبیعەی - باوکی عومەری شاعیر - و عەمری کوڕی ئەلعاص کوڕی وائل ڕاسپێردران، قورەیشیەکان چەندین دیاری بەهادارو بە نرخیان کۆکردەوە تا پێشکەش بە نەجاشی و بەتریارکەکانی ئایینی مەسیحی بکەن، موحەممەد(درودی خودای لەسەربێت) لەگەڵ خزمانی و ئەم ژمارە کەمەی یاوەرانی کە لە مەککە مابوونەوە بەیەکەوە دانیشتبوون کاتێ کاروانی دیاریە بەهادارەکانی قورەیش لەبەردەم ئەوان بۆ حەبەشە بەرێکەوت، ئەبوتالیب لەم پلانەی قورەیشیەکان زۆر نیگەران بوو، چونکە جەعفەری کوڕی و خوارزاکانی کوڕانی ئومەیمەو بیرە و ڕوقیەی نەوەی عەبدوڵڵای برای لەناو کۆچبەران دابوون، چونکە دەیزانی ئەم دوو کەسە واتە عەمرو یاوەرەکەی خاوەن کەسایەتی زۆر بەهێز و کارامەو کەمۆن، توانای لەخشتە بردنیان هەیە و ڕەنگە بتوانن کۆچبەران بگەڕێننەوەو دەرەنجام لەناویان بەرن، بۆیە لە ئاکامی دڵپەستی و نیگەرانیەکەی شیعرێکی دەربارەی پیاوەتی و لێهاتویی و گەورەیی نەجاشی خوێندەوە تێیدا هانیدەدا بۆ پاراستنی پەنابەرەکان، قورەیشیەکان شیعرەکەیان بیست و سەریان بۆی هەژاند، یەکێکیان بە گاڵتەوە گوتی:

گوتنی ئەم پیرەمێردە چ سوودێکی هەیە لەئاست پلانەکانی عەمرو یاوەرەکەی؟



ئەم وشانە چ بەهایێکیان نیە لەبەرامبەر ئەو دیاریانەی نێردراون بۆ نەجاشی و بەتریکەکان.

موسڵمانە کۆچبەرەکان لەم وڵاتە دوورە دەستە، ناوە ناوە دەنگۆی ئەوەیان دەبیست چۆن قورەیشیەکان کۆنگرەیان بەستاوە تا بڕیارێك لە چارەنووسی ئەوان بدەن و بتوانن بیانگەڕێننەوە بۆ مەککە، بەڵام ئەوان هیچ بایەخێکیان بەم هەواڵە نەدەدا، تەنانەت ڕۆژێکیان هەموویان سەرسام بوون بە بینینی عەمری کوڕی ئەلعاص و عەبدوڵڵای کوڕی ئەبوڕەبیعە چۆن گەیشتوونەتە حەبەشەو لەگەڵ سەرجەم بەتریکەکان یەك بەیەك چاوپێکەوتن و وتووێژ دەکەن.

دوای ئەمە ئەوەندەی نەخایاند نەجاشی بانگی موسڵمانەکانی کرد، تا سەبارەت بە کارێکی گرنگ ئاخاوتنیان لەگەڵدا بکات، ئیتر موسڵمانەکان بۆلای نەجاشی چوون بەدەم ڕێگاوە لەنێوان خۆیاندا دەیانگوت:

ئێمە کاتێ دەچینەلای ئەم پیاوە چ بڵێین!؟.

دوایی هەموویان ڕێککەوتن کە بڵێن:

دەڵێین بەخودا پادشا ئێمە هیچمان نەزانیوە، پێغەمبەرمان (درودی خودای لەسەربێت) فەرمانی پێنەکردووین.

لەلایێکی دیکە ژنانی کۆچبەر هەموویان بە پەشۆکاوی ڕوویان لەماڵی ڕوقییەکرد، بینیان هیند کچی زادئەلرەکب لای ڕوقییە دانیشتوە باسی پلان و نەخشەی دووپیاوەکەی مەککەی دەکرد، و دەیگوت:

هەروەکو بیستووتانە، قورەیشیەکان کۆنگرەیەکیان سەبارەت بەئێمەوە بەستاوە، کەچۆن ئێمە لێرە لە وڵاتی حەبەشە بەچاکترین شێوە پەنادراوین، ئاینمان پارێزراوە، خودا پەرستی دەکەین و ئازار نادرێین، هیچ نا ئارامیێك و نیگەرانیێك لە ئارادانیە، بۆیە ئەم دوو پیاوەیان ناردوەو کۆمەڵێك دیاری نایاب و کەلوپەلی گران بەهای بازاڕی مەککەیان پێ سپاردوون، تا بەدیاری بیدەن بە نەجاشی و بە

بەتریکەکان، جا ئەم دوو پیاوە، پێش ئەوەی چاویان بە نەجاشی بکەوێت چوونەتەلای بەتریکەکان دیاریەکانیان داونەتێ، بۆئەوەی لای نەجاشی پارمەتیان بدەن و ئێمەیان ڕادەست بکەن، بێ ئەوەی هیچ وتووێژێك لەگەڵ ئێمەدا بکەن، ئیتر ئەم دووپیاوە لەمەککە بەڕێکەوتوونەو ئێستا گەیشتوونەتە ئێرەو لەحەبەشەن، کارەکەو پلانەکەشیان ئەنجامداوە، بە هەر یەك لە بەتریکەکانیان گوتووە:

هێندێ لاوی کاڵفامی هۆزەکەمان ئایینی هۆزی خۆیان جێهێشتوەو هاتوونەتە وڵاتی ئێوە، کەچی نەهاتوونەتە سەر ئایینی ئێوەش، بەڵکو ئاینێکی نوێیان داهێناوە نە ئێمەو نە ئێوەش نازانین ئایینەکەیان چیە؟!، گەورە پیاوان و ماقوڵانی هۆزەکەمان ئێمەیان ناردوٚتە لای پادشای ئێوە، بەڵکو ئەوانمان ڕادەست بکەن و بیانبەینەوە وڵاتی خۆمان، بۆ ئەم مەبەستە داواتان لێ دەکەین لەلای پادشا پارمەتیمان بدەن و ئاماژە بۆ پادشا بکەن، کە بێ ئەوەی ئاخاوتن لە گەڵ ئەواندا بکات ڕادەستمان بکات، بڵێن چونکە هۆزەکەیان چاکتر شارەزایانن و دەزانن چ شەرمەزارییێك و نا ئارامییێکی بەسەرهێناون.

ئیدی بەتریکەکان بەڵێنیان پێداون پارمەتیان بدەن، دوای ئەوە چوونەتە لای نەجاشی دیاریەکانی ئەویشیان پێشکەش کردوە، ئەمیش دیاریەکانی وەرگرتوە، دوایی مەبەست و ڕازی دڵی خۆیان بۆ نەجاشی دەرکاندوە، بەتریکە ئامادەبووەکانیش گوتوویانە:

پادشا، ئەم دوو پیاوە ڕاستدەکەن، هۆزەکەیان چاکتر دەزانن ئەم کۆچبەرانە چ شەرمەزارییێك و نا ئارامییێکی بەسەرهێناون، بۆیە ئەم لاوانەیان ڕادەست بکەنەوە تا بیانگەڕێننەوە بۆ وڵات و ناو هۆزی خۆیان.

بەڵام نەجاشی کاتێ ئەمەی بیست ڕقی هەستاوەو گوتوویەتی:

نا بەخودا، هەرگیز ڕادەستیان ناکەم، چۆن دەبێ کەسانێك لە وڵاتی من میوان بن، لەناو سەرجەم خەڵکدا منیان هەڵبژاردبێت بۆ پەنابردنەبەر، منیش بێ ئەوەی بیاندوێنم و پرسیار و وەڵامیان سەبارەت بە گوتنی ئەم دوو پیاوە لەگەڵدا بکەم،

ڕاستەخۆ ڕادەستیان بکەم، قسەیان لەگەڵدا دەکەم دوای ئەوە ئەگەر ئەوەی ئەم دوو کەسە دەیڵێن ڕاستبوو، ئەوا ڕادەستیان دەکەمەوە تابیانبەنەوە بۆ هۆزەکەی خۆیان، ئەگەر وانەبوو هەرگیز ڕادەستیان ناکەم، بەڵکو ڕێزیان دەگرم، تا لە سایەو پەنای من بمێننەوە چاکەیان لەگەڵدا دەکەم.

ئیتر بۆ ئەم مەبەستە ئێستا ناردوویانە بەشوێن پیاوانی ئێمەدا، چاوەڕوانین با بزانین خودای باڵادەست چیمان بۆ دەکات.

ئیتر ژنان تا ماوەیەکی زۆر بەپەرۆشەوە چاوەڕوانی پیاوانبوون تا بزانن ئاکامی چاوپێکەوتنەکەیان چی لێکەوتەوە.

نەجاشی پێشوازی لە موسڵمانان کرد، بەتریك و قەشەکان خۆیان و کتێبەکانیان لای پادشا ئامادەبوون، نەجاشی پرسیاری لە موسڵمانەکان کردو گوتی:

پێم بڵێن ئێوە چ ئایینێکتان گرتۆتەبەر، بەهۆیەوە خۆتان لە هۆزەکەتان دابڕیوەو نەهاتوونەتە سەر ئایینی ئێمەو یان هیچ ئایینێکی دیکەش!؟.

جەعفەری کوڕی ئەبوتالیب هاتە وەڵام و گوتی:

ئەی پادشای بەڕێز، ئێمە میللەتێکی نەزان بووین، بت پەرستبووین، خواردنی مردارمان دەخوارد، کردارو ڕەفتاری نارێك و ناشیرینمان ئەنجامدەدا، پەیوەندی خزمایەتیمان دەپچڕاند، لەگەڵ دراوسێ خراپبووین، بە هێزو دەسەڵاتدار لەناوماندا بێهێزو لاوازی دەخوارد، تەنانەت خودای مەزن پێغەمبەرێکی لەخۆمان بۆ ناردووین شارەزای ڕەچەڵەك و ڕاستگۆیی و ئەمینی و داوێنپاکی ئەوین، داوای لێکردووین تەنیا یەك تاکە خودا بپەرستین و واز لە پەرستنی بت و بەرد بێنین، کە هەمیشە ئێمەو باوك و باپیرانمان دەمانپەرست، فەرمانی پێکردووین ڕاستگۆبین، ئەمانەت بگەڕێنینەوە بۆ خاوەنەکانیان، سەردانی خزمانمان بکەین، لەگەڵ دراوسێکانمان چاکبین، دەست نەخەینە خوێنی یەکتر، لە ڕەفتاری حەرام خۆمان بپارێزین، هەروەها فەرمانی پێکردووین لە کاری نابەجێ و ناشیرین و فێزەون، لە شایەتی ناڕەوا، لەخواردنی ماڵی هەتیو، لەهەڵبەستنی ناوونـاتۆرە بەدوای ژناندا خۆمان

لابدەین، هەروەها فەرمانی پێکردووین تەنیا خودای مەزن بپەرستین و هیچ هاوبەشێکی بۆ دانەنێین، نوێژبکەین، زەکات بدەین، ڕۆژوو بگرین، ئیتر ئێمەش بەڕاستگۆمان زانیوە، باوەڕمان بەو هێناوەو شوێنکەوتووی ئەوە بووین کە لەلایەن خوداوە بۆی هاتووە، بەهۆی باوەڕهێنانمان هۆزەکەمان دوژمنایەتیان کردووین و ئازارو ئەشکەنجەیان داوین، بوارمان نادەن و قەدەغەمان دەکەن لەخودا پەرستی، دەیانەوێت بگەڕێینەوە بۆ بتپەرستی و ئەم کردەوەو ڕەفتارە قێزەونانەی پێشوو، دوای دەردەسەری و ئازارو ستەمێکی زۆر تەنگیان پێهەڵچنین، هەتا خەریکبوو ئایینەکەمان لەدەست بدەین، ئیدی ناچاربووین ڕوو لە وڵاتی تۆ بکەین، تۆمان لا چاکتربوو لە پادشاکانی تر، بۆیە تۆمان هەڵبژاردوەو پەنامان هێناوەتە بەرتۆ، پادشای بەڕێز، داواکارین لەلای تۆ ستەممان لێنەکرێت.

نەجاشی ماوەیەك بێدەنگبوو پاشان پرسی:

ئایا هیچت لایە لەوەی لەلایەن خوداوە بۆ پێغەمبەرەکەتان هاتووە؟.

جەعفەر گوتی:

بەڵێ.

نەجاشی گوتی:

بۆم بخوێنەرەوە.

جەعفەر هێندێ ئایەتی لە سوڕەتی مەریەم بۆ خوێندەوە.

گوتیان: بەخودا نەجاشی ئەوەندە گریا تەنانەت ڕیشی تەڕبوبوو، هەروەها قەشەو بەتریکەکان کتێبەکانیان تەڕبوو لەبەر گریان، دوای ئەوە نەجاشی گوتی:

ئەمەو ئەوەی عیسا هێناویەتی دەرچووی یەك چرادانن، ئاوڕی لە نوێنەرانی قورەیش عەمرو عەبدوڵڵا دایەوە، پێیگوتن:

ئێوە بڕۆن، نا بەخودا من ئەمانە ڕادەستی ئێوە ناکەم.

لەلای نەجاشی هاتنەدەر، بەڵام عەمری کوڕی عاص متمانەی بەبلیمەتی و زیرەکی خۆی هەبوو، بۆیە هەستی بە بەزین نەدەکرد، بەڵکو بەهەڕەشەوە دەیگوت:

بەخودا بەیانی دێمەوەلای نەجاشی، زیاتری بۆ ڕوون دەکەمەوە، ئینجا بزانن چۆن ڕیشەکێشیان دەکەم، بەڵام عەبدوڵلای کوڕی ئەبوئەلڕەبیعە کاتێ بینی نەجاشی پیاوێکی بێگانەیە هیچ پەیوەندیێکی خزمایەتی وهۆزایەتی لەگەڵ ئەم کۆچبەرانەدا نیە، کەچی پارێزگاریان دەکات و چاکەیان لەگەڵدا دەکات، ئیتر ئەو کاتە هەستی بە شەرمەزاری و نەنگی کرد، بۆیە بە عەمری گوت:

نەخێر ئەوە ناکەین، چونکە ئەمانە ئەگەر بیرو ڕاو بۆچوونیان لە ئێمەش جیابێت، بەڵام خزم و کەسوکاری ئێمەن، کەچی وادیاربوو عەمر زۆر ڕشتبوو لەسەر قسەکەی بۆیە گوتی:

بەخودا دەبێ بەنەجاشی بڵێم ئەوانە پێیان وایە عیسای کوڕی مەریەم بەندەیە.!

ئیتر ئەم ڕۆژە تەنانەت تا نیوەی شەویش، عەمری کوڕی عاص هەمیشە بیری دەکردەوە بۆ بەیانی چ جۆرە پلانێك بنێتەوە، کەچی موسڵمانە کۆچبەرەکان ئەو شەوە بە ئارامی و بێ ترس خەوتن، چونکە دڵنیابوون لەوە کە نەجاشی هەرگیز ستەمیان لێناکات، دەربارەی بەندایەتی عیسای کوڕی مەریەمیش، هەموویان ڕاو بۆچوونیان وابوو کەوا چیان بیستوە لەزاری موحەممەد(درودی خودای لەسەربێت) سەبارەت بە عیسا(سەلامی خودای لەسەربێت) بەیانی بیکەنە وەڵامی نەجاشی، بێ بایەخدان و گوێ پێدان بەئاکامەکەی ئاخۆ چۆن دەبێت.!

ئیتر بۆ بەیانی ڕۆژی دواتر نەجاشی بانگی کۆچبەرانی کرد، پێیگوتن ئاخۆ چی دەڵێن دەربارەی عیسا(سڵاوی خودای لەسەربێت)؟.

جەعفەر وەڵامی دایەوەو گوتی:

ئەوەی موحەممەد(درودی خودای لەسەربێت) پێیڕاگەیاندووین و لە زاری ئەومان بیستوە ئەوەیە: عیسا بەندەو پێغەمبەرو گیان و وشەی پیرۆزی خودایە خستیە ناو جەستەی مەریەمی پاکیزەی داوێنپاك و بێ هاوسەر.

نەجاشی کاتێ ئەمەی بیست، دەستی درێژکرد بۆ سەر زەوی چڵەدارێکی

بچووکی هەڵگرت، بە جەعفەری گوت:

سوێندم بەخودا ئەوەی تۆ گوتت هێنـدەی ئـەم چڵەداره پێچەوانە نیـە لەگـەڵ عیسای کوڕی مەریەم.!

پاشان ماوەیەك بێدەنگبوو، سەیری بەترپارکەکان و عـەمرو یاوەرەکـەی دەکـرد، دوایی چاوەکانی لەسەر کۆچبەرەکان وەستاو ئۆقرەی گرت و گوتی:

ئێوە بڕۆن بەدڵنیایی لە وڵاتی من بژین، ئەوەی قسەی ناڕێکتـان لەئاست بکات سزا دەدرێت.

ئیتر بۆ سێ جار ئەم ڕستەیەی دووبارەو سێ بارە کردەوە، پاشان گوتی:

ئەگەر چیایێکی زێڕم پێ ببەخشن حەز ناکەم تـەنیا یـەك تاکە کـەس لـە ئێوە ئازار بدەم.

دوای ئەمە سەیری بەتاریکەکانی کردو پێیگوتن:

دیاریـەکانی ئـەم دوو پیـاوە هێنابوویـان بیاندەنـەوە پێویـستیمان پێیـان نیـە!، سوێندم بە خودا، خودا ئەم موڵکەی بێ بەرتیل بەخشیوە بەمن، چۆن ئێستا مـن بەرتیل بەم موڵکەوە وەربگرم، خودا خەڵکانی بۆ ئەوە ملکەچ کردوە بۆمن، تەنانەت مل کەچیان بکەم بۆ خودا پەرستی.

ئیتر عەمرو عەبدوڵڵا بە دڵێکی غەمبارو بە مـل شۆڕی نیگەرانیـەوە گەڕانـەوە بـۆ لای قوڕەیـشیەکان، کۆچبەرانیش لـە پـەنای چاکترین خانەخێـدا مانـەوە، بـەڵام بێگومـان لەگـەڵ ئەوەشـدا هەسـت و سـۆزو دڵیـان هەمیـشە لای شـاری مەککـەو خۆشەویـستان و کەسـوکاریان بـوو، زۆر بـە پـەرۆش بـوون بـۆ بیـستنی هەواڵـەکانی مەککە بەتایبەتی سەبارەت بە پێغەمبەر(درودی خـودای لەسـەربێت) و یاوەرەکـانی، چونکە هەمیشە لە بەربـەرەکانێ و دژایـەتی کـردن و ئەشـکەنجەو ئـازاردا دەژیـن لـە گەڵ بتپەرستاندا.

# سۆزو هەست و گەڕانەوە

ڕوقییـەخان(خـودا لێیڕازیبێـت) لەهـەموو کۆچبەرێك زیـاتر بـیری لـە خـزم و کەسوکاری دەکردەوە، هەمیشە هەست و سۆزی لای ئەوان بوو، ڕەنگە پێشتر زۆر لـە بـاوك و دایـك و خوشـکەکانی دوور نەکـەوتبوەوە، بۆیـە ئەوەنـدە پەرێـشان بـوو، سەرەڕای ئەمەش ئەم کارەسات و نەهامەتیانـەی پێشتر بەسـەری هـاتبوو کاریگـەری زۆریـان هـەبوو بەسـەریەوە، تەنانـەت کاردانـەوەی لـە ڕەنـگ و ڕوخساریدا دیـاربوو، بـاری تەنـدروسـتی جێگیرنـەبوو لاوازو بێهێزبووبـو، تەنانـەت لـە ئاکامـدا کۆرپەڵـە نۆبەرەکەی لەبارچوو، بـەڵام خۆشەویـستی وچاودێری هاوسـەرە دڵسۆزەکەی وێـڕای بایەخپێدانی کۆچبەران بۆی، بوبووە هاندەر و یارمەتیدەرێك تا لەم تەنگژەیەو بارە ناهەموارە دەربازبێت.

سـەرەڕای ئەمـە گەیـشتنی هـەواڵی هـەڵگرتنی ئـەو ئابلووقەیـەی قورەیـشیەکان بەسـەر بـاوکی و بنەماڵـەی هاشمیـەکان وسـەرجەم موسـڵمانانیاندا سـەپاندبووبووە مایەی دڵخۆشی و شادی و کامەرانی بۆ سەرجەم کۆچبەران، بەڵام کاریگەری تایبەتی و چاکی هەبوو لەسەر باری تەندروستی ئەم خانمە بەڕێزە.

هەروەها دەنگۆی ئەمەش لەئارادابوو لەناو کۆچبەراندا، کە قورەیشیەکان دوای ئەوەی بینیـان موحەممەدو(درودی خـودای لەسـەربێت) یـاوەرانی خـاوەن بـاوەڕێکی یـەکجار تۆکمـەو بـەهێزن، چـونکە دوای ئـەم هـەموو ستەم و ئەشـکەنجەو ئـازارو ئابلووقە شومەدا زۆر ورە بەرزو خۆڕاگرو نەبـەرد بـوون، ئـیتر ئـەم خۆڕاگری و ورە بەرزیەیان کاریگەری کردۆتـە سـەر بیرو دڵ و دەروونـی هێنـدێکیان لـە ئاکامـدا بـە ئارەزووی خۆیان باوەڕیان هێناوەو بوونەتە موسڵمان.

ئیدی کۆچبەران کاتێ ئەم هەواڵەیان بیـست خورپەیـەك کەوتـە نـاو دڵیانـەوەو سـۆزو هەسـتی گەڕانـەوەیان بـۆ نیـشتمان پـەرەی سـەندو تەشـەنەی کـرد، تەنانـەت هێندێکیان زۆر فەرامۆش بوون و ئارامیان نەما، بۆیە بەپەلە کەوتنە خۆئامادەکردن





و خۆسازدان، تا بەرەو خۆشەویسترین خاك و ئازیزترین شوێن بگەڕێنەوە، بەڵام هەندێ لەکۆچبەران دوودڵبوون لەگەڕانەوە،پێیانوابوو لەحەبەشە بمێننەوە چاکترە تا ئەو کاتەی دڵنیادەبن کەوا قورەیشیەکان بەرەنگاری پێغەمبەرو(درودی خودای لەسەربێت)یاوەرانی نابنەوە، ئەو کاتە بگەڕێنەوە.

ئیتر کاروانێکیان بەرەو مەککە بەرێکەوت، بریتیبوو لە سی وسێ پیاو، عوسمانی کوڕی عەففان و هاوسەرەکەی ڕوقییەخان لە پێشەنگی کاروانەکادابوون، وێڕای ئەوانیش زوبەیری کوڕی عەوام برازای خەدیجەخان، عەبدوڵڵای کوڕی جەحش پوورزای پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت)، ئەبوسەلەمەی کوڕی عەبدولئەسەد خۆی و هاوسەرەکەی هیند کچی ئەبوئومەییە، هەروەها سەکران کوڕی عەمر خۆیو هاوسەرەکەی سەودە کچی زەمعە لەگەڵ کاروانەکەدابوون، زۆر بەخێرایی ڕێگای دوورو درێژیان دەبڕی، هەست و بیریان لای ئازیزان و خۆشەویستانبوو، دیمەنی بەیەکتر شادبوون و بەیەك گەیشتنەوەیان لەبەر چاوبوو، بیریان دەکردەوە چۆن لە باوەشی وڵات و ئازیزانیاندا بە ئارامی دەژین، تەنانەت گەیشتنە سەر لێواری دەریا، پاش پەڕینەوەیان دووبارە بەهەستێکی مەست و بیرێکی پڕ لە ئەندێشە ملی ڕێگایان گرتەوە، دڵەکانیان پێش جەستەیان کەوتبوون بۆ دیدەنی وڵاتی شیرین و دیداری ئازیزان و دۆستان، هەتا گەیشتنە بەرزاییەکانی چواردەوری شاری مەککە، ئیتر لەوێ ڕاچڵەکین، ئەو خەونە پڕلەخۆشی و شادیەی بەدەم ڕێگاوە دەیانبینی، هەمووی لە هەست و بیریاندا سڕایەوە، چونکە بینیان پیاوانی قورەیش لە قرچەی گەرماو خۆرەتاودا موسڵمانە بێ دەسەڵاتەکان لەسەر بەردە ڕەق و گەرمەکان ئازاردەدەن.

قورەیشیەکان کاتێ چاویان بە کۆچبەرە گەڕاوەکان کەوت هەڕەشەی ئازاردان و لەناو بردنیان لێیان دەکردن، ئیتر کپو بێدەنگی شوێنی شادی و کامەرانی گرتەوە، ئەندێشەکانیان پچڕا هەست و بیریان پەرتوبڵاوبوو، ئەو ڕۆژە نەیانتوانی بچنە ناو شاری مەککە، هەتا ئێوارە دوای خۆرئاوابوون، کاتێ تاریك داهات هەندێکیان پەنایان برد بۆ وەلیدی کوڕی موغەییرەی مەخزومی، ئەوانەی دیکە پەنایان برد بۆ

کەعبەی پیرۆز ڕوخساریان ڕەنگی شەهیدبوونی پێوەدیاربوو.

بێگومان ڕوقییەخان زۆر بەخێرایی و بە تامەزرۆیی ڕوویکردە ماڵی باوکی، کاتێ لەدەرگای ماڵەوە چووە ژوورەوە ئومکەلسوم و فاتیمەی خوشکی بە گورجی هەستان پێشوازیان کرد، دەستیان لەملی کرد، هەوڵیاندا گریانەکەیان سەرنەکات، بەڵام فرمێسکی چاوەکانیان قەتیس وەستابوو، دوایی تۆزێک ڕوقییەخان خۆی لەباوەشیان دەرهێنا بەگومانەوە گوتی:

کوا باوکم!؟، کوا دایکم!؟.

وەڵامیان دایەوە گوتیان:

باوکت چووە بۆلای یاوەرە کۆچبەرەکانی ئەوانەی لەگەڵ تۆ لە حەبەشە گەڕاونەتەوە، دوایی لێوەکانیان تەتەڵەی کردو وشەکانیان لەناو قوڕگدا خنکاو وەڵامەکەیان بۆ تەواو نەکرا، ڕوقییەخان ترسا دڵی ڕاچڵەکا ، دووبارە گوتی:

ئەی دایکم کوا لە کوێیە بۆ دیارنیە!؟.

ئومکەلسوم سەری دانەواندو بێدەنگبوو، فاتیمە خۆی بۆ نەگیرا قوڵپی گریانی سەریکردو لە ژوورەکە چووە دەرەوەو لەپرمەی گریانیدا.

ئیتر ڕوقییەخانی تێنوو بۆ دڵۆپێ بارانی سۆزو بەزەیی و خۆشەویستی دایک چیتر پرسیاری نەکرد، بەرەو جێگای دایکی کۆچکردووی چووتا گەیشتە ژوورەکەی خەریکبو بکەوێتە خوارەوە، کاتێ چاوی بەپێخەفی دایکی کەوت، خۆی بۆ نەگیرا تۆزێک بە حەپەساوی و سەرسامی وەستا، پاشان لەخەفەتا کەوتە سەرجێگاکەی دایکی دەست و پێیەکانی سڕو ساردبوون، تەنانەت باوکی(درودی خودای لەسەربێت) هاتەلای، توانی بەسۆزو خۆشەویستی باوکایەتی ئارامی بکاتەوەو تۆزێک خەفەتی ناودڵ و دەروونی کەم بکاتەوە، دوای ئەوە فرمێسکەکانی بەگوڕ هاتەخوار، باوکی دووبارە گرتیەوە باوەشی ئیتر دڵی پڕ لەتاسەو ئاوات و تێنووی بۆ دیدەنی دایکی بەسۆزو خۆشەویستی نۆقرەی گرت و هێور بووەوە.

# کۆچی دووەم و کۆچی دوایی

دوای گەڕانەوەیان لە وڵاتی حەبەشە، زۆری نەخایاند موسڵمانان لە ئاکامی ئازارو ئەشکەنجەو دژایەتی دژواری قورەیشیەکاندا ناچاربوون کۆچ بکەن بۆ شاری مەدینە، ئیتر ڕوقییەخان لەگەڵ هاوسەرەکەی کۆچی کرد بۆ ئەم شارە، لە مەدینە بە لە دایکبوونی کۆرپەیەکی خنجیلانەی چاوگەش عەبدوڵڵای کوڕی عوسمان، ماڵەکەیان ڕۆشنبووەوە، ئیدی بەهۆی سەرقاڵبوونی بەپەروەردە کردنی ئەم منداڵەوە تۆزێك لە خەفەت و برینی جگەرسووتانی کۆرپە نۆبەرەکەی وکارەساتی جەرگبڕی مردنی دایکی ئازیزو دەردی نامۆیی و دووری و دابڕانی نیشتمانی ساڕێژبوو، پێیوابوو ئەوەندەی ناسۆری و کارەسات و نەهامەتی چەشتوە لەژیاندا، ئیتر لەمەودوا بۆ ماوەیەکی درێژ هیچ تەنگژەیەك نایەتە ڕێگای، کەچی خودای مەزن بە کارەساتێکی دیکە تاقیکردەوە، عەبدوڵڵای کوڕی تەمەنی گەیشتە شەش ساڵ ڕۆژێك کەڵەشێرێك دەنووکێکی لێدا و کوشتی، ڕوقییەخان لە ئاکامی کارەساتی ئەم جگەرسووتانە نەخۆش کەوت و کەوتە ناو جێگا، دەڵێن تووشی نەخۆشی سوریژەبوو(سۆریکە).

ئیدی عوسمانی هاوسەری لەلای دانیشت و خزمەت و چاودێری دەکرد، تەنانەت ڕۆژێك گوێی لە دەنگی بانگەوازی پێغەمبەربوو(درودی خودای لەسەربێت)، داوای لە کۆچبەران و لایەنگران(یارمەتیدەران)دەکرد بۆ بەشداربوونیان لە بەرنگاربوونەوەو ڕووبەڕوو بوونەوەی قورەیشیەکان لە جەنگی بەدردا، عوسمان پڕ بەدڵ حەزی دەکردو ئاواتەخوازبوو بەرەو پیری بانگەوازەکە بچێت، بەڵام نەیتوانی ئەم ئەرکە پیرۆزە جێبەجێ بکات، چونکە ڕوقییەخان بێ هۆشی مردنی هاتبووەسەر، خەریکی ئاوزنگ بوو گیانی دەردەچوو، بە فەرمانی پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) بەشداری جەنگی بەدری پیرۆزی نەکرد، بەڵکو جەنگی مردنی خۆشەویسترین و



ئازیزترین کەسی بینی، ڕوقییەخان جەستەی زۆر بەئازارو ژان بوو، لە سەرەمەرگدا چاوەکانی بڕیبووە هاوسەرەکەی، ئەویش بەچاوێکی پڕ لەسۆزو خۆشەویستی سەیری دەکرد، لرخەلرخی گیان دەرچوونی دەهات، لەپڕ گیانی بەرزەفڕی لە لێوەکانی جیابووەوە، لەم کاتە ناسك و جەرگبڕەدا دەنگی لرخەی مردن و بانگی مژدەی سەرکەوتنی موسڵمانان لە جەنگی بەدردا، لە بن گوێچکەی عوسمان تێکەڵاوی یەکتری بوو.

دوای ئەمە باوکی جگەر سووتاو هاتەوە، لە لاشەی کچە مردوەکەی نزیك کەوتەوە بە زمانێکی پڕ لە غەم و پەژارەوە ماڵئاوایی لێکرد، پاشان خۆی شۆڕکردەوە بۆ لای فاتیمەی کچی لەسەر لاشەی خوشکەکەی دەگریا، پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) بەدامێنی کراسەکەی خۆی فرمێسکی چاوەکانی فاتیمەی دەسڕیەوە، ئیدی ژنان کاتێ چاویان بەم دیمەنە جەرگبڕە کەوت، خۆیان بۆ نەگیراو ئارامیان نەما قوڵپی گریانیان هاتە جۆش، بۆیە لە خزمەت پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) چوونە دەرەوەو دەستیان کرد بەگریان.

عومەری کوڕی خەتاب(خودا لێیڕازیبێت) کاتێ گوێی لە دەنگی گریانی ژنان بوو، تووڕەبوو ڕقی هەستا، زۆر بەتوندی قەدەغەی کردن لە گریان، پێیگوتن ئێرە پێویستی بە هێمنی و ڕێزگرتن هەیە، بەڵام پێغەمبەری دڵ پڕ لەسۆز(درودی خودای لەسەربێت) عومەری هێور کردەوە، فەرمووی:

هەرچیەك لە چاو و دڵەوە بێت ئەوە لە خوداو لە بەزەییە، هەرچیەك لە دەست و زمانەوە بێت ئەوە لە شەیتانە.

پێغەمبەری باوك(درودی خودای لەسەربێت) نوێژی لەسەر ڕوقییەی کچی کرد، مەدینەییەکان لاشەی کچی پێغەمبەریان(درودی خودای لەسەربێت) لە گۆڕنا، ئەو کچەی دووجار لە ژیانیدا دەربەدەری و نامۆیی و کۆچی بینی، ئەم خاکە

پاکـژو خاوێنـەی جەسـتەی ئـەوی داپۆشـی، ئـەو ڕۆژە بـەخوێنی شـەهیدانی بـەدر ئاودرابوو.

پێغەمبـەر(درودی خـودای لەسـەربێت)سـەبارەت بـەعوسمانی کـوڕی عـەفان فەرمووی:

ئەمیش پاداشتی جەنگی بەدری هەیەو بە بەشداربوو دەژمێردرێت، چونکە بەهۆی نەخۆشی ڕوقییەی کۆچکردوو(خودا لێیڕازیبێت) نەیتوانی بەشداری بکات.

# دوای شوکردن و دەستبەرداریی

لەمیانەی لاپەڕەکانی بەشی ڕابردوو زانیمان چۆن ئومکەلسوم و ڕوقییەی خوشکی بەشوودران، هەروەها ئەوەشمان بۆ ڕوون بووەوە چۆن عوتبەی کوڕی ئەبولەهەب لەژێر فشاری ئومجەمیلی دایکی و بەپێی پلانێکی قوڕەیشیەکان دەستبەرداری ئومکەلسوم بوو، ئەمیش وەك ڕوقییەی خوشکی، خودای مەزن و بالادەست لەچنگ خەسوە دارکێشەکە ڕزگاری کرد، بەلام زۆری نەخایاند ڕوقییەی خوشکی بووە هاوسەری عوسمانی کوڕی عەففان و دوایی کۆچیکرد بۆ ولاتی حەبەشە.

ئومکەلسوم لەمالی باوکی مایەوە، لەگەل فاتیمەی خوشکی بچووکی، بەیەکەوە یارمەتی یەکەم دایکی موسلمانانیان دەدا، هەلگری بڕێك لە بارو ئەرکی قورسی سەرشانی بوون، کاتێ باوکیان(درودی خودای لەسەربێت) بەجەستەی پڕ لەئازارو برینەوە دەگەڕایەوە مالەوە وێڕای دایکیان پێشوازیان دەکرد، جلوبەرگیان خاوێن دەکردەوە، بە هەستێکی پڕ لەسۆزو خۆشەویستیەوە برینەکانیان سارێژدەکرد، هەمیشە هەولیاندەدا بۆ ئەم کاتە کەمەی لەمالەوە دەمایەوە، کەشێکی ئاسوودەو ئارامی بۆ دابین بکەن.

ئومکەلسوم وێڕای خێزانەکەی و سەرجەم موسلمانان، هەمیشە لەناو جەرگەی ئازاوەو ستەم و دژایەتی کردنی قوڕەیشیەکاندا دەژیا، ئیتر ئەم دژایەتیکردنە تا دەهات ڕۆژ لەدوای ڕۆژ دژوارترو ئالۆزتر دەبوو، توندو تیژی زیاتری بەخۆیەوە دەدیت، بەتایبەتی دوای ئەوەی قوڕەیشیەکان لە ئەبوتالیب بێ ئومێدبوون، کە هەرگیز برازاکەی ڕادەستیان ناکات وناچاریشی ناکات دەستبەرداری ئاینەکەی بێت.

ئەمە لەلایەك، لە لایێکی دیکە بە موسلمانبوونی حەمزەی کوڕی عەبدولموتەلیب و عومەری کوڕی خەتاب قوڕەیشیەکان زۆر نیگەران بوون، چونکە

ئەمانە بە پیاوی ژیرو مەندو ڕاوێژکار ناسراوبوون، بۆیە لەنێو خۆیاندا کۆبوونەوەو بڕیاری پچڕاندنی هەموو جۆرە پەیوەندییەکیان لەگەڵ بنەماڵەی هاشمیەکان و موسڵماناندا، ئەم بڕیارە بە شێوەی پەیماننامەیەك نووسرایەوەو لە ژووری کەعبەی پیرۆز هەڵواسرا، موحەممەد (درودی خودای لەسەربێت) خۆی و خانەوادەکەی و شوێنکەوتوانی ڕوویان لە دۆڵی ئەبوتالیب کردهەروەها بنەماڵەی هاشمیەکانو سەرجەم نەوەکانی عەبدولموتەلیب جگە لە ئەبولەهەب، هەموویان چوونەلای موسڵمانەکان و لەم دۆڵە چیایەدا جێگیربوون، ئیتر بۆ ماوەی سێ ساڵ ڕووبەڕووی ئابلوقەیەکی زۆر سەخت و دژوار بوونەوە، تەنانەت گەڵای وشکی داری بیابانیان دەخوارد، چونکە هەموو جۆرە خۆراکێك و کەلوپەلێکیان لێ قەدەغەکرابوو، تەنیا مەگەر بە نهێنی بڕێکی یەکجار کەمیان بەدەست گەیشتبێت، تەنانەت دەگێڕنەوە دەڵێن:

شەوێك ئەبوجەهل بینی حەکیمی کوڕی حزامی کوڕی خوەیلدی ئەسەدی هەندێ گەنمی لەسەر شانی منداڵێك دانابوو، دەیویست بەنهێنی بیبات بۆ خەدیجەی پووری، کە لەگەڵ دوو کچەکەی ئومکەلسوم و فاتیمەدا وێڕای موسڵمانان گیری خواردبوو بەدەست ئابلووقەکەدا، ئەبوجەهل یەخەی حەکیمی گرتو هاواری کرد گوتی:

ئەوە خۆراك بۆ هاشمیەکان دەبەیت؟!، بەخودا ئەگەر بچیت بۆ لایان پێش ئەوەی بگەیتە ئەوێ من ئابڕووت دەبەم لەناو خەڵکی مەککەدا.

ئیتر ڕۆژ لەدوای ڕۆژ برسیەتی و فاتوقڕیان زیاتر دەبوو، هەتا گەیشتە ڕادەیەك سەعد کوڕی ئەبووەقاص(خودا لێیڕازیبێت) دەڵێ:

دووساڵ بوو ئابلووقەمان خرابوەسەر، لەبارێك و ژیانێکی مەرگەساتیدا دەژیاین و گوزەرانمان دەکرد، شەوێك ئەوەندە برسی بووم تەنانەت پێم کەوتە سەر شتێکی نەرم، شتەکەم خستە ناو دەمم و خواردم ئێستاش نازانم شتەکەی خواردم چیبوو.

بەڵام سەرەڕای ئەم برسیەتی و نەھامەتیەش، موسڵمانەکان یەك تۆزقاڵ بیرو باوەڕیان نەگۆڕابوو، هەرگیز سەبارەت بە یارمەتیدان و لایەنگری پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) کەمتەرخەمیان نەدەکرد، لە ڕێبازو هەڵوێستی خۆیان لایان نەدا، بەڵکو بەپێچەوانەوە ئەم تیرەی قورەیشیەکان ئاراستەی موحەممەدو(درودی خودای لەسەربێت) موسڵمانانیان کردبەرەو ڕووی خۆیان هەڵگەڕایەوەو کاریگەری لەسەرخۆیان هەبوو، چونکە چەند کەسێك ویژدانیان لەناخەوە هەژاو بەم ئابلووقەیە دژوارە نیگەران بوون، ئیتر هەستیان بە ئازاری ویژدانیان کردو بەم کارە ناڕەوایەیان سەخڵەتبوون، تەنانەت هوشامی کوڕی عەمری کوڕی ڕەبیعەی تەمیمی بەشەو وشترێکی باردەکرد لە خۆراك، هەوساری وشترەکەی دەگرت تا دەیبردە بەر دەمی دۆڵە چیاکەی موسڵمانان تێیدا دەژیان، لەوێ هەوسارەکەی لەسەری وشترەکە دەکردەوەو ڕووی وشترەکەی دەدایە لای دۆڵەکە، لەنزیکی دەمایەوە تا دەچووە ناو دۆڵەکە، چەندین شەو ئەم کارەی دووبارە کردەوە، شەوێکیان پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) خۆی هاتە بەردەم دۆڵەکە تا سەرپەرشتی دابەشکردنی خۆراکەکە بکات بەسەر خێزاندارەکاندا.

ئومکەلسوم هەستی دەکرد ئەم ئابلووقە نامرۆڤانە کاریگەری زۆری کردۆتە سەر باری تەندروستی دایکی ڕەنگە کۆچی دوایی نزیك بووبێتەوە، بۆیە هەمیشە چاودێری دایکی دەکردو لای دانیشتبوو، دایکی هەرچەندە تەمەنی گەیشتبووە شەست و پێنج ساڵ بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئازایانەو دلێرانە بە گیانێکی پڕ لە وورە بەرزیەوە بەرگری لەنەخۆشی وبێهێزیەکەی دەکرد، هەمیشە ئاواتەخوازبوو تەمەنی درێژتربێت لەپێناو دابینکردنی بەختەوەری بۆ هاوسەرە خۆشەویستەکەی و دوو کچەکەی ئومکەلسوم و فاتیمە.

تەنانەت ئەم شەوە دایکی بە ئومکەلسومی گوت:

خۆزگە مەرگ مەودای دەدام تا بەچاوی خۆم دەمبینی ئەم قەیرانەو ئابلووقە

نگریسەمان لەسەر نەدەما، ئینجا ئەو کاتە بە چاوتێری و ڕەزامەندیەوە سەرم بنابایەوە.

ئومکەلسوم بە هەستێکی پڕ لەسۆزەوە گوتی:

دایە، تۆ تەندروستیت باشە و هیچت نیە توخوا وا مەڵێ، دوایی وشەکان لەناو قوڕگیدا خنکان و نەیتوانی هیچی تر دەرببڕێت.

دایکی گوتی:

ڕۆڵە بەخودا دەزانم من باشم و هیچم نیە، جگە لەمە هیچ ژنێك لە ژنانی قوڕەیش لە ژیاندا هێندەی من بەنازو خۆشی نەژیاوە، بگرە هیچ ژنێك لە جیهاندا وەك من ناوبانگی بەدەست نەهێناوە، چونکە هاوسەرێتی ئەم خۆشەویستەو ئەم پیاوە هەڵبژاردەیە بۆ من مایەی سەربەرزی و سەرفرازی و هەموو گەورەییێکە لە ژیاندا، هەروەها بۆ دوارۆژیش خۆم بە بەختەوەر دەزانم کەیەکەم باوەڕدارم و دایکی سەرجەم موسڵمانانم، دوای ئەوە چاوەکانی داخست بە چپەوە گوتی:

خودایە پێمناخۆشنیە بەدیدارت شادبم، بەڵام حەزدەکەم خۆبەتکردن و هەوڵ و تێکۆشانی زیاتر لە پێناوی تۆدا پێشکەش بکەم، بەڵکو لە ئاست ئەم بەخششانەبم کە تۆ بەمنت بەخشیوە.

# هەڵگرتنی ئابلوقە

شەوەزەنگبوو، دۆڵە چیایەکە کپ و بێدەنگ وخامۆش بوو، ئاگرێکی کزی چرادانێك لەملاوە ڕووناکییێکی کەمی هەبوو، شەوگار گوێی لەنزاو پاڕانەوەی پڕ لە کاریگەری گرتبوو، بەڵام ئەم شەوە جگە لە دەنگی هەناسەی دایکی موسڵمانان و دڵەکوتەی ئومکەلسومی کچی بەملاوە هیچی تر نەدەبیسترا، لەپڕ دەرگا کرایەوە تیشکێکی ڕووناکی پڕشنگدار شوێنەکەی ڕۆشن کردەوە، دایکی موسڵمانان سەیری



کرد ئەمە هاوسەرە خۆشەویستەکەیەتی بەم ڕوخسارە پرشنگدارەی هاتە ژوورەوە، ئەمیش بەڕوویێکی گەشەوە هەستایەوە تا بەدیداری شادبێت، ئیتر بە هاتنەوەی ئەو هێزو تواناو ورەی بۆ گەڕایەوە.

ئومکەلسوم گوێ بیستی ئەم هەواڵ و باس و خواسانەبوو، کە باوکی(درودی خودای لەسەربێت) بۆ دایکی دەگێڕایەوەبۆیە واهەستی کرد ئەمانی شەوەزەنگ و تاریکی نزیك بۆتەوە، خەریکە پرشنگی خۆری ڕۆژێکی نوێ بێتە ئاراوە.

ئەبوتالیب چووبو بۆسەرداني کەعبەی پیرۆز، بەڵام کاتێ هاتەوە سەبارەت بەتێکچوونی پەیماننامەی ئابلووقەکە بەسەرهاتێکی سەیری گێڕایەوەو گوتی:

هوشامی کوڕی عەمر (ئەو کەسەی هەمیشە خۆراکی بەنهێنی لە تاریکی شەودا بۆ موسڵمانان دەبرد) چووەتەلای زوهەیری کوڕی ئەبی ئومەییەی ئەلەخزومی کوڕی عاتیکەی کچی عەبدولوتەلیب(برای هیند ئوم سەلەمە)، پێیگوتووە:

زوهێر تۆ چۆن بەمە ڤایل دەبیت خۆت و خانەوادەت خۆراك بخۆن و جلوبەرگ و پۆشاکی جوان بپۆشن و هامۆشۆی ژنەکانت بکەیت، کەچی خاڵوانی تۆش لەم بارو دۆخەدابن کەخۆت دەیزانی چۆنە!؟، چونکە من پێموایە ئەگەر ئەمانە خاڵوانی ئەبولحەکەمی کوڕی هوشام بوونایە، داوایان لە ئەبولحەکەم بکردایە پەیوەندیان لەگەڵ بپچڕێنێت، ئەوا دڵنیابە هەرگیز پەیوەندی خۆی لەگەڵ خاڵوانی نەدەپچڕاندو وەڵامی ئەم داواکاریەی نەدەدایەوە.

زوهەیر زۆر بە وردی هەستی لە وتەکانی هوشام ڕاگرت، پاشان پرسی و گوتی:

هوشام من چیبکەم!؟، من تەنیا تاکە کەسێکم، بەخودا ئەگەر کەسێکی دیکە لایەنگرو پشتیوانم بوایە دەچووم پەیماننامەکەم هەڵدەوەشاندەوەو تێکدەدا.

هوشام گوتی:

من دەڵێم کەسێکت دەست کەوتووە.

گوتی:

کوا ئەو کەسە کێیە؟.

هوشام گوتی:

ئەم کەسە منم.

زوهەیر گوتی:

بزانە کەسی سێیەمیش بدۆزەرەوە.

ئەبوتالیب گوتی:

هوشـام خێـرا دەچـێتە لای ئـەلموتعیمی کـوڕی نەوفـەلی کـوڕی عەبدومـەناف، پێیدەڵێت:

موتعیم، دووتیرە لە بنەماڵەی عەبدومەناف خەریکە لەناو دەچن و دەفەوتێن، تۆ چۆن دەتوانیت سەیریان بکەیت و لایەنگری قورەیشیەکان بیت!؟، دڵنیابە ئەگەر لە ئاکامدا لەم کارەیان سەرکەتووبن، یارمەتی و هاوکاری ئێوەیان نایەتە بەرچاو، بەڵکو لەدوای ئەوان زۆر بەخێرایی ئێوەش لەناو دەبەن.

ئیتر موتعیم لە وەڵامدا زوهێر ئاسا داوای کـرد کەسێکی تریـان لەگەڵدا بێت، بۆیـە دوای ئـەو هوشـام دەچـێتەلای ئەبولبوختـەری کـوڕی هوشـام، بەهـەمان شـێوە ئاخاوتنی لەگەڵ دەکات، لە وەڵامدا گوتی:

کەس هەیە یارمەتی دەرمان بێت بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە؟.

هوشام لە وەڵامدا گوتی:

بەڵێ، کوڕی زادلرەکب و موتعیم و عودەی و مـن ئامـادەین بـۆ ئەنجامـدانی ئـەم کارە.

ئەبولبوختەری داوای لە هوشام کـرد، پێویـستە کەسـی پێنجەمیش ئامادەبکات، بۆیە هوشام چووەتەلای زومعەی کوڕی ئەلئەسوەدی کوڕی موتـەلیبی کـوڕی ئەسـەد، دوای ئـەوەی باسـی هاشمیـەکان و ژیـانی مەرگەسـاتی کـردوە، بـیری خـستۆتەوە چـۆن هاشمیەکان پەیوەندی و مافی خزمایەتیان هەیە بەسەر ئەودا، بۆیە زومعە ئامادەیی

خۆی پیشاندا لەمەڕ هەوڵدان بۆ هەڵگرتنی ئابلووقەکە.

ئـیتر لـە ئاکامـدا هـەر پێنجیـان بڕیاریانـدا بـۆ تـاووتوێکردن و چـۆنیەتی ئەنجامدانی کارەکەیان شەو لە شوێنی(خەتمی ئەلحجون) لەسەرووی شاری مەککە کۆببنەوە، دوایی لەم شوێنە کۆدەبنەوە، لەوێ بڕیار دەدەن پەیماننامەکە بدڕێنن و هەڵوەشێننەوە، هەروەها زوهەیریان دەستنیشان کرد، کەئەو یەکەم کەس بێت بەیانی ئەم باسە لەگەڵ خەڵك بوروژێنێت و باس بکات، ئیتر بەیانی زوو لەگەڵ گزنگی خۆردا، زوهەیر چوو حەوت جار بە چواردەوری کەعبەدا سووڕایەوە، پاش ئەمە ڕووی لە خەڵك کرد، گوتی:

ئەی خەڵکانی شاری مەککە، چۆن دەبێت ئێمە خۆراك بخۆین و جلوبەرگ بپۆشین، کەچی دەبینین بنەماڵەی هاشمیەکان خەریکە دەفەوتێن و لەناودەچن، کڕین و فرۆشتنیان لەگەڵ ناکرێت، ئیتر بەخودا من چیتر دانانیشم تا ئەم لاپەڕەیە نەدڕێنم کە پچڕاندنی پەیوەندیەکەی تێدا نووسراوەتەوە.

ئەبولحەکەمی کوڕی هوشام لەوێ ئامادەبوو، گوتی:

تۆ درۆدەکەیت، پەیماننامەکە نادڕێت.

زەمعەی کوڕی ئەلئەسوەد، دەنگی هەڵبڕی و گوتی:

نەخێر بەڵکو تۆ درۆزنتری، چونکە هەرچی تێیدا نووسراوەتەوە، ئێمە هەرگیز پێی ڕازی نین.

لەدوای ئەو، ئەبولبوختەری گوتی:

زەمعە ڕاست دەکات، ئێمە هەرگیز دان بەم نووسراوە نانێین و پێی قایلنین.

موتعیم پشتگیری خۆی ڕاگەیاندو گوتی:

ئێوە ڕاست دەکەن، ئەوەی قسەیەکی تر بکات درۆ دەکات، ئێمە پەیماننامەکەو ناوەڕۆکەکەی بەخودا دەسپێرین.

لەدوای ئەمان هوشام کوڕی عەمر لایەنگری و پشتیوانی خۆی بۆ ڕایەکانی

ئەمان دەربڕی و بە کارێکی پەسندی زانی.

ئەبولحەکەم سەیری هەر پێنج پیاوەکەی کرد، تێگەیشت و گوتی:

ئێوە ئەم کارەتان بەشەو ئەنجامداوە، دیارە لە شوێنێکی دیکە ئەم هەڵوێستەتان ڕێکخستووەو یەکخستووە.

ئەبوتالیب لە کونجێکی بەیت دانیشتبوو ئەمەی بینی، پێنج پیاوەکە بایەخیان بە قسەکەی ئەبولحەکەم نەدا، بەڵکو موتعیم هەستا، لە پێش چاوی خەڵك چووە ناو کەعبە، لاپەڕەکەی هێنایەدەر تابیدڕێنێت، بەڵام کاتێ هێنای و سەیری کرد بینی (مۆرانە واتە مێروولەی سپی) هەمووی خواردووە، تەنیا ئەوەندەی نەخواردبوو کە نووسرابوو(باسمك اللهم ـ واتە ـ خودایە بەناوی تۆ).

کاتێ قوڕەیشیەکان ئەمەیان بینی، سەرسامبوون و لەشوێنی خۆیان حەپەسان، هەستیان کرد ئەم تیرەی هاویشتوویانە بۆ هاشمیەکان و موسڵمانان، پێچەوانەوە بووەتەوە قوڕەیشیەکانی پێکاوە، ئەبوتالیب کاتێ ئەمەی بینی یەکسەر هەستا بەرەو دۆڵ و پەناگەکە گەڕایەوە، تا موژدە بە خەڵکە ستەم دیدەکە بدات، بەدەم ڕێگادا کەسوکارو خزم و ئاوەرەبوەکانی حەبەشەی بیرکەوتەوە، بۆیە بەدەنگێکی بەرز پارچە شیعرێکی بەمبۆنەیە هۆنیەوە، لەگەڵ دەنگی ئەو، سەرجەم خەڵکی ناو دۆڵەکە ڕاچڵەکین و لەخەو هەستان، بەرەو پیری چوون، تا گوێیان لەم موژدە خۆشەبێت، کاتێ موسڵمانان ئەمەیان بیست، هەموویان بەیەك دەنگ گوتیان(الله أکبر)، ئیدی ئەم شەوە لەخۆشیان کەس خەو نەچوە چاوەکانی و کەلاکەی نەکەوتە سەرزەوی، بەیانی زوو لەگەڵ گازیوە هەموویان بەرەو کەعبەی پیرۆز چوون، بەچواردەوریدا سووڕانەوە، دوای ئەمە هەریەکەو چووەوەماڵەکەی خۆی، دوای ئەمە موسڵمانان چاوەڕوان بوون ئاخۆ قوڕەیشیەکان دوای بێ ئومێدبوونیان و نەمانی ئابلووقەکە، بیر لەچی دەکەنەوەو چ پلانێکی دیکەیان بۆ ڕێکدەخەن.



# مردنی دایکی

پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت)خۆی و خاووخێزانی گەڕایەوە ماڵەکەی خۆی لەمەککە، خەدیجەخان(خوداڵێیڕازیبێت) بە ڕزگاربوونی هاوسەرە خۆشەویستەکەی لە ئابلووقەکەدا زۆر شادو بەختەوەر بوو ، بەڵام سەرەڕای ئەمەش زۆر نەخۆش بوو، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ باری تەندروستی نالەبارتر دەبوو، تەنانەت ئەومندەی نەخایاند بە میواندارى خودای پەروەردگار شادبوو، پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) هەمیشە لەلای دانیشتبوو، موژدەی پێدەدا کە خودای مەزن چ جۆرە پاداشت و بەخششێکی بۆ ئامادەکردووە، بەم وتە پیرۆزو شیرینانە ئازارو ژانی گیان دەرچوونی سوکترو ئاسانتر دەبوو.

هەرسێ کچەکان زەینەب و ئومکەلسوم و فاتیمە بەدەوری دایکیاندا دانیشتبوون، سەیری دایکیان دەکرد و فرمێسکیان بۆی دەباراند، تەنانەت خۆیان بۆ نەدەگیرا خۆیان دەخستە سەر لاشەکەی، ئیتر لە دەیەمین ڕۆژی مانگی ڕەمەزان دوای دەساڵ لە پێغەمبەرایەتی هاوسەرەکەی(درودی خودای لەسەربێت)، خەدیجەخان کۆچی دوایی کرد، تەرمەکەی لە گۆڕستانی (ئەلحجون) بەخاك سپێردرا، بەدەستی پیرۆزی پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) شۆڕکرایەوە ناو گۆڕ، هاوسەرەکەی بە مردنی خەدیجەخان یەکجار دڵ پەست و غەمگین بوو، ماڵئاوایی کردو بەدڵێکی پڕ لە تاسەو پەژارەوە بەرەو ماڵ گەڕایەوە، ئومکەلسوم و فاتیمەی کچی لەئامێز گرت و دڵخۆشی دانەوە، سەبارەت بەم کارەساتە دڵتەزێنە سەرەخۆشی لێکردن.

# کۆچکردنی باوکی

پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) هەستی کرد لەدوای کۆچکردنی خەدیجەخانی هاوسەری(خودا لێیڕازیبێت)، ئیتر بۆ ئەو ئاستەمەو ناتوانێت لە مەککەدا بژیت و گوزەرانی تێدا بکات، بەڵام تارمایی و وێنەی خەدیجەی لە گۆڕەکەیدا بەدیدەکرد، سەرەڕای ئەمەش هەمیشە یادەوەریەکانی خەدیجەخانی لەبن گوێدا دەزرنگایەوە، ئیتر بۆیە حەزی دەکرد لەو شارەدا بمێنێتەوە، تەنانەت تا ئەوکاتەی خودای زاناو پڕتوانا ڕێگای کۆچکردنی بۆ شاری مەدینەی ڕووناکبووی پێدا، ئیتر ئەم کاتە پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) ماڵئاوایی لە کچەکانی کرد، لەگەڵ کازیوەی بەیان چووە ماڵی ئەبوبەکری صدیق(خودالێیڕازیبێت) تا بەیاوەرێتی ئەم یاوەرە بەڕێزەوە کۆچ بکات، پێش ئەوەی لە مەککە دابڕێت، لەسەر شوێنێکی بەرز بۆ ماوەیەکی کەم وەستا سەیری شوێنی لەدایکبوون و سەردەمی پەروەردەبوون و منداڵی خۆی و شوێنی بە پێغەمبەربوون و پڕشنگی یەکەم تیشکی پیرۆزی ئایینی کرد، دوایی فەرمووی:

بەخودا، تۆ خۆشەویسترین زەوی خودای بەلای خوداوە، هەروەها تۆ خۆشەویسترین زەوی خودای بەلای منەوە، ئەگەر دانیشتوانی تۆ منیان دەرنەکردبوایە، ئەوا لەتۆ دانەدەبڕام.

پاشان خۆی و یاوەرەکەی چوون خۆیان گەیاندە ئەشکەوتێك، لەوێ خۆیان حەشاردا، نەوەك کافرەکان بە شوێنیاندا بگەڕێن و بیاندۆزنەوە.

ئومکەلسوم و فاتیمەی خوشکی بەتەنیا مانەوە، ئەگەر چاودێری و بەزەیی خودای مەزن نەبوایە، ڕەنگە ئەم دوو خوشکە لەدوای مردنی دایکی بەسۆزو کۆچکردنی باوکی خۆشەویستیان گیانیان بسپاردایە، چونکە سەیری دەورو بەری خۆیان کرد، بینیان ئەم ماڵەی تا دوێنێ ئاسوودەترین و بەختەوەرترین ماڵ بوو لە



شاری مەککەدا، ئەمڕۆ بوومتە مەڵبەندی تاڵی و ناسۆری ژیان، تەنانەت ئەو کەسانەی پڕشنگی بەختەوەری و ئاسوودەییان دەبەخشی لەوێ نەماوون و کۆچیان کردوە.

ئومکەلسوم هەمیشە بە پەرۆش بوو بۆ بیستنی هەواڵی گەیشتنی باوکی، بۆیە تا ئەو کاتەی مـوژدەی گەیـشتنەکەی بۆهـات، زۆر نیگەران و پەشۆکاو بـوو، دوای ئەوەی باوکی(درودی خودای لەسەربێت) گەیشتە شاری مەدینە، زۆری نەخایاند زەیدی کوڕی حاریسە بەنهێنی هات، ئومکەلسوم و فاتیمەی لەگەڵ خانەوادەی ئەبوبەکری صدیق برد بۆ شاری مەدینەی مەڵبەندی کۆچبەران.

ئومکەلسوم و فاتیمە دوا ڕۆژەکانی ژیانیان لە شاری مەککەدا لەگەڵ زەینەب و ڕوقییەی هاوسەری ئەبولعاص و عوسمانی کوڕی عەففان بردەسەر، یادەوەریەکانی ڕۆژانی ڕابردوویان دەهاتەوە یاد، ئەم ڕۆژانەی پڕبوون لە شادی و بەختەوەری، پێش ئەوەی شاری مەککە جێبهێڵن، دەرگای ماڵەکەیان داخست، پاشان بەرەو ئەلحجون ڕۆیشتن، گۆڕی دایکی پاکیزەیان بەفرمێسکی چاوەکانیان ئاوڕشێن کردو ماڵئاواییان لە گیانی پاکی کرد.

ئیدی ئومکەلسوم دەستی فاتیمەی خوشکی گرت و بەرەو ئەم شوێنە کەوتنەڕێ، زەید تێیدا چاوەڕوانیان بوو، بۆدواجار سەیری شاری مەککەیان کرد، چاویان بە خانووبەرەو ئاواییەکانیدا خشاند، نەیاندەزانی ئایا بۆی دەگەڕێنەوە یان نا؟، دوای ئەوە چوونە ناو کاروانی کۆچبەران و بەرەو مەدینە بەڕێ کەوتن، ئیتر لەیەکەم چرکەدا، هەنگاو بەهەنگاو ژان و پەژارەی دابڕانیان کەمتر دەبووەوە، چونکە بۆلای باوکی پێغەمبەریان(درودی خودای لەسەربێت)دەچوون، ئەم باوکەی خاوەنی بەرزترین پلەو جێگاو ڕێگایە لەناو موسڵمانان و لایەنگرو یارمەتیدارانیدا.

# هاوسەرگیری

دووساڵ بەسەر کۆچکردندا تێپەڕ بووبوو، لەمیانەی ئەم دووساڵەدا چەندین ڕووداوی پڕ لەسەرومری هاتبوومدی، ئومکەلسوم سەرکەوتنی باوکی و موسڵمانانی بینی لە شەڕی بەدردا، هەروەها لە هەمان ڕۆژدا مردنی ڕوقییەی خوشکی بینی.

سەرەتای ساڵی سێیەم، هێشتا برینی غەمی مردنی ڕوقییە تەواو ساڕێژ نەبووبوو، تەنانەت قوڕمیشیەکانیش هێشتا شین و واوەیلاو زاریانبوو بۆ کوژراوەکانیان، چاوەڕوانی ڕەخساندنی دەرفەتێکی لەبارو گونجاویان دەکرد بۆ تۆڵەکردنەوە.

لەم سەرو بەندەدا لەسەرەتای مانگی ڕەبیعی یەکەم بوو، پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) بە نیازی پشوودان لە مزگەوت گەڕایەوە ماڵەوە، لەپڕ عومەری کوڕی خەتاب(خودا لێیڕازیبێت) بۆ سکاڵا کردن هاتە لای و گوتی:

بە ئەبوبەکرو عوسمانم گوتوومە یەك لەدوای یەك داوام لێکردوون، بەڵکو یەکێکیان حەفصەی کچم بکاتە هاوسەری خۆی، چونکە هاوسەرەکەی پێشووی (خونەیسی کوڕی حوزافە) مردووە، کەچی ئەبوبەکر بێدەنگبوو وەڵامی نەبوو، بەڵام عوسمان گوتی من ئێستا نامەوێت ژنبێنم.

ئومکەلسوم ئەم سکاڵایەی عومەری بیست، هەروەها گوێبیستی وەڵامی باوکی بوو کاتێ بۆ دڵخۆشی عومەر فەرمووی:

حەفصە شوو بە یەکێکی چاکتر لە عوسمان دەکات، عوسمانیش یەکێکی چاکتر لە حەفصە دەهێنێت.

ئومکەلسوم کاتێ ئەمەی بیست خورپەیەك کەوتە ناو دڵیەوە، چونکە دەیزانی هیچ ژنێك لەکچی عومەر چاکتر نیە تەنیا کچی پێغەمبەر نەبێت(درودی خودا لەسەر باوکی بێت)، بۆیە لە دڵی خۆیدا گوتی: چۆن ئایا من دەچمە ماڵی عوسمان و

شوێنی ڕوقییەی خوشکم!؟ ئەمەی بەلاوە سەیربوو، چونکە باوکی سەبارەت بەم کارە باسی لەگەڵ نەکردوە، هەرگیز کچەکانی خۆی بەشوو نەداوە ئەگەر ڕای وەرنەگرتبن و پرسی پێنەکردبن.

ئیدی سەرجەم یادەوەریەکانی کۆن و رابردووی بیرکەوتەوە، ئەم ڕۆژەی بیرکەوتەوە کاتێ خۆی و ڕوقییەی خوشکی کۆچکردووی بەیەکەوە خوازبێنی کران بۆ دوو کوڕەکەی ئەبولەهەب، دوایی چۆن بەیەکەوە هاوبەش بوون لە چارەنووسی هاوسەرگیریەکەدا، چۆن هەردوو کوڕەکە بە پلانی ژنە دارکێشەکە دەست بەرداریان بوون و تەلاقیان دان، پاش ئەوە ڕوقییە بووە هاوسەری عوسمان(خودا لێیان ڕازیبێت)، کەواتە ئەگەر ئەمیش ببێتە هاوسەری عوسمانی کوڕی عەففان، دیارە چارەنووسێکی هاوبەشی سەیر ئەم دوو خوشکە کۆدەکاتەوە، ئیتر ماوەیەك بوو ئومکەلسوم وەك زیندەخەونێك بیری لە نهێنیەکان و چارەنووسی ژیانی نادیاری دەکردەوە، چۆن لەگەڵ ڕوقییەی خوشکی بەیەکەوە کۆیان دەکاتەوە.

(ئوم عەیاش) یەکێکبوو لە کارکەرانی ماڵی پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت)، هاتەلای ئومکەلسوم پێیگوت:

باوکت بانگت دەکات و دەیەوێ بت بینێت.

ئیتر دوای ئەمە بەهەمان بڕی گوژمەی مارەیی ڕوقییەی خوشکی لە عوسمانی کوڕی عەففان مارەکرا، کراس و پۆشاکی بووکێنی بەهەمان شێوەی خوشکەکەی لەبەرکراو گوازرایەوە بۆ ماڵی عوسمان، باوکی(درودی خودای لەسەربێت) نوم عەیاشی کردە یاوەری لەگەڵ کچەکەی ڕەوان کرد، هەروەکو پێشتر لەگەڵ ڕوقییەی خوشکی ڕەوانکرابوو.

کاتێ چووە ماڵی تازەی، هەستی دەکرد تارمایی و وێنای خوشکی کۆچکردووی لە دەرگای ماڵەکەیدا چاوەڕوانی دەکات، تەنانەت دەیەوێ ببێتە یاوەرو هاودەمی لە خەوو نووستنیشدا لیێی جیانابێتەوە، بەغەم و پەژارەوە لە دڵی خۆیدا گوتی:

ڕوقییە، تەنیا ئەوە ماوە بگەم بەم شوێنەی تێیدا ڕاکشاویت، مردن بەیەکەوە کۆمان

بکاتەوە، هەروەکو چۆن لە ژیاندا لەوەتەی هەین هەمیشە بەیەکەوەبووین!.

بەڵام دوای ئەمە شەش ساڵ لەگەڵ عوسمانی کوڕی عەففاندا ژیانی بەسەربرد، لەماوەی ئەم شەش ساڵەدا، بینی چۆن ئایینی پیرۆزی ئیسلام لەوپەڕی سەرکەوتندایە، باوکی (درودی خودای لەسەربێت) لە سەرکەوتنێکەوە بەرەو سەرکەوتنێکی تر هەنگاو دەنێت، عوسمانی هاوسەری بەماڵ و بە گیان خۆی بەخت کردوە لە پێناو ئایینی خودای مەزندا، هەمیشە لە خەبات و تێکۆشاندا کەمتەرخەمی نەکردوە، تەنانەت دەگێڕنەوەو دەڵێن:

لەشاری مەدینە بیرێکی ئاو هەبووە ناوی بیری(دومە) بووە، خاوەنەکەی جوو بووە، ئاوی بەپارە فرۆشتووەتە موسڵمانان، پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) فەرمووی:

کێ(دومە) بۆ موسڵمانان دەکڕێتەوەو دەولیکی بۆ شۆڕدەکاتەوە، لەبری ئەوە لە بەهەشت سەرچاوەیەکی ئاوی یان(کانیاوێکی) پێبدرێت.

عوسمان(خودا لێیڕازیبێت)بۆ ئەم مەبەستە هەستا چووەلای جوولەکەکەداوای فرۆشتنی بیرەکەی لێکرد، بەڵام خاوەنەکەی تەنیا نیوەی بیرەکەی بە (دوازدە هەزار) درهەم فرۆشتە عوسمان، لەسەر ئەوە ڕێککەوتن، کە ئاوی بیرەکە ڕۆژێک بۆ عوسمان بێت، ڕۆژێکیش بۆ جووەکەبێت، ئیتر ئەم ڕۆژەی ئاوەکە بۆ عوسمان بوایە، موسڵمانان ئاوی دوو ڕۆژیان پاشەکەوت دەکردو لەماڵەوە دایان دەنا، کاتێ جوولەکەکە ئەمەی بینی بە عوسمانی گوت: بیرەکەت تێکداوە، وەرە نیوەکەی تریش بکڕەوە، ئیتر نیوەکەی تریشی لە جووەکە بە(هەشت هەزار) درهەم کڕیەوە.

هەروەها پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) فەرمووی:

کێ مزگەوتمان بۆ فراوان دەکات؟.

عوسمان(خودا لێیڕازیبێت) پارچە زەوییەکی کڕی خستیە سەر مزگەوتەکە.

لەمانگی زیلقەعدەی ساڵی شەشەمی کۆچی، باوکی(درودی خودای لەسەربێت)



سواری وشتری(ئەلقەصوا) بوو، لەگەڵ نزیکەی(هەزارو پێنجسەد) کەس لە یاوەرانی بەنیازی سەردانی ماڵی خوداو جێبەجێ کردنی (عەمرە) بەرەو شاری مەککە کەوتنەڕێ، بۆیە جگە لە شمشێر هیچ جۆرە چەکێکی دیکەیان لەگەڵ خۆیان نەبرد، تەنانەت شمشێرەکانیشیان لەناو کالاندا دەرنەهێنابوو، وێڕای ئەمەش قورەیشیەکان کاتێ ئەمەیان بیست، لە نزیك ناوچەی(ئەلحودەیبییە) ڕێگایان نەدا موسڵمانەکان زیاتر پێشڕەوی بکەن، نەیانهێشت بچنە ناو شاری مەککە، پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) بە عوسمانی زاوای خۆی گوت:

بڕۆ بە قورەیشیەکان بڵێ، ئێمە بۆ کوشتاری هیچ کەسێك نەهاتووین، بەڵکو بۆ سەردان و ڕێزگرتنی کەعبەی پیرۆز هاتووین، ئاژەڵمان هێناوە لای کەعبە دەیان کوژینەوەو ئیتر دەگەڕێینەوە، عوسمان چوو بۆ مەککە، ئومکەلسوم دەستی لەسەر دڵیەوەبوو، دوودڵ و پەشۆکاو بوو، نەوەك کافرەکان عوسمان بکوژن، بۆیە بە پەرۆشەوە چاوەڕوانی گەڕانەوەی دەکردبەڵام عوسمان(خودا لێیرازیبێت)دواکەوت و نەگەڕایەوە، لە ناکاو هەواڵی کوشتنی عوسمان لەناو موسڵمانان بڵاو بووەوە، پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) کاتێ ئەم هەواڵەی بیست فەرمووی:

ئیتر لێرە ناڕۆین، لەگەڵ ئەم هۆزەدا دەجەنگێین،بۆئەم مەبەستە موسڵمانانی کۆکردەوە تا پەیمانی شەڕکردن بدەن، هەموویان پەیمانیاندا شەڕ لەگەڵ قورەیش بکەن لە تۆڵەی خوێنی عوسمان، پەیمانەکە ناونرا (پەیمانی ئەلڕەزوان ـ الرضوان)، پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) بەنیازی پەیمان دان لە جیاتی عوسمانی کوڕی عەففان دەستی چەپی خۆی خستە سەر دەستی ڕاستی و فەرمووی:

عوسمان بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانی خوداو پێویستیەکانی پێغەمبەرەکەی چووە.

بەڵام دڵەڕاوکێ و خەفەتی ئومکەلسوم زۆری نەخایاند،چونکە عوسمان(خودا

لێیڕازیبێت) تەنانەت بێ ئازارو ئەشکەنجە گەڕایەوە ناو موسڵمانان.

لە ئاکامدا پەیمانی حودەیبییە هاتە کایەوە، عوسمان یەکێکبوو لەم یاوەرانەی بە مەرجەکانی پەیمانەکە قایل نەبوو، تەنانەت کاتێ پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) (عەمرەکەی) بەتاڵ کرد هەستا ئاژەڵەکەی خۆی کوشتەوە و سەری خۆی تاشی، ئیدی سەرجەم یاوەرەکانیش سەری خۆیان تاشی، تەنیا ژمارەیەکی کەمی یاوەران نەبێت هەندێ موویان لەسەریان کورت کردەوەو سەریان نەتاشی، یەکێك لەوانە عوسمان بوو، ئومکەلسوم ئەم هەڵوێستەی هاوسەرەکەی بە کارێك و کۆسپێکی گەورە هاتە بەرچاو، چونکە گوێی لەوەبوو کە باوکی فەرمووی:

خودا لەسەر تراشاوان خۆشبێت.

ئومکەلسوم دڵی نەسرەوت و نائارام بوو، تەنانەت تا دوای ئەمە باوکی فەرمووی:

لەگەڵ ئەوانەی قژیان کورت کردوە.

وێڕای ئەمەش دڵنیابوو لە بەشداربوونی هاوسەرەکەی لە پەیمانی(ئەلڕەزوان)دا، ئەگەرچی ئامادەش نەبوو، چونکە دەیزانی پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) ناردوویەتی بۆ مەککە، تەنانەت کارێك جێبەجێ بکات و ئەنجام بدات، ڕەنگە لەتوانای یەکێکی تردا نەبووە، یان ئەو شایان بەم کارەبووە بۆیە ئەوی هەڵبژاردوە.

# سەرکەوتنی مەزن

دووساڵ دوای پەیمانی حودەیبییە، سەرکەوتنی هەرەمەزنی موسڵمانان هاتەدی، شاری مەککەی پیرۆز ڕزگارکرا، ئومکەلسوم و فاتیمەی خوشکی ئەم سەرکەوتنە مەزنەیان بینی، بەڵام لەگەڵ ئەم سەرکەوتنە مەزنەدا بیرو هەست و سۆزیان هاتەجۆش، چونکە دایکی خۆشەویست و زەینەب و ڕوقەییەی خوشکیان بیرکەوتەوە.





هەروەها ئومکەلسوم لە مانگی ڕەجەبی ساڵی نۆیەمی کۆچیدا، بینی باوکی(درودی خودای لەسەربێت) دەیەوێت بۆ بڵاوکردنەوەی ئایینە پیرۆزەکەی رووبکاتە(تەبوك)، بۆ ئەم مەبەستە چەندین یاوەری، هیچ وڵاغێکیان نەبوو بۆ سواربوون، عوسمانی هاوسەری ئەم هەلەی قۆزتەوە تۆسەدو پەنجا وشترو پەنجا ئەسپی بۆ دابینکردن، هەروەها لە هەندێ سەرچاوەدا هاتوە، کە پاداشتێکی گەورەی بۆ دوارۆژی خۆی دابین کرد بە دابینکردنی هەزار وشترو حەفتا ئەسپ بۆ ئەم لەشکرەی ناوی (ئەلعوسرە)ی لێنرابوو.

# کۆچی دوایی

ئومکەلسوم(خودا لێیرازیبێت) لەمانگی شەعبانی ساڵی نۆیەمی کۆچی بۆ یەکجاری چاوەکانی لەیەکناو کۆچی دوایی کردو مرد، ئیدی لەدنیا بۆ هەتاهەتایە ماڵئاوایی لە باوك و هاوسەرو خوشکەکەی کرد، هیچ منداڵی نەبوو، لە تەنیشت ڕوقییەی خوشکی بەخاك سپێردرا، لەکاتی ناشتنیدا باوکی(درودی خودای لەسەربێت) بەچاوێکی پڕ لە ئەسرینەوە بەدیار گۆڕەکەیەوە وەستابوو، زۆر خەفەتبار بوو بۆ مردنی یەك لەدوای یەکی ئازیزان و جگەر گۆشەکانی.

بێگومان خودای مەزن بەزەیی بە ئومکەلسوم هاتۆتەوەو بەخششێکی زۆری لەگەڵدا کردووە، چۆن لە دەردو مەینەتی بێوەژنایەتی و مردنی باوکی دوور خستۆتەوە، چونکە تەنیا دوای ساڵێك لە مردنی ئەو، باوکی(درودی خودای لەسەربێت) کۆچی دوایی کرد، هەروەها کوشتن و شەهید کردنی هاوسەرەکەیشی نەبینی، چۆن نزیکەی چارەکە سەدەیەك دوای مردنی ئەو ڕوویدا، لەپێش چاوی هەردوو هاوسەرەکەی(ئومولبەنین کچی عوبەیدەی کوڕی حوصن و نائیلەی کچی ئەلفەرافصەی ئەلکەلبییە) شەهید کرا، کە لەدوای مردنی ئومکەلسوم ببوونە هاوسەری عوسمانی کوڕی عەفان(خودا لە هەموویان ڕازیبێت).

# خۆشەویسترین کچ

فاتیمە چوارەم کچی خێزانەکەیان بوو، لە ژینگەیەکدا لەدایکبوو کچ تێیدا زیندەبەچاڵ دەکرا، تەنانەت ئەگەر باوکێك هەواڵی لە دایکبوونی کۆرپەڵەیەکی کچی پێبدرابوایە، لە داخا ڕەنگ و ڕوخساری ڕەش هەڵدەگەڕا، بەڵام وێڕای ئەمەش دەتوانین بڵێین ڕەنگە هیچ کچێك وەك فاتیمە لەدوای باوکی بەمجۆرە ناوی نەکەوتبێتە ناو مێژووەوە، چونکە ئەم کچە شوێنەواری دیارو لە ڕادەبەدەری لەدوای خۆی جێهێشتوە، ڕەنگە خانەوادەی موحەممەد(درودی خودای لەسەربێت) چاوەڕوانی ئەم دواڕۆژە گەشەیان لەم کچە نەکردبێت کاتێ پێنج ساڵ پێش بە پێغەمبەربوونی باوکی(درودی خودای لەسەربێت) لەدایك بوو.

لەدایکبوونی فاتیمە هاوکاتبوو لەگەڵ ئەم ناکۆکیەی کەوتە نێوان تیرەو بنەماڵەکانی قورەیش، بەهۆی دانانەوەی (بەردی ڕەش - ئەلحەجەرلئەسوەد) لەشوێنی پێشووی خۆی، چونکە قورەیشیەکان کەعبەی پیرۆزیان لە بناغەیەوە هەڵوەشانەدەوە بەنیازی نوێ کردنەوەی، کاتێ گەیشتنە دانانەوەی ئەم بەردە پیرۆزە لەشوێنی خۆی، هەر بنەماڵەیەك دەیەویست شکۆمەندیەتی دانانەوەی بەردەکەی بەربکەوێت تا ببێتە مایەی گەورەیی و شانازی بۆ بنەماڵەکە، ئیدی لەئاکامدا ناکۆکی و بەربەرەکانێ کەوتە نێوانیانەوە،

هەتا دەرئەنجام لەسەردەستی موحەممەد(درودی خودای لەسەربێت) ڕێککەوتن و بە حوکمی ئەو قایلبوون.

بەپێچەوانەی سەرجەم عەرەبەکان، باوك ودایکی فاتیمە بە لەدایکبوونی کچەکەیان زۆر شادو کامەران بوون، تەنانەت ئاهەنگێکی خنجیلانەیان بەبۆنەی لەدایکبوونی ئەم کچە سازکرد، بێگومان هەرگیز مەککە کاری وای تێدا ئەنجام نەدرابوو، چجای ئەوەی بۆ کچێك لەدوای سێ کچی دیکە لەدایك بووبێت و هیچ کوڕێکیان لەنێواندا نەبووبێت، فاتیمە سەردەمی منداڵیەتی لە سایەی باوك و دایك

و خوشـکەکانی زۆر بـە بەختـەوەری و شـادمانی و نـازەوە بردەسـەر، بەتایبـەتی زەینەبی خوشکی گەورەی، بۆی ببووە دایکێکی بچووك.

دوای ئـەوەی زەینـەب شـووی بـە کـوڕە پوورەکەی، ئـەبولعاص کـوڕی ئـەلڕەبیع کـرد، هەروەها ڕوقییەو ئومکەلسوم شوویان بـە کوڕەکانی عەبـدولعوزای کـوڕی عەبدولموتـەلیب کـرد، ئیـدی دابڕانـی یـەك لـەدوای یـەکی خوشـکەکان، کاریگـەری زۆری لەسـەر بـاری دەروونی فاتیمە هەبوو، نیگەران و پەستی کردبوو، بۆیە ماوەیـەك دوای شـووکردنی خوشکەکانی هەمیشە بیری لـە شـووکردن دەکـردەوە، چۆن کچان لـە بـاوك ودایـك و خوشکانیان دادەبڕێن، ئەم بیرکردنەوەیە کاریگـەری کردەسـەر هەسـتی ناسـك و دڵـی پـڕ لەسـۆزی، سـەرەڕای ئەمـەش ئـەو گۆڕانکاریانـەی بەسـەر خێزانەکەیانـدا هـات، ڕۆڵێکی گرنگی لەسەر هەستی فاتیمـە هـەبوو، چۆن لەلایـەك بـاوکی(درودی خـودای لەسەربێت) هەمیشە لەبیرکردنەوەدابوو، دەیەویست هەمیشە تەنیا بێت و دووربێت لە چاوی خەڵك و دیارنەبێت، تەنانـەت دایکی سـەرقاڵی هاوسـەرە خۆشەویستەکەی بوو، لەماڵەوە سۆزو خۆشەویستی بۆ دەنواند، ئەگـەر لـەدەرەوەش بوایـە هەمیـشە دڵی لای ئەوبوو، لەلایەکی دیکە خوشکەکانی سەرقاڵی ژیانی نوێیان بوون، کەواتـە فاتیمە نیمچە تەنیاییەك و دابڕانێکی بەخۆیەوە دەبینی، هەمیشە لەگەڵ ئەندێشەو بیرو بۆچوونەکانی خۆیدا دەخولایـەوەو دەژیـا، ئـیتر ئـەم بیرکردنەوەیـەی، جگـە لـە هەستی، تەنانەت کاریگەری کردبووە سەر ویژدانی.

ئـەبوتالیب پیـاوێکی هـەژارو نـەداربوو، خـاوەنی کۆمـەڵێك منـداڵ بـوو، بۆیـە موحەممەد (درودی خودای لەسەربێت) بۆ دەست گرتن و یارمەتیدانی مامی، هەستا عـەلی کـوڕی ئـەبوتالیبی ئـامۆزای هێنایـە مـاڵی خـۆی و کردیـە کـوڕی خـۆی، عـەلی چوارسـاڵ لـە فاتیمـە گـەورەتر بـوو، ئیـدی فاتیمـە وەك بـراو هـاوڕێ سـەیری عـەلی دەکرد، بێگومـان فاتیمـە گلـەیی و ڕقبوونـەوەی لەشووکردن زۆربـوو، بەتایبـەتی لـە دوای شووکردنی خوشـکەکانی، ئـەم ڕقـەو گلەییانـەی، هەمیـشە لـە مێشکیدا پـەنگی دابوو، تەنانەت زۆرجار حەزی دەکرد ئـەم ڕقـەی لای عـەلی بـدرکێنێت، بـەڵام شـەرم

ڕێگریبوو لە درکاندنی ئەم ڕق و گلەییەی، زمانی لەنگدەبوو لەم ئاستەداو نەیدەتوانی باسی بکات.

فاتیمە هێشتا تەمەنی لەپێنج ساڵ تێپەڕ نەبووبوو، کاتێ ڕووداوی هەرەمەزن دوورگەی عەرەبی هەژاندو فاتیمەی ڕاچڵەکاند،بەهۆیەوە لەخەوی منداڵیەتی هوشیابووەوە، کەوتە ناو گێژاوی ئەم ڕووداوە مەزنەو باوکی بوو بە پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت)، ئیتر ڕووبەڕووی گەردەلوولی توندو تیژی بت پەرستەکان بووەوە، چۆن دژی شوێنکەوتوانی ئایینی نوێ هەڵیکردبوو.

فاتیمە ویڕای بچووکیەکەی و دابڕانی لەهاوتەمەنانی خۆی و لە ژیانی منداڵیەتی، کەچی زۆر لە ژیانی خۆی ڕازی بوو، بەهاو سەنگو ڕێ و شوێنی خۆی دەزانی لەناو منداڵانی هاوتەمەنیدا، چۆن ئەو کچی کەسێکی ئاسایی نیە، بەڵکو کچی پیاوێکی هەڵبژێردراو و پێغەمبەری خودایە، بۆیە پێویستە لەئاست ئەم بارە قورسەی دەکەوێتە سەرشانی خۆڕاگربێت، شایان بەکچایەتی ئەم پاڵەوانەبێت، بەبیرو باوەڕو ئایینزای نوێ ڕووبەڕووی سەرجەم قوڕەیشیەکان دەبێتەوە، بێ ئەوەی لە چەند کەسێکی چەوساوەو ڕەشوڕووت بەملاوە، هیچ پشتیوانێکی تری هەبێت.

## دوای هاتنی سروش

دوای هاتنەخوارەوەی سروش بۆ باوکی(درودی خودای لەسەربێت)، فاتیمە وەك جاران هەستی بەتەنیایی نەدەکرد، ئایینی پیرۆزی ئیسلام پەیوەندی نێوان ئەو و باوك و دایکی تۆکمەتر کرد، هەروەها پەیوەندیێکی بەهێزی لەگەڵ خوشکانی موسڵمان بۆ هاتەکایەوە، زۆر لەپەیوەندی نێوان ڕەچەڵەك و بنەماڵەو خوێن و خزمایەتی بەهێزتربوو، چونکە خانەوادەی موحەممەد(درودی خودای لەسەربێت)لەگەڵ سەرەتای کۆبوونەوەیان لەسەر خوانی ئایینی نوێدا، هەموویان تایبەتمەندیەتی خۆیان لەبیر چووەوە، باوەڕیان بەهیچ ئایینێك و بۆچوونێکی تر



ئەما، جگە لە یەك پەروەردگاری بێ هاوبەش نەبێت، كڕنووش تەنیا بۆ ئەو دەبەن، هەرگیز هیچ پەروەردگارێكی دیكە ناپەرستن.

فاتیمە بە باوەڕهێنان و موسڵمانبوونی عەلی كوڕی ئەبوتالیب زۆر شادو كامەران بوو، چونكە وەك براێكی ئازیزی ئەو بوو، بۆیە حەزی دەكرد بەنازو بەخششەكانی ئایینی پیرۆزی ئیسلام شادبێت، هەروەها جیاوازی ئایینیان لە نێواندا نەبێت، نەوەك ببێتە هۆكاری دوور كەوتنەوەی لە گەورەترین و شكۆدارترین خانەوادە و بچێتە پاڵ چینی كافران و بكەوێتە بەر ڕق و قینی خودای مەزن و باڵادەست، ئیتر عەلی سێیەم كەس بوو باوەڕی بە ئایینی پیرۆزی ئیسلام هێنا.

هەروەها فاتیمە زۆر حەزی دەكرد ڕیش سپی بنەماڵەی هاشمیەكان، ئەبوتالیب باوەڕ بە ئایینی ئیسلام بێنێت، وێڕای ئەمە باوكی(درودی خودای لەسەربێت) سەبارەت بە ئەبوتالیب فەرمووی:

مامە، تۆ لەسەرجەم ئەو كەسانەی ئامۆژگاریم كردوون، بانگم كردوون بۆ ڕێگای ڕاست، هەروەها لەسەرجەم ئەوانەی وەڵامیان داوەمەتەوەو یارمەتیان داوم پێویست تری بۆ ئەم مەبەستە.

هەروەها فاتیمە حەزی دەكرد كوڕە پوورەكەی ئەبولعاص كوڕی ئەلڕەبیع هاوسەری زەینەبی خوشكی باوەڕ بە ئایینی باوكی بێنێت، سەرەڕای ئەمە زۆری بەلاوە خۆشبوو سەرجەم بنەماڵەی هاشمیەكان باوەڕ بە ئیسلام بێنن، چونكە بنەماڵەو خزمی نزیكی باوكی بوون، بەدابڕانیان و دژایەتی كردنی ئەوان پەرێشان و نیگەران بوو، بەڵام ویستی خودای زاناو دانا بە پێچەوانەی حەزو ویستی فاتیمەبوو، چۆن خانەوادەی پێغەمبەر (درودیخودای لەسەربێت) تووشی نەهامەتی و كارەسات هاتن، هەتا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێت) ببێتە نموونەی هەرەبەرزی هێزو بیرو باوەڕ و ڕاستگۆیی و خۆڕاگری و خۆبەختكردن و قوربانیدان.

كاتێ سەرنج دەدەینە ژیانی پڕ لەناسۆری فاتیمە، دەبینین هەر لەدەسپێكی ژیان



و لەسەرەتای تەمەنی منداڵیەوە تووشی ململانێ و دژایەتی و ئاگری شەڕی دژواری قورەیش هاتووە، سەرەڕای ئەمە تەنیا فاتیمە کارەساتی دڵتەزێن و یەکجار مەزنی بەچاوی خۆی بینی، جگە لە خوشکەکانی، چۆن لە پشت سەری باوکی دانیشتبوو، کاتێ گیانی پاك و بێگەردو بێتاوانی بە پەروەردگاری مەزن سپارد و، ماڵئاوایی لە کچە خۆشەویستەکەی کرد (هەزاران درودو سڵاوی خودا برژێتەسەر گیانی پاکی باوکی فاتیمە)، دیارە ئەم کچە لەئاست ئەم هەموو دەردەسەریە بووە، بۆیە پەروەردگاری مەزن ئەم سەروەریەی پێ ڕەوا بینیوەو بەخشیوە، تەنانەت پلەو پایەی لە دوا ڕۆژدا بەرز بکات و بەختەوەری بکات.

فاتیمەی نەشمیل و لەبار، نەیتوانی وەك منداڵانی هاوتەمەنی حەزو ئارەزووەکانی تەمەنی منداڵی بەیاری وگاڵتەو گەپ دامرکێنێت، بەڵکو خۆی لە باوکی نزیك دەکردەوەو هەرگیز لێی دانەدەبڕا، ئەوەندە بچووك و منداڵ بوو، بۆیە بواری ئەوەی هەبوو لەگەڵ باوکی بۆ هەموو شوێنێك بچێت، تەنانەت کاتێ باوکی بۆ مەبەستی بانگەوازیکردن و ڕاگەیاندنی ئاینی نوێ، ڕووی لە یانەو شوێنی کۆڕو کۆبوونەوەی قورەیشیەکان دەکرد فاتیمە بەدوای دەچوو نەدەگەڕایەوە، چەندین جار لە ڕێگادا تیرو توانج و ئازاری ستەمکارانی دەبیست ودەیبینی چۆن ئازاری باوکیان دەدا،تەنانەت ڕۆژێك باوکی(درودی خودای لەسەربێت)، بەنیازی سووڕانەوەو (تەوافی) کەعبەی پیرۆز، بەرامبەر گۆشەی بەردی ڕەشی پیرۆزی کەعبە وەستابوو، فاتیمەش لە نزیکیەوە وەستابوو، لەناکاو چەندین قورەیشی هاتن بەچواردەوری باوکی کۆبوونەوەو پێیانگوت:

دەڵێن تۆ کەم و کوڕیت خستۆتە پاڵ خواکانی ئێمەو لەناو خەڵك وروژاندوتەو باست کردوە؟، هەروەها سووکایەتیت بە باوك و باپیرانی ئێمە کردوە؟، دیارە دەتەوێت خەون و ئاواتەکانمان پووچەڵ و نەزۆك بکەیت؟، ئیتر چەندین قسەو گوفتاریان خستە ئەستۆی باوکیەوە، باوکی(درودی خودای لەسەربێت) لە وەڵامدا

فەرمووی:

بەڵێ ئەوەی ئێوە باسی دەکەن من گوتوومە.

فاتیمە بینی لەناکاو پیاوێك بەتوندی(عەباکەی) باوکی گرت، ئیتر فاتیمە لەشوێنی خۆی حەپەساو نەیتوانی جوڵە بکات و توشی دڵەڕاوکێ بوو، سەیری کرد ئەبوبەکر(خودا لێیرازیبێت) لە شوێنی خۆی هەستاو گوتی:

ئایا ئەم پیاوە تەنها بۆیە دەکوژن چونکە دەڵێ پەروەردگار تاکە خودای منە؟!.

قورەیشیەکان بە چاوێکی پڕ لە ڕقوقینەوە ئاوڕیان لە ئەبوبەکر دایەوە، ڕیشی پیرۆزیان گرت و مشتەکۆڵەیەکیان لە سەری دا، ئیتر دوای ئەمە باوکی(درودی خودای لەسەربێت) لەماڵی خودای پیرۆز چوومدەرەوەو بەرەو ماڵ گەڕایەوە، فاتیمەش بە دڵەڕاوکێ و بەپەرۆشەوە بەدوایەوەبوو، بینی لە ڕێگای گەڕانەوەدا چۆن قورەیشیەکان ئازاری باوکی دەدەن، سوکایەتی پێدەکەن و بەدرۆی دەخەنەوە، تەنانەت باوکی(درودی خودای لەسەربێت) کاتێ گەیشتە ماڵەوە چووە ناو پێخەفەکەی و خۆی داپۆشت.

هەروەها ڕۆژێکیان باوکی(درودی خودای لەسەربێت) لەنزیك کەعبەی پیرۆز خەریکی کڕنووش بردن بوو، فاتیمەش لە نزیکیەوە وەستابوو، هەرگیز چاوەکانی لە سەیرکردنی باوکی هەڵنەدەبڕی، دڵی چۆلەکە ئاسا بەدەوری باوکیدا باڵەفرەی بوو، لەناکاو بینی چەند گاورێکی قورەیشی بە چواردەوری باوکیدا کۆبوونەوە، عوقبەی کوڕی ئەبی موعیت پزدانێکی مەڕی هێناو خستیە سەر پشتی باوکی، باوکی(درودی خودای لەسەربێت) سەری لە کڕنووشەکە بەرز نەکردەوە تەنانەت فاتیمە هات پزدانەکەی لەسەر پشتی باوکی لاداو لە خودای مەزن پاڕایەوە تۆڵەی ئەم سوکایەتی کردنە لە تاوانباران بکاتەوە، ئیتر پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێت) سەری بەرز کردەوە فەرمووی:

خودایە ئەم قورەیشیانەم بەتۆ سپارد بۆ تۆڵەسەندنەوە، خودایە تۆڵە لە

ئەبوجەهلی کوڕی هوشام، عوتبەی کوڕی ڕەبیعە، عوقبەی کوڕی ئەبی موعیت، ئوبەی کوڕی خەلەف بکەرەوە، ئەم نزاو پاڕانەوەیە کاریی کردە سەر هەست و بیری تاوانبارەکان، بۆیە کاتێ ئەمەیان بیست ترسان و کشانەوە دواوە، دەستیان خستەسەر چاوەکانیان تەنانەت تا نوێژەکەی تەواو کرد، دوای ئەمە پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) بە یاوەریەتی فاتیمەی کچەی بەرەو ماڵ گەڕایەوە، زۆری نەخایاند تەنیا دوای چەند ساڵێك پاش ئەم ڕووداوە، فاتیمە لاشەی ئەم تاوانبارانەی ناویان هاتووە بە کوژراوی لە دەوروبەری ئاوی بەدردا بینی.

ڕۆژێك خودای کاربەجێ و مەزن فەرمانی بە پێغەمبەرەکەی(درودی خودای لەسەربێت) کردو فەرمووی:

﴿ وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ الْأَقْرَبِينَ ﴿٢١٤﴾ ﴾ الشعراء: ٢١٤

واتە: ئەی موحەممەد(درودی خودای لەسەربێت) گەف لە کەسە نزیکەکانی هۆزەکەت بکە، واتە پێیان ڕابگەیەنە لەدوای زیندووبوونەوە دۆزەخ و سزادان هەیە.

پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت)بۆ جێبەجێ کردنی ئەم فەرمانە چووەلای قوڕەیشیەکان فاتیمەی کچی بەدوای باوکیدا چوو، باوکی بە دەنگێکی بەرز فەرمووی:

قوڕەیشیەکان خۆتان بکڕنەوە، لای خودا من هیچ سوودێکم بۆ ئێوە نیە، ئەی نەوەکانی عەبدولەنافـ! لای خودا من هیچ سوودێکم بۆ ئێوە نیە، ئەی عەباسی کوڕی عەبدولموتەلیبـ! لای خودا من هیچ سوودێکم بۆتۆ نیە، ئەی صەفییەی پووری پێغەمبەر! لای خودا من هیچم بۆتۆ پێناکرێت، ئەی فاتیمەی کچی موحەممەد هەرچەند سامانی منت دەوێ بۆخۆت بیبە، بەلام لای خودا من هیچم پێناکرێت بۆتۆ.

فاتیمە کاتێ ئەمەی بیست خورپەیەکی پڕ لەسۆزو کاریگەر کەوتە ناو دڵیەوە، بە



چیەوە گوتی:

بەڵێ لە خزمەتتا ڕاوەستاوم ئەی خۆشەویسترین باوك و ڕێزدارترین بانگخواز.

فاتیمە سەرەڕای بچووکی و نەشمیلی بەسەربەرزی و ڕوویەکی گەشەوە بەناو ئاپۆڕەی خەڵکەکەدا تێپەڕبوو، هەستی بەشادی و کامەرانی دەکرد، چونکە باوکی لەناو خوشکەکانیدا بگرە لەناو هەموو کەسە تایبەتی و خۆشەویستەکانیدا ئەوی هەڵبژاردوەو بەنموونە هێناویەتەوە بۆ سەرجەم ئادەمیزاد، بەڵکو بزانن ئەو بۆ خۆشەویسترین و ئازیزترین و نزیکترین کەسی خۆی سوودی نیە.

ئەگەر سەرنجبدەین، دەبینین پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) لە سەرەتادا لە هۆزی قورەیشەوە دەستی بە بانگەوازەکەی کرد، پاشان بنەماڵەی عەبدولمەناف، دوای ئەمە مامی و صەفیەی پووری، دوای ئەمانە نموونەی بە فاتیمەی کچی هێناوەتەوە، بۆ ئەوەی پەندو ئامۆژگاری لە فەرموودەکەی وەربگرن، چونکە ئەگەر پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) لەلای خوداوە هیچ سوودێکی بۆ فاتیمەی کچی نەبێت چۆن سوودی بۆ یەکێکی دیکە دەبێت، کەچی فاتیمە خۆشەویسترین منداڵ بووە لای باوکی هەروەك لە فەرموودە ڕاست و دروستەکانی پیغەمبەردا(درودی خودای لەسەربێت) سەبارەت بە فاتیمە هاتووەو دەفەرمووێت:

فاتیمە پارچەیەکە لەمن، ئەوەی ئازاری بدات ئەوا ئازاری من دەدات، ئەوەی بیزاری بکات ئەوا من بێزار دەکات.

هەروەها فەرموویەتی:

چاکترین ژنانی جیهان چوارن، مەریەم و ئاسیەو خەدیجەو فاتیمە.

هەروەها ئەبوجورەیج دەڵێ:

لە چەند کەسێك بیستوومە، فاتیمە بچووکترین کچەکانی پێغەمبەرە(درودی خودای لەسەربێت) و لە هەموویانیش لای باوکی خۆشەویستربووە.

# چەند ڕاو سەرنجێك سەبارەت بەخۆشەویستی فاتیمە

ڕۆژهەڵاتناسان لە دێر زەمانەوە گومانیان لە خۆشەویستی پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) بۆ فاتیمە هەبووە، پێیان وابووە لە کچەکانی دیکە خۆشەویستر نەبووە لای باوکی، بەڵکو ئەم خۆشەویستیە لە ڕادەبەدەرەی باوکی بۆ فاتیمە دوای سەرهەڵدانی چینی شیعە هاتۆتە ئاراوە، ئیدی شیعەکان بەجۆرێك پەرەیان بەم خۆشەویستیە داوە، تەنانەت لەڕووی ڕامیاری و ئایینیەوە کاری کردە سەر سەرجەم مێژووی ئیسلامی، سەیرکە بزانە(لامنس)ی ڕۆژهەڵاتناس سەبارەت بەم بابەتە چی گوتووە:

(مێژوونووسان لەسەرەتاو بەراییدا فاتیمەیان لە بیرچووبوو باسیان نەکردبوو، تەنانەت ئەوکاتەی بیرۆکەی شیعایەتی لەناو موسڵمانان سەریهەڵدا ئینجا هاتن بە درێژی قسەیان لەسەر فاتیمە کرد، ئیتر ناوبانگی بڵاوبووەوەو ناوی دەرکرد، لەکاتێکدا خوشکەکانی فاتیمە لەبیر کراون و کەس باسیان ناکات).

بەڵام مامۆستا(عومەر ئەبولنەصر)نووسەرێکی موسڵمانە، وەڵامی ئەم بۆچوونەی لامنس دەداتەوەو دەڵێ:

(مێژوونووسان نەك باسی فاتیمە، بەڵکو باسی هەرسێ کچەکانی دیکەی پێغەمبەریان (درودی خودای لەسەربێت) نەکردوە، چونکە ئەوان ژیاننامەو مێژووی پێغەمبەرو ئیسلامیان نووسیوەتەوە، پێغەمبەرایەتی و ئیسلامیش پەیوەندیان بە کچەکانی پێغەمبەرەوە(درودی خودای لەسەربێت) نەبووە، هەروەها کچ تایبەتمەندی شەڕو کوشتارو جەنگی نەبووە، تا ناویان لە ناو جەنگاوەراندا بدرەوشێتەوە، وێڕای ئەمەش سەنگ و کاریگەریان لەسەر سیاسەت و ئاییندا نەبووە

تا بۆ مێژوونووسان باسیان بکەن و مێژوویان بۆ بنووسن و دابڕێژن، چونکە وەك ڕوون و ئاشکرایە و بەڵگە نەویستە، مێژوونووسان باسی ئەم جۆرە کەسایەتیانە دەکەن، کە کاریگەری زۆرو ڕۆڵی باڵایان هەبێت لەسەر ناوەرۆکی بابەتەکە، هەرگیز باسی ئەمانە ناکەن بەم جۆرەو بەم شێوەیە، لە ناوەرۆکی بابەتەکە دوورە پەرێزبن و کاریگەریان بەسەر بابەتەکەوە نەبێت).

ئەگەر چی وەڵامەکەی مامۆستا عومەر زۆر بەجێ و ڕاستە، بەڵام وێڕای ئەمەش ڕەنگە گومانەکەی لامنس بەلاوەنەنێت، بۆیە ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ سەردەمی ژیانی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێت)، چاوێك بە بەڵگەنامە مێژووییەکانی ئەو کاتە دابخشێنینەوە، دەبینین چاکترین و دروست ترین وەڵامەمان دەست دەکەوێت، چونکە مێژوونووسان و زانایانی بواری ژیاننامە، بەڵگەی بەهێزو ڕاست و دروست و سەلێندراویان بەکار هێناوە، سەرەڕای ئەمەش نووسراوە کۆنە مێژووییەکان لەلایەن ڕەخنەگران و پسپۆرانی بواری مێژوویی بەدواچوونەوەو پشکنین و لێکۆڵینەوەی جۆراوجۆری بۆ ئەنجامدراوە، تەنانەت زۆر بەڕێکی پاراستراوە تا گەیاندراوەتە ئەمڕۆ.

بەڵام ئەوەی لێرەدا گرنگە بورووژێت، ئەو ڕۆژهەڵاتناسە زۆربڵێ و قین لە دڵانە، تاکە بیانوو بەڵگەیان بۆ ئەم مەبەستە تەنیا ڕووداوێکە، پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) هەندێ خشڵ و مۆرووی بەدیاری بۆ هاتبوو، فەرمووی: ئەم خشڵە جوانە (دەدەم بە خۆشەویسترین کەسم)، دوایی دایە دەست (ئومامەی کچی ئەبولعاص کوڕی ئەلرەبیع)، ئیتر زۆربەی ڕۆژهەڵاتناسان هەڵوەستە لەسەر ئەم فەرموودەیەو ئەم باسەدا دەکەن، کەچی سەبارەت بە خۆشەویستی باوکی بۆ فاتیمە چەندین فەرموودەو بەسەرهات هەیە، بەڵام ڕۆژهەڵاتناسان هەمووی پشت گوێ دەخەن، کەواتە دیارە دەیانەوێت فەرموودە ڕاست و ڕەواکانی سەبارەت بە خۆشەویستی فاتیمە هاتوون لەناوبەرن، چونکە بەسەرهاتی خشڵەکە پشت ڕاست

دەکەنەوەو متمانەیان پێی هەیەو پێیانوایە هیچ گومانی تێدا نیە، کەچی دەربارەی خۆشەویستی بۆ فاتیمە دەڵێن دوای سەرهەڵدانی شیعەکان هاتۆتە ئاراوەو نووسراوەتەوە، کەچی سەرجەم فەرموودەکان هەڵقولاوی یەك سەرچاوەو یەك بنەمان.

بەڵام وەك دیارەو ئاشکرایە پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) هەست و سۆزی خۆی لە فەرموودەکەی مۆروو خشڵکەدا بۆ نەوەکەی دەربڕیوە، چونکە ئومامە زەینەبی دایکی مردبوو پێویستی بە خۆشەویستی و چاودێری هەبوو، بێگومان ئەم فەرموودەیەو ئەم هەڵوێستە بووە مایەی خۆشی و شادی بۆ ئومامەی بێ دایك.

هەروەها لە هەڵوێستێکی تردا پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) هەندێ زێرو خشڵی بەدیاری بۆ هاتبوو، دیاریەکەی دایە دەست عەلی ئامۆزای و فەرمووی:(بیکەرە دیاری بەسەر فاتیمەکاندا دابەشی بکە)، عەلی(خودا لێیڕازیبێت) کردیە چوار بەش، بەشێکیان بۆ فاتمەی کچی موحەممەد، دووەمیان بۆ فاتیمەی کچی ئەسەد کوڕی هاشم هاوسەری ئەبوتالیب دایکی عەلی و جەعفەرو عوقەیل،سێیەمیان بۆ فاتیمەی کچی شەهید حەمزەی کوڕی عەبدوامطەلیب، چوارەم بەشیش بۆ فاتیمەی کچی ئەبوتالیب(ئوم هانی)، یان هەندێك دەڵێن بەشی چوارەم درایە فاتیمەی کچی شەیبەی کوڕی ڕەبیعە هاوسەری عوقەیلی کوڕی ئەبوتالیب.

ئایا باوکی(درودی خودای لەسەربێت)ڕێزو خۆشەویستی تایبەتی بۆ فاتیمەخان هەبووە؟

بێگومان ئەم پرسیارە ڕووبەڕووی هەموو ئەم نووسەرانە دەبێتەوە، کە دەربارەی ئەم خانمە دەنووسن، وەك پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد، ڕۆژهەڵاتناسە ڤین لەدڵەکان پێیانوایەو دەڵێن: ئەم خۆشەویستیە شیعەکان دایانهێناوەو



دروستیانکردوە، ئێمە پێمانوایە ئەم بۆچوونەیان کارێکی سەیرو نامۆ نیە، چونکە ئەوان هەمیشە بە پێی حەزو ئارەزووی خۆیان میژووی ئیسلام دەگۆڕن و بەرەو ئاقارێکی دەمارگیری و خۆپەرستی دەبەن، بەلام ئێمە هەرگیز بە ئەنجامدانی ئەم کارەیان سەرکۆنەو سەرزەنشتەیان ناکەین، چونکە بێگومان مرۆڤی بێ باوەڕ هەمیشە لەئاست حەزو ئارەزووەکانیدا لاوازو بێ هێزە، بۆیە تووشی هەڵەو کاری نادروست دەبێت، ئەگینا ئەم جۆرە کەسانە، یان با بڵێین ئەم زانایانە ئەگەر بیانتوانیبوایە خۆیان لەچنگ دەمارگیری و ڕقەبەری ئیسلام ڕزگار بکردایە، هەوڵ و تێکۆشانیان لەبوارێکی دیکە بخستبوایە گەڕ، ئەوا بێگومان چاکترین و پوخت ترین بەرهەمیان بەدی دەهێناو دەهێنا کایەوە.

بەلام لێکۆڵەرەوە موسڵمانەکان وەك بیگانەکان بەسەرپێیی نەچوونەتە ناو ئەم باسە، بەڵکو بەپەرۆشەوەو بێ هەست کردن بە ماندوێتی چوونەتە قولایی بابەتەکە، زانا موسڵمانەکان دەربارەی خۆشەویستی موحەممەد (درودی خودای لەسەربێت) بۆ فاتیمەی کچی دەڵێن: بێگومان عەرەبەکان پێش هاتنی ئایینی پیرۆزی ئیسلام زۆر ڕقیان لە کچ دەبووەوە، بەلام سەرەڕای ئەوەی فاتیمە چوارەم کچی ماڵەکەیان بوو، کەچی موحەممەد(درودی خودای لەسەربێت) بەپێچەوانەی دابونەریتی کۆمەڵگاکەی، فاتیمەی کچی زۆر خۆشدەویست، ڕەنگە هۆکارەکەی بۆ ئەوە بگەڕێتەوە نەوەك لەکاتی لە دایکبوونیدا بەشادی و خۆشەویستی پێشوازی لەم کچە نەکردبێت، چونکە لەدوای سێ کچی دیکە هاتبووە ماڵەکەیان، ئیتر بۆیە هەمیشە بە چاوی باوکایەتی پڕ لەسۆزو بەزەییەوە سەیری ئەم کچەی دەکرد، هەتا هیچ گومانی لە دڵ و دەروونیدا نەمێنێت، تا ئەو پەڕی خۆشەویستی خۆشیدەویست، زانایان پێیانوایە تەنیا دایکان ئەم سۆزو خۆشەویستیە بۆ کچانی سێیەم و چوارەم دەردەبڕن، بەلام لەهەمان کاتدا زانایان پێیانوایە باوکێکی هەڵبژێردراو بۆ پێغەمبەرایەتی، پێویستە ئەم هەڵوێستەی هەبێت بۆ کچی چوارەمی، تا لە خەمۆکی و دڵشکاوی و ڕەنجەڕۆیی بیپارێزێت و هەست بەوە نەکات لەبەر کچەکانی دیکە



ئەمیان خۆشناوێت، بەڵام هەرچەندە خۆشەویستی فاتیمە جێگای خۆی لەناو دڵی باوکیدا کردبووەوە، وێڕای ئەمەش کاریگەری نەکردبووە سەر خۆشەویستی باوکی بۆ کچەکانی تری، بەڵکو هەریەکەو خۆشەویستی تایبەتی خۆی لەدڵی باوکیدا هەبوو، سەرەڕای هەموو ئەمانە خۆشەویستی فاتیمە دوای مردنی سێ خوشکەکەی لەدڵی باوکیدا پتر پەرەی سەندو زیاتر بوو، بەتایبەتی دوای لەدایکبوونی دوو کوڕەکەی(حەسەن و حوسەین)، چونکە پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) ڕەچەڵەکی بنەماڵەی خۆی تەنیا لەم دوو کوڕو نەوەکانیاندا بەدی دەکرد.

## فاتیمەو خۆڕاگری

بۆ باوەڕهێنان بە ئایینی نوێ، پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) بانگەوازی خزم و هۆزەکەی خۆی کرد، لە ڕێڕەوی وتەکانیدا فەرمووی: فاتیمەی کچی موحەممەدیش گەر باوەڕ بەئایینی ئیسلام نەهێنێت، هەرچەندە باوکی پێغەمبەرە، لای خودا سوودی بۆی نابێت، فاتیمە کاتێ ناوی خۆی لە باوکی بیست، خەریکبوو لە خۆشیانا باڵ بگرێت، خێرا بۆلای خەدیجەی دایکی چوو، باسەکەی بۆی گێڕایەوە، فاتیمە باوەڕی بە خودای مەزن و تاك وتەنیا هێنابوو، پەیامی ئیسلامی بە ڕاست و دروست دەزانی، سەرەڕای بچووکی ژیانی خۆی لەپێناوی دواڕۆژدا بەخت کردبوو.

دایکی دەستی پڕ لەسۆزو خۆشەویستی بەسەر نێوچەوانی کچە بچکۆڵەکی داهێنا، بە هێمنی و لەسەرخۆ گوتی:

بچکۆڵەکەم ئاخۆ دوای من چیت بەسەربێت؟، من بەشێکی زۆر ژیانم بردۆتەسەر، بۆیە ئەمڕۆ یان بەیانی من نامێنم، باردەکەم و جێتان دەهێڵم، دڵم لای زەینەب و ڕوقییەی خوشکت نامێنێ، چونکە لەسایەی چاکترین هاوسەردا دەژین، ئومکەلسومیش لەم تەمەنەو لەو ئەزموونەی هەیەتی ئۆقرەو ئارامیم پێ دەبەخشێت، بەڵام فاتیمە تۆ لە هەرەتی گەنجیەتیدا ڕووبەڕووی ژیانێکی پڕ لە

ماندووبوون و ژان و کارەسات و مەینەت دەبێت.

فاتیمە پاڵەوانیەتی باوکی بیرکەوتەوە بەدایکی گوت:

دایە، دڵت ئارام بێت و لەدوا ڕۆژی مـن مەترسە، قورەیشیەکان بە ئازارو ئەشکەنجەدانی موسڵمانان دڵشاد دەبن، هەرچی لە دەستیان دێت با بیکەن، منیش دەبێ لەئاست ئەواندا خۆڕاگربم، دەبێ بەشە ئازاردانی خۆم بەربکەوێت، پێویستە لەئاست ئەم ئازارو ئەشکەنجانەدابم، کە شایان بە کچی پێغەمبەر بێت و زۆر خۆشەویست بێت لای باوکی.

خودای مەزن و کاربەجێ ئەم داخوازیەی فاتیمەی هێنایەدی، چونکە تا ئەوپەڕی تاقیکردنەوە بە ژیانی ناسۆری و نەهامەتی تاقیکرایەوە، هەرگیز ئەوانەی لەئاست فاتیمەبوونە لە کچانی پێغەمبەرانی پێشوو، لە ژیاندا وەك فاتیمە تووشی دەردەسەری و نەهامەتی نەبوونەتەوە.

فاتیمە خۆشەویستیێکی بێ پایانی بۆباوکی و موسڵمانان هەبوو، بۆیە بەئازاردانیان زۆر خەفەتبارو نیگەران دەبوو، تەنانەت لەگەڵ موسڵماناندا هەستی بە گەرمی بەردەکان دەکرد، کاتێ لە قرچەی هەتاو و خۆرەتاودا بەردی گەرمیان دەخرایە سەر جەستە، بگرە کاتێ موسڵمانێکی چەوساوە پشتی دەکەوتە بەر زەبرو لێدانی قامچی دڵڕەقانەی قورەیشیەکان فاتیمە هەموو جەستەی داهاتە هەژان.

فاتیمە لەگەڵ باوك و دایکی لە دۆڵی ئەبوتالیبدا ماوەی ئابلووقە دژوارەکەی بردەسەر، دوای نەمانی ئابلووقەکەو گەڕانەوەی بۆ ماڵەوە، بەچاوی خۆی مردنی دایکی بینی، دوای ئەمە بینی چۆن باوکی(درودی خودای لەسەربێت) هیچ شوێنێك نەماوە لە شاری مەککەو دەوروبەریدا تێیدا بژیت و بیگرێتەخۆی، بۆیە بەناچاری کۆچی کرد بۆ شاری مەدینە، عەلی کوڕی مام ئەبوتالیب لەشوێنی ئەو مایەوە بۆ جێبەجێکردنی هەندێ کاروباری باوکی و گەڕاندنەوەی ئەو کەلوپەلانەی خەڵك بە ئەمانەت لایان دانابوو.

ئیتر فاتیمەو ئومکەلسوم بەتەنیا مانەوە، تەنانەت ئەوکاتەی نێردراوی تایبەتی

لای باوکیانەوە هات بە شوێنیانداو چوون بۆ شاری مەدینە، ئیدی دەرگای ماڵی موحەممەد (درودی خودای لەسەربێت) لەگەڵ دەرگای ماڵی سەرجەم یاوەرانی(خودا لێیانڕازیبێت) لە شاری مەککە داخراو کەسیان تێیدا نەمان.

بەڵام وامەزانە کۆچکردنی ئەم دوو کچەی پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت)، وەکو کۆچێکی ئاسایی بەخۆشی و شادی بێ ئازارو ئەشکەنجەدان جێبەجێ بووبێت، بەڵکو کاتێ ئەوان لەمەککە دەرچوون، هەردوو خوشك لەسەر پشتی یەك وشتر سواربوون و بەرەو باکوور کەوتنەڕێ، گاورە قوڕەیشیە بێ مروەتە کەم و هیچ و پووچەکان بەشوێنیان کەوتن، (ئەلحوەیرس کوڕی نەقیز کوڕی عەبد کوڕی قوصەی) ئەو پیاوەی کاتی خۆی زۆر ئازارو ئەشکەنجەی پێغەمبەری(درودی خودای لەسەربێت) دابوو، لە وشترەکەی فاتیمەو ئومکەلسوم نزیك کەوتەوە، نێزەیەکی تیژی لێدا، وشترەکە لەتاو ژانی خۆی، خۆی هەڵدا فاتیمەو ئومکەلسومی فڕێدایە سەر زەوی بیابانی ناسازو سەخت، فاتیمە ئەوکاتە لەئاکامی ئابلووقە و ئەو کارەساتە یەك لەدوای یەکانەی بەسەریانداهاتبوو یەکجار لەڕ و لاوازو بێ هێزبوو، هەرچەندە ورە بەرزو خۆڕاگربوو، بەڵام خۆی و ئومکەلسەم ئازارێکی زۆریان پێگەیشت، ئیتر بەدرێژایی ڕێگاکە بەدەم ئازارەوە دەتلانەوە، تەنانەت کاتێ گەیشتنە شاری مەدینە لەبەر ئازارو ئێش و ژانی جەستەیان، قاچەکانیان زەوی نەدەگرت، نەیانتوانی بەپاوە بوەستن، ئیدی سەرجەم موسڵمانان نەفرەتیان لە حوەیرس کرد، چەندین ساڵ بەسەر ئەم تاوانەی حوەیرسدا تێپەڕیبوو، پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) ئەم تاوانەو ئەم ڕەفتارەی لەبیر نەکردبوو، بۆیە لەساڵی هەشتەمی کۆچی کاتێ مەککە ڕزگار کرا، پێغەمبەری سەرکردە لەشکرەکەی ئاگادار کردەوە، کە ئەگەر بێتو لەژێر دیواری کەعبەی پیرۆزیشدابن، دەبێ حوەیرس و چەند کەسێکی تری تاوانبار بکوژرێن، ئیتر لە کۆتاییدا حوەیرس بەدەستی عەلی کوڕی ئەبوتالیب کوژرا.



# ژیانی مەدینە

پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) لەم شوێنەی بۆ یەکەم جار وشترەکەی تێیدا (یخ) بوو، واتە نیشتە خوارەوە، دەستی کرد بە دروستکردنی مزگەوت و خانوو، بەڵام تا ئەو کاتەی خانووەکەی تەواو بوو، لە ماڵی ئەبوئەیوبی ئەنصاری(خودا لێیڕازیبێت) نیشتەجێ بوو، خانووەکەی ئەبوئەیوب پاش ماوەیەك بۆ(ئەفلەحی) خزمەتکاریان مایەوە، بەڵام دوای ئەوەی دیوارەکانی ڕوخاو کاول بوو، ئەلموغەیەرەی کوڕی عەبدولڕەحمانی کوڕی حارس کوڕی هوشام بە هەزار دینار لە ئەفلەحی کڕیەوە، پاش چاکردنەوەی، موغەیەرە خانوەکەی بە هەژاران و بێ نەوایانی شارەکە بەخشی.

پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت)ڕۆژانە خۆی کاری لەبنیاتنانی مزگەوت و خانووەکە دەکرد، بۆیە موسڵمانان بەگشتی کۆچبەران و لایەنگران و یارمەتیدەرانی مەدینە، کاتێ دەیانبینی پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) خۆی کار دەکات، ورەیان بەرز دەبووەوە، هەمیشە لە کێبڕکێدابوون بۆ ئەنجامدانی کارەکانیان، تەنانەت یەکێکیان بەشیعر دەیگوت:

گەر ئێمە دابنیشین و پێغەمبەر کاربکات
ئەوا کارێکی گومڕابوون ئەنجام دەدەین
یەکێکی دیکە وەڵامی دایەوەو گوتی:
ژیان هیچ نیە تەنیا ژیانی دواڕۆژ نەبێت
خودایە لە لایەنگران و کۆچبەران ببوورە

ڕۆژێکیان (عەمماری کوڕی یاسر) چەند خشتێکی زۆر قورسی خستبووە سەرشانی دوای ئەوەی خشتەکانی دانا، پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) بەدەستی پیرۆزی خۆی تۆزی لەسەر شانی عەممار لادەدا، موسڵمانان کاتێ ئەمەیان

بینی عەلی کوڕی ئەبوتالیب بەشیعر گوتی:

چۆن وەکو خەڵکی ترن ئەوانەی مزگەوت دەکەن

هەمیشە لەناویدا دادەنیشن و نوێژ دەکەن

ئەوانەی لاربوونەتەوەو خۆیان تۆزاوی دەکەن

ئیدی مزگەوتەکە تەواو کرابوو، کەچی عەممار ئەم شیعرەیەی هەمیشە لەسەر زاربوو دەیگوتەوە.

خانووی تازەی پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) کۆشك و تەلارێکی زەبەلاح و بەرز نەبوو، بەڵکو بریتیبوو لە چەند ژورێکی سادەو ساکار، لەتەنیشت مزگەوتەکەوەبوو، هەندێ ژوور لەبەرد و هەندێکی تر لە قوڕو گەڵای خورما دروستکرابوو، سەرجەم ژوورەکان سەریان بە گەڵای خورما داپۆشراوبوو، بەرزی ژوورەکان هەروەکو حەسەنی کوڕی عەلی نەوەی پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) واتە کوڕی فاتیمە باس دەکات و دەڵێ: من گەنجێکی تازە پێگەیشتووبووم کاتێ دەچوومە ماڵی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێت)، دەستم دەگەیشتە بن میچی بانەکە، هەروەها لە کتێبە ڕاست و دروستەکانی (ئیمام بوخاری - ڕەحمەتی خودای لێبێت) هاتووە، کە دەرگای ماڵی پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت)بەنینۆکەکانی دەست لێدەدرا،کەواتە دیارە دەرگای سەرەکی خانووەکە ئەڵقەیەکی نەبووە بۆ لێدانی دەرگا، ماڵی پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) لە هەموو ماڵەکانی مەدینە ساکارترو نەدارترو بێ کەلوپەلتر بوو، چوارپایەی نووستنی بریتیبوو لە چەند شەپکە دارێك بە تەنافێك لەیەك بەستراو و گرێدرابوون.

ئیتر فاتیمە کاتێ هاتە مەدینە چووە ناو ئەم خانووە ساکارو سادەیە، بەڵام پێش ئەوەی ئەو کۆچ بکات، باوکی لەو پەڕی هێزو توانادابوو، موسڵمانە کۆچبەرەکان کەتبوونە ژیانێکی ئاسوودەی پڕ لەسەرەوتن و ئارامیەوە، چۆن پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) برایەتی خستبووە نێوان لایەنگرانی خەڵکی

مەدینەو کۆچبەرانەوە، هەمووی کردبووە برای یەکتری، بۆیە کۆچبەران هەستیان بە نامۆیی‌و تەنیایی نەدەکرد، ڕەنگە فاتیمە ئەم کارەی بەلاوە سەیر بوایە، ئەگەر ئامادەبوایە کاتێ باوکی(درودی خودای لەسەربێت) لەناو یاوەرانی وەستابوو فەرمووی:

هەر دوو کەس لە پێناوی خودادا ببن بە برای یەکتری، پاشان دەستی عەلی گرت فەرمووی:

ئەوە برای منە، جەعفەری ئامۆزای هەرچەندە هێشتا لە حەبەشەبوو نەهاتبووەوە کردیە برای مەعازی کوڕی جەبەل، خاریجە کوڕی زوهەیر ئەلخەزرەجی کردە برای ئەبوبەکری صەدیق، عوتبانی کوڕی مالیکی ئەلعەوفی کردە برای عومەری کوڕی خەتاب، سەعیدی کوڕی مەعازی کردە برای ئەبوعوبەیدەی کوڕی ئەلجەڕاح، ئەوسی کوڕی سابتی بەنی نەجاڕی کردە برای عوسمانی کوڕی عەفان، سەلەمەی کوڕی سەلامەی کردە برای زوبەیری کوڕی عەوام، بەمجۆرە هەر یەکێك لە کۆچبەران بووە برای یەکێك لە لایەنگرانی خەڵکی مەدینە، ئیتر عەلی کوڕی ئەبوتالیب بووە برای مەزنترین و شکۆدارترین ئادەمیزاد، ئەوەندەی نەخایاند عەلی بوو بەزاوای برا پێغەمبەرەکەی‌بووە هاوسەری خۆشەویسترین کچی.

## هاوسەرگیری فاتیمەو عەلی

فاتیمە کاتێ کۆچی کرد بۆ شاری مەدینە، تەمەنی گەیشتبووە هەژدە ساڵ، هەرگیز بیری لە شووکردن نەدەکردەوە، چونکە ئەم ڕۆژەی لەیاد نەکردبوو کاتێ تەمەنی چوار ساڵان بوو زەینەبی خوشکیان گواستەوە بۆ ماڵی ئەبولعاصی کوڕی ئەلڕەبیع، کاریگەری شووکردنی ئەم خوشکە خۆشەویستەی هێشتا لەسەرمابوو، بەڵام بێگومان ساڵ لەدوای ساڵ گەورەتر دەبوو، وێڕای ئەمەش تێگەیشتنی بۆ ژیانی

هاوسەرگیری فراوانتر دەبوو، بۆیە وەك ژنێکی ئاسایی هاوسەرگیری بەلایەوە بووە کارێکی سروشتی، چونکە سەیری کرد حەوا، خەدیجە، زەینەب، ڕوقییە، ئومکەلسوم هەموویان شوویان کردووە، ئیتر بۆ ئەویش کارێکی سروشتیەو دەبێ ڕۆژێك خوازبێنی بێت و شووبکات.

ئیتر لەسەرەتای چوونی بۆ خانووی تازەی مەدینە، فاتیمە هەستی دەکرد ئامۆزایان عەلی کوڕی ئەبوتالیب نهێنییێك لە دڵیدا خۆی مەڵاس داوە، چەند وشەیەك لە سەری زمانیدا ڕیزبەندبووە، بەڵام شەرم بواری نادات لای باوکی(دروودی خودای لەسەربێت) بیاندرکێنێت و لە لێوەکانی دەربچن، بۆیە خواست و وشەکانی بەشاراوەیی و بێ دەربڕین دەمایەوە، فاتیمە ئەم نهێنیەی دڵی عەلی دەزانی و لای شاراوەنەبوو، دەیزانی عەلی چاوی بڕیوەتە ئەو، ڕەنگە نیازی خواستنی ئەوی هەبێت و لەو بەملاوە بەکچێکی دیکە قایل نەبێت.

هەروەها فاتیمە لە خودی خۆیدا هەستی دەکرد عەلی نزیکترین کەسیەتی، گەنجێکی زۆر ڕێزدارو شکۆدارە، لە براێکی ئازیز و ئامۆزاێکی نزیك زیاترە، لەناو گەنجەکانی قوڕەیشدا، کەسێك وەك ئەو ئازاو زیرەك و ورەبەرزنییە، لەناو سەرجەم لاوانی موسڵمانان کەسێك نیە پێش ئەو موسڵمان بووبێت، لە ڕووی خزمایەتیەوە عەلی نزیکترین کەسە لە پێغەمبەر(دروودی خودای لەسەربێت)، بەڵام سەرەڕای هەموو ئەوەش فاتیمە هەرگیز نەیدەویست شووبکات، بەڵکو حەزی دەکرد لەسایەی باوکیدا بژیت و ئەم شوێن و جێگاو ڕێگایەی لەم ماڵە شکۆدارە هەیەتی لە دەستی نەدات، چونکە لەو ڕۆژەی خەدیجەی دایکی(خودا لێیڕازیبێت) کۆچی دوایی کرد، فاتیمە بووە جێگری ئەو، خەریکی ماڵداری کردن بوو، باری قورسی ئەوماڵە مەزنەی گرتە ئەستۆی خۆی، هەمیشە هەوڵیدەدا ژیانێکی ئاسوودەو پڕ لە ئۆقرەو ئارامی بۆ باوکی دابین بکات، لەم بوارە ئەوەندە سەرکەوتوو بوو، تەنانەت نازناوی (دایکی باوکی) بەدەست هێنابوو، بۆیە نەیدەویست ئەم جێگایە شکۆدارە بە

شوێنێکی دیکە بگۆڕێتەوە.

بەڵام تاکەی؟.

ڕەنگە بۆ ماوەیەکی کەم ئەم بیرکردنەوەیەی بەمێشکدا تێپەڕبووبێت، چۆن نەیویستووە ئەم ژیانە بە دواڕۆژێکی نادیارو شاراوە بگۆڕێتەوە، بەڵام دوایی ئەم بیرو بۆچوونەی گۆڕا، بەتایبەتی دوای ئەوەی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێت) عائیشەی کچی ئەبوبەکری( خودا لە خۆی و باوکی ڕازیبێت) کردە هاوسەری خۆی و کایبانووی ماڵەکەیان، لەمە بەدواوە فاتیمە هەستی کرد ئیتر کاتی ئەوە هاتووە دەبێ ماڵەکە جێبهێڵێت بۆ خاوەنە گەنج و جوان و زیرەکەکەی.

پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت)چەند مانگێك دوای کۆچکردن عائیشەی گواستەوە، فاتیمە بەم هاوسەرگیریە زۆر نیگەران و خەفەتباربوو، دایکی بیرکەوتەوەو هەستی دەکرد ئەم ژنە هاتۆتە شوێنی دایکی، بۆیە لە ڕۆژی گواستەوەکەدا زۆر گریا، بەڵام دەیزانی خەدیجە کەلێنێکی گەورەو خەفەتێکی زۆری بۆباوکی جێهێشتووە، ئیتر دوایی هەستی دەکرد باوکی بەم هاوسەرگیریە فەرامۆشیو خەفەتی پێنج ساڵەی دابڕانی خەدیجەی لە دڵ و دەروونیدا کەم بووەتەوە، تەنانەت ئەم کەلێنەی کەوتبووە ناو ژیانی باوکیەوە، لەدوای مردنی دایکی بەم هاوسەرگیریە پڕبۆتەوە.

ئەم هاوسەرگیریەی باوکی زەهرا(درودی خودای لەسەربێت) لەگەڵ عائیشەخاندا(خودا لێیڕازیبێت) ڕووداوێك و کارێکی کتوپڕو لەناکاو نەبوو، تا ببێتە مایەی سەرنج ڕاکێشانی فاتیمەو هۆزەکەی، بەڵکو باوکی(درودی خودای لەسەربێت) هێشتا لە شاری مەککەبوو، واتە پێش کۆچکردنیان بۆ مەدینە خوازبێنی کردبوو، کاتێ لە مەککەبوو ڕۆژێك(خەولەی کچی حەکیم ـ خودا لێیڕازیبێت) چووەلای، زۆر بە هێمنی و بەسۆزەوە پێیگوت:

ئەی پێغەمبەری خودا(درودی خودای لەسەربێت)، پێموایە دابڕانی

خەدیجەخان(خـودا لێیڕازیبێـت) کاریگـەری کردۆتـە سـەرتۆ، ئـیتر ئـەو ژنـە زۆر هەوڵیدا، تەنانـەت لـە ئەنجامدا پێغەمبـەر (درودی خـودای لەسـەربێت) قایلبوو ژن بێنێتـەوە، ڕێگـای بـە خەولـەدا بـچێت (سـەودەی کـچی زەمعـەو عائیـشەی کـچی ئەبوبەکری ـ خودا لێیانڕازیبێت) بۆ خوازبێنی بکات.

فاتیمـە دەیزانـی بـاوکی(درودی خـودای لەسـەربێت) لەلایـەك بـارێکی قورسـی بڵاوکردنەوەو گەیاندنی پەیامی پیرۆزی ئیسلامی کەوتۆتە سەرشان، لە لایێکی دیکە چەوسانەوەو ئەشکەنجەدانی لەلایەن کەسوکاریەوە وێڕای دەردی نـامۆیی و دووری و دابڕانی لە ئیشتمان کاریگەری زۆریان کردۆتەسەر، بۆیە هـەرگیز پێیناخۆش نـەبوو بـاوکی لـە پـاڵ ژنێکـدا گـوزەران بکـات، بـەڵکو دڵـی نـەختێ ئۆقرەبگرێـت وئـارام بێتەوە،هەروەها یارمـەتی بدات و لەمیانـەی ئەمـەوە پـەژارەو دەردو مەینەتیـەکانی کەم بکاتەوە.

(ئەلسەکران کوڕی عەمر ـ خودا لێیڕازیبێت) هاوسەری سەودە کۆچی کردبوو بۆ وڵاتی حەبەشە، لەوێ کۆچی دوایی کرد، ئەم ژنە داماو و بێ کەسەی بەتەنیا لەپاش جێما، سـەودە ژنێکی پیرو بەساڵاچووبوو، سـەرەڕای ئەمـەش کارەسات و مەینـەتی ژیان کاریگەری زۆری کردبووە سەری، بەرداشی ئەم چەند ساڵەی دوایی بـەجۆرێکی ئـەوتۆ هـاڕیبووی، هێـزی تێیـدا نەهێـشتبوو، ئـیتر پێغەمبــەر(درودی خــودای لەسەربێت) بەزەیی بەسەودە هاتەوە ئەم پاداشتە بەهادارو مەزنـەی پێبەخشی، کاتێ کردیـە هاوسـەری خـۆی، ئـەگینا لەبـەر خۆشەویـستی و مەبەسـتی تێکـەڵاوبوون نـەیهێنابوو، بۆیـە هەرچـەندە سـەودەخان پـێش عائیـشەخان گواسـترایەوە، فاتیمـە دەیزانـی پێغەمبـەر(درودی خـودای لەسـەربێت) بەناچـاری ئـەم ژنـەی مـارەکردوەو کردوویەتیـە هاوسـەری خۆی،هەسـتی دەکـرد بۆشـایێك و کـەلێنێك لـە ژیـانی هاوسەرێتی باوکیـدا مـاوە، چـونکە لـەدوای گواستنـەوەی سـەودە، هـیچ گۆڕانکارییێك لەژیانی باوکیدا بەدی نەدەکرا، بۆیە هاتنی سەودەخان بۆ ئەم ماڵە کاریگەری لەسەر

ڕێوشوێنی فاتیمە نەبوو، بەڵکو هێشتا دایکی باوکی بوو هەستی بە بوونی سەودە نەدەکرد.

بەڵام کاتێ عائیشەخان گواسترایەوە بۆ ماڵەکەیان، فاتیمە هەستی کرد گوزەرانەکەیان گۆڕاوەو جیاوازی هەیە لەگەڵ پێشوو، بۆیە هیچ سەیرنیە ئەگەر بڵێین تەنیا چوار مانگ دوای گواستنەوەی عائیشەخان فاتیمە بەڕێکرا بۆ ماڵی عەلی کوڕی ئەبوتالیب.

عەلی(خودا لێیرازیبێت) هەمیشە چاوەڕوانی ڕەخساندنی هەلێك بوو، بەڵکو بتوانێت تێیدا داوای فاتیمە بکات، دڵی کچە قایل بکات و بیگوازێتەوە بۆ ماڵی هاوسەرگیری، ئیتر عەلی چەند ساڵ بوو چاوەڕوانی ئەم هەلەو ئەم دەرفەتەی دەکرد، تەنانەت پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) هاوسەرگیری لەگەڵ عائیشەخان پێکهێنا، عەلی بیری لە بەدیهێنانی ئاواتەکەی کردەوە. بەڵام بۆ ماوەیەك دوای خست و بێدەنگبوو، بەڵکو بتوانێت سامانێك و بڕێك پارەو پوول کۆبکاتەوە تا بیکاتە مارەیی فاتیمە.

ئەبوبەکرو عومەر(خودا لێیانڕازیبێت) داوای فاتیمەیان کرد بۆ خۆیان، بەڵام باوکی (درودی خودای لەسەربێت) زۆر بە هێمنانە داواکەی ڕەتکردنەوە، ئیتر عەلی بەردەوام بوو لە چاوەڕوانیەکەی، تەنانەت چەندین دۆست و هاوەڵی هەستیان کرد حەزدەکات فاتیمە بخوازێت، هانیاندا بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە، پێیانگوت:

تۆ خزمێکی نزیکی باوکی فاتیمەی، تۆی خۆشدەوێت، ئەبوتالیبی باوکت و فاتیمەی کچی ئەسەدی کوڕی هاشمی کوڕی عەبدولمەنافی دایکت خۆشەویستیێك و ڕێزێکی تایبەتیان هەبوو لای ئەو، چۆن فاتیمەی دایکت یەکەم ژنی هاشمی بوو ئەوەی بۆ هاشمیەکان نایەوە.

عەلی بەنائومێدیەوە گوتی:

دوای ئەبوبەکرو عومەر؟.



گوتیان:

بۆ نا، با دوای ئەوانیشەوە بێت، بەخودا لەناو سەرجەم موسڵماناندا وێڕای ئەبوبەکرو عومەریش، کەس نیە وەك تۆ لە پێغەمبەری خودا(درودی خودای لەسەربێت) ئەوەندە نزیك بێت، باوکت بەخێوی کردووە، دایکت چاودێری کردووە، هەروەها تۆ لەماڵی ئەو(درودی خودای لەسەربێت) گەشەتکردووەو پەروەردەبوویتو بەخێوکراویت، یەکەم منداڵبووی کاتێ موسڵمانبوویت، عەلی(خودا لێیڕازیبێت) بەبیستنی ئەم قسانە ورەی بەرزبووەوە، ملی ڕێگای گرتەبەر بۆلای ئامۆزاکەی چوو، تەنانەت گەیشتەلای باوکی فاتیمە سلاوی کردو زۆر بەشەرمەوە لەنزیك ئەوەوە دانیشت، نەیتوانی نیازو ڕازی دڵی خۆی بدرکێنێت.

پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) کاتێ چاوی بە عەلی یاوەرو براو ئامۆزای کەوت، زانی کارێکی تایبەتی هەیە، بەڵام ناتوانێت لای ئەو باسی بکات، بۆیە بە ڕوویێکی گەش و لەسەرخۆ فەرمووی:

کوڕی ئەبوتالیب چ داواکارییێکت هەیە؟.

عەلی بە دەنگێکی کزو لاواز، لە شەرمان چاوەکانی داخستبوو، گوتی:

دەڵێم فاتیمەی کچی پێغەمبەری خودا(درودی خودای لەسەربێت)......، ئیتر شەرم بواری پێنەدا لەمە زیاتر بڵێت.

پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) بە ڕوویێکی گەشتر فەرمووی:

بەخێر بێیت.

دوای ئەوە بێدەنگبوو. ئەم بێدەنگیە زۆری خایاند، دوای ئەوە عەلی بە دوودڵی و پەشۆکاویەوە ڕۆیشت، چونکە نەیدەزانی چۆن وەڵامی دۆست و برادەرو کەسوکاری بداتەوە، کەوا چاوەڕانی ئەنجامی خوازبێنیەکەی دەکەن، دەیانەوێ بزانن پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێت) چی وەڵام داوەتەوە، ئیتر کاتێ گەیشتەوە لایان گوتیان چی بوو:

عەلی گوتی:

بەخودای من هیچ نازانم، داواکاریەکەم بە پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) گەیاند، فەرمووی بەخێربێت، ئیتر لەمەزیاتر هیچی تری پێ نەگوتم!.

ئامادەبوان هەموویان گوتیان:

یەك وشەی پێغەمبەرت (درودی خودای لەسەربێت) بەسە.

ئیتر ئەوان ڕۆیشتن، عەلی(خودالێیڕازیبێت) خۆی و دڵێکی پڕ لە هیواو تاسەو ئاوات مایەوە.

ڕۆژی دواتر عەلی هات لە شوێنێکی نزیك پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) وەستا و گوتی:

ویستم خوازبێنی کچی پێغەمبەری خودا بکەم، بەڵام پێموابوو هیچم بۆ نابێت و هیچم بۆ ناکرێت، دوایی پەیوەندی خزمایەتیم بیرکەوتەوە بۆیە هاتمەلای و خوازبێنیم کرد.

سەیری کرد بینی پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) یەکسەر ئاوڕیدایەوە، فەرمووی:

ئایا هیچت هەیە؟.

عەلی لە وەڵامدا گوتی:

نەخێر ئەی پێغەمبەری خودا(درودی خودای لەسەربێت) هیچم نیە.

بەڵام پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) بیری کەوتەوە، عەلی زرێیەکی(قەلغانێکی) لە شەڕی بەدر دەست کەوتبوو، بۆیە فەرمووی:

ئەی ئەو زرێیەی ئەو ڕۆژە دامەتۆ کوا لە کوێیە؟.

عەلی لە وەڵامدا کاریگەری چاکەکانی پێغەمبەری(درودی خودای لەسەربێت) پێوە دیاربوو گوتی:

ئەی پێغەمبەری خودا(درودی خودای لەسەربێت) ئەوە ماوە و لەلامە.



فەرمووی:

زرێیەکە بدە بووکەکەت.

عەلی(خودا لێیڕازیبێت) لە خۆشیا خێرا چوو زرێیەکەی هێنا و هاتەوە، پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) فەرمووی:

ئەم زرێیە بفرۆشە، پارەکەی بکە جیازی بووکەکەت.

عوسمانی کوڕی عەففان(خودا لێیڕازیبێت) زرێکەی بە چوارسەدو حەفتا درهەم لە عەلی کڕیەوە، عەلی پارەکەی بردە بەردەم پێغەمبەر، ئەمیش (درودی خودای لەسەربێت)، بەدەستی پیرۆزی خۆی پارەکەی دایە دەست (بیلال ـ خودا لێیڕازیبێت) تا بڕێك بۆن و بەرام بکڕێت، ئەوەی تریش بداتە(ئوم سەلەمە ـ خودا لێیڕازیبێت) بۆ ئەوەی جیازی بووکەکەی پێ ئامادەبکات و ڕێکبخات.

پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) بەپێی ئایینی پیرۆزی ئیسلام، بانگی یاوەرانی خۆی کرد بۆ گەواهیدان لەسەر هاوسەرگیری فاتیمەی کچی لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبوتالیب، مارەییەکەی بریتیبوو لە چوار سەد میسقال زیو، ئیتر خوازبێنیەکە بە پیرۆزبایی کردنی زاواو بووکی هاشمیەکان کۆتایی هات، داواکاربوون خودای گەورە ئەوەی چاك و سوودبەخشیان پێ ببەخشێت، هەروەها هەندێ خورما پێشکەش بە ئامادەبووان کرا.

ئابەم شێوە ساکارو سادەیە خوازبێنی فاتیمە گوڵ کرا بۆ عەلی، کە گرنگترین گرێبەستی هاوسەرێتی بوو لە مێژووی ئیسلامدا.

# گواستنەوە

مـارەکردنی فاتیمـە لـە مـانگی ڕەجەبـدا بـوو، بـەڵام ئاهـەنگی گواسـتنەوەکەی لەساڵی دووەمی کۆچی دوای جەنگی بەدربوو، عەلی(خودا لێیڕازیبێت) لـەم ماوەیـەدا توانی خانووێك بـەکرێ بگرێـت، ماڵێك پێکبهێنێت و ڕێکبخـات، تـا خـۆی و فاتیمـە گوڵی هاوسەری گوزەران و ژیانی تێدا بەسەربەرن.

بنەماڵەی عەبدولموتـەلیب، ئاهـەنگێکی قەشـەنگیان لـە ڕۆژی بـووك گواسـتەوەدا سـازکرد، حـەمزەی کـوڕی عەبدولموتـەلیب مـامی پێغەمبـەر(درودی خـودای لەسەربێت)و عەلی هەریەکەو وشترێکی گەورەیان کوشتەوە، خەڵکێکی زۆر لەسـەر خـوانی خانـەوادەی عەبدولموتـەلیب چێـشت و نانیـان خـوارد، دوای تـەواوبوونی ئاهەنگەکـەو پیرۆزبـایی کـردن و ڕۆیـشتنی خەڵکەکـە، پێغەمبـەر(درودی خـودای لەسەربێت) بـانگی (ئـوم سـەلەمە)ی کـرد، داوای لێکـرد بووکەکە بباتـە مـاڵی عـەلی، لەوێ یاوەری بووك بێت و چاوەڕوان بێت تا عەلی دەچێتەوە ماڵەوە.

شـەوداهات (بـیلال - خـودا لێیڕازیبێـت) بانگیـدا بـۆ نوێـژی(عیـشا)، پێغەمبەر(درودی خودای لەسـەربێت) دوای ئـەوەی پێشنوێژی بـۆ موسـڵمانان کـرد، بەرەو ماڵی عەلی چوو، لـەوێ داوای نـەختێك ئـاوی کـرد، چـەند ئایـەتێکی قورئـانی پـیرۆزی لەسـەر ئاوەکـە خوێنـد، ئینجـا ئاوەکـەی دایـە بـووك و زاوا ئـەوانیش خواردیانەوە، ئەو بـڕە ئـاوەی مایـەوە بەسـەر سـەری بـووك و زاوادا پرژانـدی، پێش ئەوەی بڕوات فەرمووی:

خودایـە(بەرەکـەتیان)تێبخـەیت،(بەرەکـەتیان)بخەیتـە سـەر،(بەرەکـەت)بخەیتـە نەوەکانیان.

فاتیمە سەیری باوکی کرد خۆی بۆ نەگیرا قوڵپی گریانی سەری کـردو فرمێسك لە چاوەکانیدا هاتە خوارەوە، باوکی(درودی خودای لەسەربێت) نەختێك بێدەنگبوو،

دوایی بەسۆزەوە دڵنەوایی کرد، فەرمووی لەلای بەهێزترین خاوەن باوەڕ و زاناترین کەس و خاوەن بەرزترین خو و ڕەوشت و کەسایەتی دامناویت و جێتدەهێڵم.

ئینجا پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) لە ماڵی عەلی هاتەدەرو ڕۆیشت، بەڵام وێناو تارمایی خەدیجە بە درێژایی شەوی پەردەی بووکێنی لە پێش چاوەکانی فاتیمە وون نەبوو، بۆیە تۆزێك دەردی دووری و دابڕانی لە باوکی کەم کردبووەوە.

بێگومان خودای مەزن و باڵادەست داواو پاڕانەوەی پێغەمبەری خۆشەویستی (درودی خودای لەسەربێت) هێنایەدی، بەرەکەت کەوتە ناو هاوسەرێتی عەلی و فاتیمە، نەوەکان و وەچەکانی پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) تەنیا لە فاتیمە کەوتەوە.

## چەند ڕاو سەرنجێك دەربارەی تەمەنی فاتیمە

فاتیمە کاتێ شووی کرد تەمەنی هەژدە ساڵ بوو، بەڵام (لامانس)ی ڕۆژهەڵاتناس بە ئەندێشەو بیرۆکەی خۆی پێیوایە تەمەنی زۆر لەمە زیاترو گەرەتربووە، چونکە پێیوایە هەندێ لە نووسەرانی ژیاننامە بۆیە تەمەنی بچووك دەکەنەوە، تا خەڵك نەڵێن دیارە فاتیمە تەمەنی گەنجیەتی تێپەڕیبوو ئیتر ئارەزووی شووکردنی نەمابوو.

ئەگەر بێت و پرسیار بکەین و بڵێین:

ئایا نووسەرانی ژیاننامە بۆچی دەستکاری تەمەنی خەدیجەو عائیشەیان نەکرد؟، بۆ تەمەنی خەدیجەیان بچووکتر نەکردەوە؟، یان بۆچی تەمەنی عائیشەیان دەساڵ بگرە بیست ساڵ گەورەتر نەکرد، تەنانەت تەمەنیان لەگەڵ تەمەنی هاوسەرەکەیان گونجاوترو لە بارتر بێت؟.

لە وەڵامدا دەڵێین: ڕەنگە ئەگەر ئەم پرسیارە ئاراستەی (لامانس) بکەین،



سەرسامبێت و وەڵامەکەی لانەبێت.

بەڵام پێموایە(لامانس) لەم بۆچوونەی پەنای بردووەتە بەر ئەم بڕە جیاوازیە کەمەی لە مێژووی لەدایکبوونی فاتیمەدا هەیە، ئیتر جیاوازیەکەی کردووەتە بیانوویەك بۆ شکاندنی تامەزرۆیی خۆی لەم بوارەدا، بەڵام دەبوایە ئەم پیاوە ڕۆژهەڵاتناسە سەرجەم سەرچاوە جیاجیاکانی مێژووی بە پێوەرو بەچاوی ڕەخنە هەڵبسەنگاندبوایە، ئینجا بڕیاری کۆتایی خۆی سەبارەت بەتەمەنی فاتیمە بدرکاندبوایە، چونکە پەنجەی خۆی خستۆتەسەر بۆچوونی (ئەلمەسعودی) سەبارەت بە مێژووی لەدایکبوونی فاتیمە، چۆن دەڵێ: فاتیمە هەشت ساڵ پێش کۆچکردن لە دایکبووە، هەروەها (ئەلیەعقوبی) دەڵێ: فاتیمە دوای دابەزینی سروش(وەحی) لە دایکبووە، دیارە لامانس یەکێك لەم دوو بۆچوونانەی وەرگرتووە، بێ ئەوەی بایەخ بەزۆربەی بۆچوونەکانی دیکە بدات، هەرچەندە بۆچوونەکانی تری وەك (ئیبن ئیسحاق و ئیبن سەعید و ئەلتەبەری و ئیبن عەبدولبیڕ) لەم بوارەدا زیاتر جێگای باوەڕ و متمانەن و پتر پشتیان پێوە دەبەسترێت، ئەم مێژوونووسانە هەموویان کۆکن و هاودەنگن کە فاتیمە پێنج ساڵ پێش هاتنی وەحی لە دایکبووە، ئیتر هەرچۆنی بێت جیاوازیەکە زۆر کەمە، چونکە مێژوو لە ڕۆژگاری ڕابردوودا هەمیشە بەدەم گوتراوەتەوەو زارەکی گواستراوەتەوە، بۆیە ئێمە لەوەڕاهاتووین ئەگەر جۆرە جیاوازیێکی کەم یان زیاد هەبێت، بگرە بەلامانەوە کارێکی زۆر ئاساییە.

جگە لەمەی ڕابردوو، دەبینین هەمیشە جیاوازی لە ژیاننامەی کەسێك ڕوودەدات، بەتایبەتی سەبارەت بەڕۆژی لەدایکبوونی، چونکە لەسەرەتای ژیانیدا بایەخ بە کەسەکە نەدراوە تەنانەت کەسایەتیەکەی دەرکەوتووەو شایان بەمە بووە گرنگی و بایەخی پێبدرێت ئینجا مێژوونووسان کەوتوونەتە خۆیان، بۆیە دەبوایە لامانس ئاگاداری ئەم دیاردە گشتیە بوایەو بەهەندی هەڵگرتبایە، نەك لە قوژبنێکی تەسکدا سەیری بابەتەکە بکات، لەکەداری بکات و بە نارێکی بینووسێتەوە.

وێڕای هەموو ئەمانەی سەرەوە، لامانس کەسێکی ناشارەزا نیە لەم بوارەدا، دەبوایە کاتێ بینی بۆچوون و ڕای جیاجیا لەسەر بابەتێك هەیە، ئەوا ئەو کاتە پێویستە هەموو بیرو بۆچوونەکان بێنە ورووژاندن و باسیان بکرێت، نابێ هەندێکیان پشت گوێ بخرێن، ئەگەر لامانس مەبەستی تایبەتی خۆی نەبووبێت، دەبوایە هەرگیز نووسەری بەناوبانگ ئیبن ئیسحاق پشتگوێ نەخات، چونکە لە هەموو نووسەرەکان نزیکتربووە لەسەردەمی پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) و کچەکانی، ئیبن ئیسحاق زۆر بەکورتی دەڵێ: فاتیمە لەساڵی پێنجەمی پێش بەپێغەمبەربوونی باوکی(درودی خودای لەسەربێت) لە دایکبووە، لامانس وێڕای ئەم ڕاو بۆچوونەی ئیبن ئیسحاق ڕاو بۆچوونی چەندین زاناو یاوەرو نووسەرانی خاوەن متمانەی پشتگوێ خستووە، تەنها ڕاو بۆچوونی(مەسعود)ی بە پەسند زانیوە، بەڵکو لەمیانەیەوە بتوانێت مەبەستەکەی خۆی بپێکێت، کە دەڵێ: بۆیە لەدایکبوونی فاتیمە دوادەخەن و تەمەنی بچووك دەکەنەوە، بەڵکو پیری و داماوی و کەوتنەوەی لەماڵی باوکی لەسەر لابدەن، بەڵام سەیرە لامانس بەپێی بۆچوونی (ئەلیەعقوبی) سەر لەخۆی دەشێوێنێت و دەڵێ: فاتیمە دوای بە پێغەمبەربوونی باوکی لە دایکبووە!.

بەمجۆرە هەندێ ڕۆژهەڵاتناس بەوپەڕی دەمارگیری و ڕقەوە هەوڵدەدەن تەنیا تاکە وشەیەك بەدەست بێنن، بۆ ئەوەی ببێتە بەڵگەو بیانوویێك بۆیان، بەڵکو بتوانن لەمیانەیەوە ڕاستیەکان بگۆڕن و بشێوێنن، ئیتر دەبینین چۆن بەپێی بەرژەوەند و مەبەست و ئارەزووی خۆیان درەنگ شووکردنی فاتیمە دەووروژێنن، ڕاستە ئەگەر بەراووردێك بکەین لە نێوان تەمەنی هەژدەساڵی فاتیمەو تەمەنی خوشکەکانی کاتێ شوویان کرد دەڵێین تەمەنی زۆر بووە، یان ئەگەر بەراوورد بکەین لەگەڵ تەمەنی عائیشەی کچی ئەبووبەکر (خودا لێیان ڕازیبێت) دەبینین فاتیمە درەنگ شووی کردوە، بەڵام ئەوەی ڕاستی بێت ئەم دواکەوتنە بە ئارەزووی خۆی نەبووە، بەڵکو لەبەر ئەوەی کچی پێغەمبەر بووە، جوانترین کچی بوو لە هەموویان زیاتر شێوەی



لە باوکی دەکرد، دەبوایە زووتر شووبکات وەکو خوشکەکانی تری زەینەب و ڕوقییەو نومکەلسوم، چۆن ئەوان لەسەرەتای گەنجیەتیدا گەنجانی قوڕەیش پێشبڕکێیان دەکرد لەسەر خوازبێنیان، بەڵام خەڵك دەیانزانی فاتیمە دەیەوێت لە دوای کۆچکردنی دایکی چاودێری باوکی بکات و ببێتە دایکی باوکی، ئیتر خەڵك ڕێزیان لەم بۆچوونەی دەگرت و خوازبێنیان نەدەکرد.

سەرەڕای هەموو ئەوەی ڕابردوو، گرنگترین هۆکاری دواخستنی شووکردنی فاتیمە دەگەڕێتەوە بۆ پلەو پایەو شوێن و جێگاو ڕێگای ئەم کچە لەناو کۆمەڵگادا، چونکە کاتێ باوکی بوو بە پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت)، هەرسێ خوشکەکەی شوویان کردبوو، تەنیا ئەو نەبێت ئەو کاتە تەمەنی پێنج ساڵ بوو، ئیتر دوای ئەم کاتە خەڵك دابەشبوون بۆ دوو چین، چینی گاوران بێگومان ئەم چینە بۆیان نەبوو خوازبێنی کچی پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) بکەن، بگرە بۆیان نەبوو تەنانەت بیر لەم خوازبێنیە بکەنەوە، جگە لەمە لەلاپەڕەکانی ڕابردوودا ئامازەمان بۆ بەسەرهاتی سێ کچەکانی دیکە کرد، چۆن قوڕەیشیەکان هاوسەرەکانیان هاندا تا دەست بەرداریان بن، بەڵکو باوکیان پێیانەوە سەرقاڵ بێت، چینەکەی دیکە چینی موسڵمانان بوو، هەمیشە ئامادەبوون خۆیان بەخت بکەن لەپێناو باوکی فاتیمەدا، بۆیە بەسەیری مەزانن زۆربەیان خۆیان بە شیاو و گونجاو نەدەزانی ببنە هاوسەری کچی پێغەمبەرەکەیان، هەروەها بەچاوی پڕ لە ڕێزو شکۆدارییەوە سەیری(دایکی باوکیان) دەکرد، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێت بڵێین ئەی بۆچی عوسمانی کوڕی عەففان شیاو بوو بۆ ڕوقییە، چونکە پێویستە ئەوە بزانین عوسمان لەناو سەرجەم یاوەرانی موسڵماندا، بگرە لەناو سەرجەم قوڕەیشدا شکۆدارترین و دەوڵەمەندترین و هەڵکەوتوترین کەسایەتی بوو، وێڕای ئەمەش ڕوقییە، کە کوڕی ئەبولەهەب دەستی لێی بەردابوو، کەواتە باردو دۆخی فاتیمە لەگەڵ خوشکەکانی تری جیاوازبوو.

تەنانەت ئەمڕۆ لەم سەردەمەدا دەبینین کچانی خانەوادە دیارو بەناوبانگەکان

زۆربەیان شوو کردنیان دوادەکەوێت یان شووناکەن، چونکە چاوەڕوانی یەکێکی هاوشان و لە ئاستی خۆیان دەکەن، ئەمجۆرە گەنجانەش هەمیشە دەگمەنن، بگرە ئەم نەریتە بووەتە ڕێسایەك و بنەمایەك، چۆن ئەگەر کچێك لەڕووی زانستی، یان دەوڵەمەندی، یان ڕەچەڵەك باڵاتربێت لە کچانی دیکە، ئەوا پیاوی شیاوی لەئاستی خۆی بەدەگمەن بۆ دەرەخسێت. ئەمە لە لایەك، لە لایەکی دیکە دەبینین عەلی یەکەم کەس نەبووە بەهیوای خواستنی فاتیمە بووبێت، بەڵکو هەردوو یاوەرانی پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) ئەبوبەکرو عومەر(خودا لێیانڕازیبێت) هەوڵیانداوە بۆ ئەم شکۆمەندیە هەروەکو(البلاذری . لە کتێبی ئەنسابولئەشراف)دا،(سەعد . لەکتێبی تەبەقات)دا،(نەسائی . لەسوننەنەکەیدا) باسیان کردوەو دەڵێن:

باوکی فاتیمە (درودی خودای لەسەربێت) بەشێوەیەکی زۆر جوان هەردوو داخوازیەکانی ئەم دوو یاوەرە ڕێزدارانەی ڕەت کردووەتەوە.

دوای هەموو ئەو زانیاریانەی ڕابردوو، لامانسی ڕۆژهەڵاتناس پێیوایەو دەڵێ فاتیمە بۆیە درەنگ شووی کردووە، چونکە بێ بەش بووە لە جوانی و زیرەکی و حەزو ئارەزوو.

# ژیانی هاوسەرگیری

فاتیمە لە ژیانی نوێیدا بەهۆی هەژاری و نەداریەوە، ئاسوودەو کامەران نەبوو، وەکو خوشکەکانی نەبوو تا گوزەرانێکی خۆش و فەراهەم بەسەربەرێت، چۆن ئەبولعاسی هاوسەری زەینەبی خوشکی، یەکێبوو لە دەوڵەمەندە دیارو ناسراوەکانی شاری مەککە، هەروەها ڕوقیەو ئومکەلسوم، کاتێ لەیەکەم ژیانی هاوسەرگیریاندا چوونە ماڵی ئەبولەهەب، ماڵێکی دەوڵەمەندو خاوەن سامانێکی زۆربوون، لەدوای

کوڕەکانی ئەبولەهەبیش بەدوای یەکتریدا شوویان بە عوسمانی کوڕی عەففان کردەوە، عوسمانیش پیاوێکی زۆر دەوڵەمەند بوو، بەڵام عەلی کوڕی ئەبوتالیب(خودا لێیڕازیبێت) زۆر هەژارو نەداربوو، ڕاستە ئەبوتالیبی باوکی خاوەن پلەو پایەیەکی شکۆدارو بەرز بوو، بەڵام پیاوێکی خێزانداربوو، بەخێوکردن و بژێوی خێزانێکی زۆری لە ئەستۆبوو، بۆیە هەمیشە هەژارو کەم دەرامەت بوو، بۆیە موحەممەدی برازای داوای لە عەباسی مامی کرد، کە باری سەرشانی ئەبوتالیب تۆزێك سووك بکەن، ئیتر هەر یەکەیان کوڕێکی ئەبوتالیبیان بردەلای خۆیان و بەخێویان کرد، عەلی ئەو کاتە بەر موحەممەد کەوت، کەواتە عەلی هیچ سامانێکی لە باوکیەوە بۆ جێنەمابوو، هەروەها بە هەوڵ و تێکۆشان و هێزو بازوو ڕەنجی خۆی داهاتی زۆر کەمبوو.

عەلی زوو لە سەرەتای هاتنی ئایینی ئیسلامدا یەکەم منداڵبوو باوەڕی بە پەیامی پیرۆزی ئیسلام هێناو موسڵمانبوو، ئیبن ئیسحاق باسی دەکات و دەڵێ تەمەنی عەلی ئەوکاتە دە ساڵ بوو، بۆیە لە هەرەتی تەمەنی لاویدا بواری کارکردنی بۆ نەڕەخساوەو سەرقاڵی سامان کۆکردنەوە نەبووە، بەڵکو هەمیشە ڕووبەڕووی گاورەکان بووەتەوەو یاوەرێتی پێغەمبەری(درودی خودای لەسەربێت) کردوە، ئەم کارەی بەلاوە پەسندترو چاکتربووە لە بازرگانی کردن، کە ئەوکاتە بەچاکترین و بەهادارترین پیشە ناسراوبوو لەناو قوڕەیش و سەرجەم خەڵکی مەککەدا، بگرە بازرگانی پیشەی پیاوانی ناوداری قوڕەیش و باشترین ڕێگابوو بۆ دەوڵەمەندبوون لەم دۆڵە چیایە ڕووت و بێ کشتوکاڵ و بەرهەمەدا، بۆیە بەلامانەوە سەیر نەبێت ئەگەر هیچی نەبێت بیکاتە بەهای مارەیی فاتیمەی گوڵ، جگە لەو قەلغانە نەبێت لەشەڕی بەدردا بەری کەوتبوو، کە ڕۆڵێکی دیارو نەبەردانەی تێیدا هەبوو.

ئیدی فاتیمە دەیزانی عەلی هەژارە، بۆیە کاتێ باوکی(درودی خودای لەسەربێت) داواکاریەکەی عەلی پێڕاگەیاند، لە وەڵامدا بە باوکی گوتووە، عەلی پیاوێکی هەژارە،

ئەم بەسەرهاتە(البلاذری) دەیگێڕێتەوەو دەڵێ:

فاتیمە بەباوکی گوتووە عەلی پیاوێکی هەژارە، باوکی(درودی خودای لەسەربێت) پاکانەی بۆ عەلی کردوەو فەرموویەتی:

لە جیهاندا سەروەرە، لە دوا ڕۆژیشدا لە پیاوچاکانە، زانستی لە هەموو یاوەران زیاترە، هێمن و لەسەرخۆیە، لە پێشەنگی یاوەراندایە بۆ موسڵمانبوون.

لێرەدا دەڵێین ئەگەر ئەم ئاخاوتنەی(البلاذری) ڕاست و دروستبێت، ئەوا بێگومان لەم جۆرە هەڵوێستەدا هەمیشە باوکان ئەگەر بیانەوێت کچەکانیان بدەن بە کەسێك ئاوەها دەڵێن، بەڵام لامانس کاتێ ئەمەی بەرچاو کەوتووە، ویستوویەتی بۆ کەمکردنەوەی پلەوپایەی عەلی(خودا لێیڕازیبێت) ئەم وەڵامە بەکار بێنێت، چونکە کاتێ سەیریکردووە هەژاری و نەداری بۆ ئەم پێشەوایە هیچ نەنگی و شەرمەزاری تێدا نیە، هەوڵیداوە ڕێگایەکی تر بدۆزێتەوە بۆ هێنانەدی مەبەستەکەی، ئیتر پەنای بردۆتەبەر ئەوە گوایە عەلی پیاوێکی شێوە ناشیرین و بێبەش بووە لە جوانی، لامانس پێیوایە کەسایەتی فاتیمە لەم دواییانەدا شیعەکان هێناویانەتە کایەوەو دروستیان کردوە، بۆیە دەڵێین ئەگەر لامانس پیاچوونەوەیەکی بۆ خودی خۆی بکردایە، ئەوا هەرگیز ئەم هەڵەیەی نەدەکرد، چونکە ئەگەر سەیری مێژوونووسانی ئیسلامی بکردایە ئەوکاتە دەیزانی ئەوان کەسایەتی ئەم کەڵە پیاوەیان نەڕازاندۆتەوە هیچ مێژوونووسێکی موسڵمان لە نووسینەکان و بەرهەمەکانیدا نەیگوتووە عەلی پیاوێکی دەوڵەمەندو جوان بووە، بۆ ئەوەی لە دیدو بۆچوونی لامانس و هاوبیری ئەو عەلی ببێتە خاوەن پلەوپایەی بەرزو شکۆدار، بەڵکو هەروەکو لامانس دەڵێ: گوتوویانە(عەلی پیاوێکی باڵا کورت و لووت پان و قۆڵ و مەچەك لاوازبووە)، سەرەڕای ئەمەش تۆزقاڵێك لە بەهاو سەنگ و پێوەری پیاوەتی و پاڵەوانیەتی ئەم پیاوەیان کەم نەکردۆتەوە.



ئیدی فاتیمە لەتەمەنی هەژدەساڵیدا پێشوازی لە ژیانێکی نوێ کرد، پێموایە هیچ مێژوونووسێکی موسڵمان نکوڵی لە ژیانی ناخۆش و تەنگ و پڕ لەهاتوهاتی و هەژاری ماڵی عەلی و فاتیمە ناکات، جیازەکەی فاتیمە بریتی نەبوو لە کەلوپەلێکی نایاب و جوانی ناوماڵ، بەڵکو ئەوەی لە سەرچاوە مێژووییەکاندا هاتووە، تەنیا دوو دەستاڕ و دوو کوندەی ئاو و بالیفێک(سەرینێک) و ڕایەخێک و هەندێ بۆن و بەرام بووە، هاوسەرەکەی لەبەر کەمدەرامەتی و هەژاری نەیتوانیوە تەنانەت ئەرکی قورسی سەرشانی ڕۆژانەی بۆ کەم بکاتەوەو ژنێکی کارکەری بۆ بەکرێ بگرێت، فاتیمە بەتەنیا کاروباری قورسی ماڵەکەی ڕادەپەڕاند، عەلی ئەگەر دەرفەتی هەبوایە نەیدەتوانی دەستەوەستان بوەستێت، یارمەتی هاوسەرەکەی دەدا هەندێ کاروباری ماڵەوەی بۆ جێبەجێ دەکرد، چونکە دەیزانی هاوسەرەکەی لەسەرەتای ژیانیەوە تووشی دەردەسەری و ڕەنجەڕۆیی بووەتەوە، تەنانەت کاریگەری ئابلووقەکەی هێشتا بەسەرماوە، کە ئەو کاتە تەمەنی فاتیمە پێنج ساڵبووە، بگرە دوای ئەمە کۆچکردن و شەڕو کوشتار، ئیتر هەموو ئەمانە کاریگەری زۆریان بەسەر تەندروستی فاتیمەوە هەبوو.

ئەم دوو هاوسەرە زۆر بێزاربوون لە چنگ کاروباری ناوماڵ، تەنانەت عەلی ڕۆژێکیان بە فاتیمەی گوت:باوکت(درودی خودای لەسەربێت) لە شەڕێکدا گەڕاوەتەوە دەستکەوتێکی زۆری دەستکەوتوە، تۆش زۆر ماندوویت، منیش نیگەرانم بۆتۆ، خودا هێناویەتی بچۆ لەناو ژنە دیلەکان یەکێك بێنەوە ماڵەوە تا یارمەتیت بدات، فاتیمە بەو پەڕی ماندوویتی و بێشەنگیەوە دەستاڕەکەی لادایە لایێك و گوتی: پشت بەخودا وادەکەم، دوای ماوەیەك و پشووێکی کەم، هێزو هەناسەیەکی هاتەوەبەر، سەرپۆشەکەی خستە سەر خۆی، ئیتر بە هەنگاوی نەرم و لەسەرخۆ بەرەو ماڵی باوکی چوو، کاتێ باوکی(درودی خودای لەسەربێت) فاتیمەی بینی دڵشادو کامەران بوو فەرمووی: چیتە کچی خۆم؟، لە وەڵامدا گوتی: هاتوومە سڵاو



لەتۆ بکەم، شەرمی کرد بڵێ بۆچی هاتوومەتەلات، دوایی گەڕایەوەماڵەوە بەڵکو بەهاوسەرەکەی بڵێت ئەو شەرمی کردووە داوای هیچ شتێك لە باوکی بکات، بۆیە عەلی(خودا لێیڕازیبێت) هەستا فاتیمەی لەگەڵ خۆی بردو بەیەکەوە چوونە ماڵی پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت)، ئەو لە جیاتی فاتیمە داواکاریەکەی خستەڕوو، فاتیمەش لە شەرما سەری دانەواندبوو، پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) لە وەڵامدا فەرمووی؛

نابەخودا نایدەم بەئێوە، لەکاتێکدا ئەو خەڵکەی(صەفە)لەبرسانا سکیان قۆڕە دەکاتو هیچ نیە پێیان بدەم.

ئیتر عەلی و فاتیمە بەسوپاسەوە هاتنە دەرەوە، بێ ئەوەی بزانن ئەم داواکاریەی ئەوان بە درێژایی ئەم ڕۆژە دڵی باوکی پڕسۆزو بەزەیی نیگەران کردوە، شەوێکی زۆر ساردو هەنگێو بوو، عەلی وفاتیمە چوونە سەر پێخەفە ساردو سڕو زبرەکەیان، بەڵام لە سەرمانا خەو لە چاوەکانیان تۆرا، پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) هاتە ژوورەوە، ئەوانیش هەدووکیان لەناو جێگادا لەسەرمان ئەژنۆیان گەیشتبووەوە دەمیان، چونکە ئەگەر پێیەکانیان داپۆشتبوایە ئەوا سەریان بەدەرەوە دەمایەوە، ئەگەر سەریان داپۆشتبوایە ئەوا پێیەکانیان بەدەرەوە دەمایەوە،

ئیدی کاتێ پێغەمبەریان(درودی خودای لەسەربێت) بینی، بۆ دیدەنی ئەم میوانە بەڕێزە ڕاپەڕین، بەڵام پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) فەرمووی؛ لەشوێنی خۆتان بمێننەوە، دوای ئەمە بەهێمنی فەرمووی؛ ئەرێ شتێکتان پێبڵێم لە داواکاریەکەتان چاکتربێت؟، هەردوو بەیەکەوە گوتیان؛ بەڵێ ئەی پێغەمبەری خودا(درودی خودای لەسەربێت)، فەرمووی؛ چەند وشەیەکە جبریل فێریکردووم، دوابەدوای هەر نوێژێك، دەجار بڵێن (سبحان الله)، دەجاریش بڵێن(الحمد لله)، دەجاریش بڵێن(الله اکبر)، ئەگەر چوونە ناو جێگا سی وسێ جار بڵێن(سبحان الله)، سی و سێ جاریش بڵێن؛(الحمد لله)، سی وسێ جاریش بڵێن (الله اکبر).

ئیتر دوای ئەوەی گرِوتینێکی گیانی و خوایی پێبەخشین، فێری وەرزشێکی دەروونی کردن، لەمیانەی ئەم وەرزشەوە مرۆڤ دەتوانێت بەسەر گیروگرفت و ماندوویێتیدا زاڵبێت، پاشان ماڵئاوایی کردو رِۆیشت.

ئیدی دوای تێپەرِبوونی ماوەی پتر لە سێیەکی سەدەیەك، خەڵك ئەم وشانەیان لە عەلی دەبیست، دەیگوت: بەخودا لەم کاتەوە فێریان بوومە، تا ئێستا هەمیشە دەیانڵێمەوە، یەکێك لە یاوەرەکانی پرسی و پێیگوت:

تەنانەت شەوی شەرِی(صەففەین)یش.

بەدڵنیاییەوە گوتی:

شەوی (صەففەین)یش.

بێگومان دەبینین هەندێ کەس لە گەڵ نەهامەتیەکان و کارەساتەکانی ژیان رِاهاتوون، تەنانەت ئەرکی قورسی رِۆژانە کاریگەری نەکردۆتە سەر تەندروستی و هەڵسوکەوتی، فاتیمە یەکێکبوو لەم جۆرە کەسانە، چونکە ئەگەر بە وردی سەرنجبدەینە ژیانی ئەم خانمە رِێزدارە(خودا لێیرِازیبێت)، دەبینین لەسەرەتای تەمەنیەوە، لە دژایەتی کردن و جەنگدا ژیاوە، بۆیە بیری لە یاری و گاڵتەکردن نەکردۆتەوە، تەنانەت دوای مردنی دایکی زۆر پەست و غەمگین بوو، حەزی لە تەنیایی و گۆشەگیری دەکرد، بەڵام هەمیشە سەرقاڵی باوکی بوو، ئەگەر باوکی نزیکی بوایە ئەوا هۆش و بیری لای ئەوبوو، ئەگەر لە جەنگ و کوشتاریش بوایە ئەوا فاتیمە دڵ و گیانی لای ئەوبوو تا دەگەرِایەوە، رِەنگە ئەگەر دەرفەت و بواری بۆ برِەخسایە لە جەنگیشدا لێی جیانەدەبووەوە، هەروەکو لە جەنگی (ئوحود)دا بەشداریکرد، لەم جەنگەدا فاتیمە برینی بریندارەکانی تیمار دەکردو دەپێچایەوە، لەسەرەمەرگدا ئاوی دەدایە شەهیدەکان.

ئەو بارودۆخەی فاتیمە تێیدا ژیا، کەسایەتیێکی بێدەنگ و گۆشەگیری تێدا دروست کردبوو، رِەنگە خۆی نەویستبێت بەمجۆرەبێت، بەتایبەتی کاتێ دەبینی



هاوسەرەكانی پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) چۆن بەخەندەیەكی شیرین و بەڕوویێكی گەش، بەوتەی خۆش و پڕ لەسۆزەوە پێشوازی لە باوكی دەكەن، بەتایبەتی عائیشە(خودا لێیڕازیبێت)، فاتیمە ویستوویەتی ئەویش بەمجۆرە هەڵسوكەوت بكات، تەنانەت هەوری خەمۆكی دابڕان و مردنی دایكی لابەرێت، چۆن هەمیشە باڵی بەسەرماڵەكەیدا كێشابوو، جگە لەمە نیگەرانی و دڵەڕاوكێی بەردەوامی بۆ باوكی و هاوسەرەكەی، هەروەها ئەم نەهامەتی و كارەساتانەی بەسەر موسڵمانان و كەسوكاریدا هاتبوو، سەرجەم ئەمانە كاریگەری زۆریان كردبووە سەر هەڵسوكەوتی فاتیمە، بەڵام بێگومان ئەگەر هەوڵبدات خۆی بگۆڕێت و بیەوێت سەركەوتووبێت لەم كارەدا، پێویستی بە هاوسەرێكی نەرمونیان و لەسەرخۆو هێمن هەیە، بەڵام عەلی(خودا لێیڕازیبێت) لەم هاوسەرە هێمنانە نەبوو، بەڵكو توندی پێوە دیاربوو، ئەوەندە متمانەی بەخۆی هەبوو بۆیە بە پیاوێكی قسە ڕەق دەهاتە بەرچاو، كەواتە ئەگەر فاتیمە(خودا لێیڕازیبێت)پێویستی بەدەستێكی ناسكی پڕ لەسۆز بێت، تا برینە كۆنەكانی سەرەتای ژیانی پڕ لەناسۆری منداڵیەتی بۆ سارێژ بكات و لەبیری بەرێتەوە كە هەمیشە بەدەستیانەوە دەناڵێنێت، ئەوا ڕەنگە عەلی(خودا لێیڕازیبێت) لە فاتیمە كەمتر پێویستی بەم دەستە پڕ لەسۆزو بەزەییە نەبووە، بەڵكو ئەو پتر پێویستی بە یەكێك هەبووە، هەر هیچ نەبێت تۆزو گەردی گۆڕەپانی جەنگی لەسەر لادات، كە لە هەرەتی تەمەنی لاوێتیدا كەوتبووە ناویەوە، كەواتە بە لامانەوە سەیر نیە، ئەگەر مێژوونووسان باس لەناكۆكی ئەم دووهاوسەرە بكەن، بگرە هەندێ جار ناكۆكیەكەیان گەیشتۆتە لای پێغەمبەری باوك(درودی خودای لەسەربێت) و كێشەكەی بۆ چارسەركردوون، تەنانەت دەگێڕنەوە ئێوارەیەك پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێت) بە پەشۆكاوی بەرەو ماڵی فاتیمەی كچی دەچوو، ماوەیەك لەوێ مایەوە، دوایی كاتێ هاتەدەر لە خۆشیا ڕوخساری دەدرەوشایەوە، یەكێك لە یاوەرەكانی گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا(درودی خودای

لەسەربێت) کاتێ تۆ چوویتە ژوورەوە لەباروردۆخێکدا بوویت، کەچی دەتبینین لەهاتنە دەرەوەدا ڕووت گەشە؟، لەوەڵامدا فەرمووی: بۆ ڕووگەش نەبم، نێوان دوو کەسی زۆر خۆشەویستم ڕێکخست.

هەروەها جارێکیان فاتیمە لەدەست توندی هاوسەرەکەی ئەوەندە بێزاربوو بۆیە پێیگوت: بەخودا سکاڵاکەم دەبەمە لای پێغەمبەری خودا(درودی خودای لەسەربێت)، ئیتر لەماڵەوە دەرچوو، عەلی بەدوای ئەو داچوو، فاتیمە گەیشتەلای باوکی(درودی خودای لەسەربێت)، سکاڵاکەی کردو گوتی: عەلی بێزاری کردووم، باوکی(درودی خودای لەسەربێت) زۆر لەسەرخۆو بەنەرمی ڕازی کردو فەرمووی: پێویستە تۆ نەرم و هێمن بیت لەئاست عەلی و پەست مەبە لێی، ئیتر عەلی هاوسەرەکەی لەگەڵ خۆی بردەوە و گوتی: بەخودا ئیتر هەرگیز کارێك ناکەم تۆ پێتناخۆش بێت.

# عەلی دەیەوێت ژنێکی تر بێنێت

بەڵام وێڕای ئەمەش زۆر جاری دیکە بێ دەستی هەردوولایان هەڵەیەك ڕوویدەدا دەبووە مایەی نیگەرانی و دڵپەستی بۆیان، بەڵام ئایا دەبێ چ شتێك بۆ فاتیمە لەوە ناخۆشتر بێت کاتێ هاوسەرو ئامۆزاکەی دەیەوێت هەوێی بەسەربێنێت؟، عەلی ویستی ژن بەسەر فاتیمە بێنێت، پێیوابوو ئەمە کارێکی ئاساییە، ئایین ڕێگای پێداوەو(حەڵاڵە)، چۆن ژنانی موسڵمان هەوێیان بەسەردێت، کچەکانی پێغەمبەریش(درودی خودا ی لەسەربێت) بەهەمان شێوە دەکرێ ژنیان بەسەربێت، وێڕای ئەوەش خودا زیاتر لە ژنێکی بۆ پیاوان حەڵاڵ کردوەبۆیە عەلی پێیوابێت ئەگەر ژنێکی دیکە بێنێت،فاتیمەش وەکو عائیشەی کچی صدیق و حەفصەی کچی عومەری فاروق و ئومسەلەمەی کچی زادولڕەکب زوێر نابێت.

ئوسامەی کوڕی زەید زۆر خۆشەویست بوو لای پێغەمبەر(درودی خودای

لەسەربێت) هاتەلای داوای لێکرد تا دەستی ژنێکی مەخزومی نەبڕێت کە دزی کردبوو، بەڵام پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) فەرمووی:

ئایا تۆ پاکانە لە سنوورێك لە سنوورەکان و حوکمەکانی خودا دەکەیت؟.

دوای ئەمە وتارێکی بۆ خەڵکداو فەرمووی:

ئەو میللەتانەی پێش ئێوە بۆیە فەوتان و لەناوچوون، ئەگەر یەکێکی خاوەن ڕەچەڵەك و گەورە دزی بکردایە سزایان نەدەدا، بەڵام ئەگەر یەکێکی بێ هێز دزی بکردایە، حوکمیان بەسەردا دەسەپاند، بەخودا ئەگەر فاتیمەی کچی موحەممەد دزی بکات ئەوا دەستی دەبڕم.

بەڵام بۆچوونەکەی عەلی هەڵەبوو، چونکە کاتێ ئاشکرای کرد خوازبێنی کچی عەمری کوڕی هاشمی کوڕی ئەلوغەییەرەی ئەلەخزومی کردووە،فاتیمە ڕقی هەڵساو زوێربوو، ئیتر باوکی کاتێ بینی کچەکەی پەست و زوێرە، ئەمیش سەبارەت بە کچەکەی نیگەران و پەست بوو، ئیدی هەڵوێستی عەلی ناڕێك و ناخۆش بوو، پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) دەیزانی عەلی ماڧی خۆیەتی ژنێکی تر بێنێت، ئەگەر بەسەر فاتیمەی کچی موحەممەدیش بێت، بەڵام سەرەڕای ئەمەش وەك باوکێکی بەسۆز، وەك مرۆڤێك پێیناخۆشبوو خۆشەویسترین کچی بەدەست هەوێداریەوە ئازار بچێژێت، چونکە ئەم کچەی لە ژیاندا خەفەت و پەژارەی زۆری چەشتووە، ئیتر تواناو بەرگەی زیاتری نەماوە، بۆیە عەلی دەبێ ئارام بگرێت لەسەر ئەم تاکە ژنەی، هەروەکو ئامۆزاکەی چۆن بۆ ماوەی چارەکە سەدەیەك ئارامگربوو لەسەر خەدیجە.

کەواتە پێغەمبەری باوك(درودی خودای لەسەربێت) دووچاری هەڵوێستێکی ئالەبارو قورس بووەوە، دەیبینی کچە خۆشەویستەکەی خەفەتبارو غەمبارە، بەترس و دوودڵیەوە سەیری ئایندەو دوارۆژی خۆی دەکات، تەنانەت کاریگەری کردۆتە سەر تەندروستی و بێهێزو لاواز دیارە، بۆیە بە هەموو توانای خۆی هەوڵیدەدا ئەم

نەهامەتیەو نیگەرانیەی لەسەر لابەرێت، لەم ترس و دڵەڕاوكێیە بیپارێزێت، کە خەوی لەچاودا تۆراندوەو هەمیشە لەبەر شەونخوونی چاوەکانی ئاوساندووەبەڵام ئایا پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) ئەوەی خودای مەزن حەلاڵی کردوە حەرامی دەکات؟.

بێگومان لەوەڵامدا دەڵێین نەخێر، بەڵام ئەم دۆزە ڕوویێکی دیکەی هەیە، ئەویش ئەمەیە عەلی دەیەوێت کچی عەمری کوڕی هوشامی ئەلەخزومی بخوازێت، ئایا خودای مەزن ڕازیە کچی پێغەمبەرو کچی دوژمنی خودا بەیەکەوە لە ماڵی عەلی کۆببنەوە، چونکە عەمری کوڕی هوشام واتە(ئەبوجەهل) لەهەموو کەسێك زیاتر ئازارو ئەشکەنجەی پێغەمبەرو(درودی خودای لەسەربێت) یاوەرانی داوەو هەرگیز لەبیریان ناچێتەوە، هەمیشە دوژمنێکی سەرسەخت و دژواری ئیسلام بووە، ئەم دوژمنە بوو ڕۆژێك بە قورەیشیەکانی گوت:

ئەی کۆمەڵانی قورەیش، موحەممەد هەمیشە خەریکی کەموکوڕی خوداکانی ئێمەیە، جنێو بە باوك و باپیرانمان دەدات، خەونەکان و ئاواتەکانی ئێمەی پوچەڵ و نەزۆك کردووە، ئیتر من پەیمان بەخودای خۆم دەدەم، بەیانی بەردێکی زۆر گەورە هەڵدەگرم، بۆی دادەنیشم تەنانەت کاتێ چووە کڕنووش بردن، بە بەردەکە سەری پان دەکەمەوە، جا ئێوە یارمەتیم بدەن، یان قەدەغەم بکەن، من هەردەبێ ئەم کارە بەئەنجام بگەیەنم، دوای ئەمە بنەماڵەی عەبدولمەناف چیم پێدەکەن بابیکەن.

هەروەها بۆ گاڵتەکردن بە پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) دەیگوت:

ئەی کۆمەڵانی قورەیش، موحەممەد پێیوایە سەربازەکانی خودای ئەو، ئێوە بەئاگر سزاو ئازار دەدەن، ژمارەیان نۆزدە کەسە، ئێوەش ژمارەتان لە هەموو کەس زیاترە، ئایا بەسەد پیاو توانای یەك سەربازتان نیە؟.

سەبارەت بەم ووتەیەی ئەبوجەهل خودای بەرزو پڕ توانا ئەم ئایەتە پیرۆزەی ناردە خوارەوە:

﴿ وَمَا جَعَلْنَآ أَصْحَٰبَ ٱلنَّارِ إِلَّا مَلَٰٓئِكَةًۙ وَمَا جَعَلْنَا عِدَّتَهُمْ إِلَّا فِتْنَةً لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ﴾ المدثر: ٣١

واتە: ئەوانەی خودا لە دۆزەخ دایناون بۆ ئازاردانی تاوانباران فریشتەن، ئەم ژمارەیەش بۆیە داندراوە تا ببێتە مایەی فەوتانی گاورەکان و پێیەوە گرفتاربن.

هەروەها ئەم ئەبوجەهلەبوو دەربارەی قورئانی پیرۆز پرسیاری لە ئەخنەسی کوڕی شەریق کردو پێیگوت:

ئاخۆ چیت بیستووە و ڕات چیە؟.

ئەخنەس لەوەڵامدا گوتی:

چیم بیستووە!، ئێمەو بنەماڵەی عەبدومەناف هەمیشە ململانێمان بوو لەسەر پایەبەرزی و شکۆمەندی، ئەوان خواردنیان بەخەڵك بەخشی، ئێمەش بەخشیمان، ئەوان وازیان هێنا، ئێمەش وازمان هێنا، ئەوان دووبارە بەخشیانەوە ئێمەش هەروەها، تەنانەت وەك دوو ئەسپی پێشبڕکێ وابووین لە ململانێدا، دوایی ئەوان گوتیان:

پێغەمبەرێك لە بنەماڵەی ئێمەوە دێت، (وەحی) بۆ دادەبەزێت.

ئێمەش گوتمان:

هەرکاتێك بەم سەردەمە گەیشتین، بەخودا هەرگیز باوەڕی پێ ناکەین و بەڕاستگۆی نازانین.

ئەبوجەهل ئەم کەسەبوو کاتێ بیزانیایە پیاوێکی ناودار و شکۆمەند موسڵمان بووە، دەچووەلای سەرکۆنەی دەکردو پێیدەگوت:

باوکت لەتۆ پیاوترو چاکتربوو، کەچی تۆ ئایینەکەی باوکت جێدەهێڵیت؟، کەواتە ئێمە خەونەکانت نەزۆك دەکەین، بۆچوونەکانت ناشیرین و شەرمەزار دەکەین، شکۆمەندیت ناهێڵین.

ئەگەر پیاوە موسڵمانبووەکەش بازرگان بووایە، پێیدەگوت:



بەخودا بازرگانیەکەت مایەپووچ دەکەین و سامانەکەت لەناودەبەین.

ئەگـەر بهاتایـە پیاوەکـەش بـێ هێـزو بـێ دەسـەڵات بوایـە، ئـەوا ئـازارو ئەشـکەنجەیەکی زۆری پێـدەداو بـە لێـدان و سـووکایەتی پێکـردن ناچـاری دەکـر پەشیمان بێتەوە.

ئەبوجەهلی نەفرەت لێکراو خاوەنی ئەم دڵەڕەقەبوو، کاتێ لە تاریکایی شـەودا چاوی کەوت بە حەکیمی کوڕی حـەزامی کـوڕی خوەیلـد، لەسـەردەمی ئابلووقەکـەدا خۆراکی بۆ خەدیجەی پووری دەبرد، یەخەی گرت و پێیگوت:

ئەوا تۆ خۆراك بۆ نەوەکانی هاشم دەبەیت؟، بەخودا هێشتا تۆ ئێرە جێناهێڵیت من لە مەککە ئاشکرات دەکـەم و ئـابڕووت دەبـەم، ئـیتر یەخـەی بەرنـەدا، تەنانـەت لەیەك ئاڵان و بوو بەشەڕو لێکدانیان.

لەئاکامی ئەم کارەیدا خودای مەزن فەرمووی:

﴿ إِنَّ شَجَرَتَ ٱلزَّقُّومِ ﴿٤٣﴾ طَعَامُ ٱلْأَثِيمِ ﴿٤٤﴾ كَٱلْمُهْلِ يَغْلِي فِي ٱلْبُطُونِ ﴿٤٥﴾ كَغَلْيِ ٱلْحَمِيمِ ﴿٤٦﴾ ﴾ الدخان: ٤٢ – ٤٦

واتـە: لـە ڕاسـتیدا درەختێـك نـاوی زەقومـە، لـە دۆزەخـدا خـۆراکی تاوانبـاران و گوناهبارانە، وەك مسی تواوە لـەناو هەناویانـدا دەکوڵێـت، وەك کوڵانی ئـاوێکی زۆر گەرم دەکوڵێ.

هەندێ مەسیحی بە نوێنەرایەتی لە وڵاتـی حەبەشـەوە هاتنـە مەککـە، تـا لەنزیکـەوە موحەممەد ببینن و بزانن ئایینـە نوێکـەی چیـەو چۆنـە؟، دوای دانیـشتنیان لەگـەڵ پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) باوەڕیان بە ئایینەکەی هێنا، ئەبوجەهل کاتـێ ئەمەی بیست چوو لەسەر ڕێگایان دانیشت، لە گەڕانەوەیاندا پێیگوتن:

خودا بێ نومێدتان بکات، کەس و کارو هاوئایینەکانتان ئێوەیـان بۆیـە ناردوەتـە ئێرە، تا سەرو سەربردەو هەواڵی ئەم پیاوەیان بۆ بەرنەوە، کەچـی بەیـەك دانیـشتن



لەگەڵ ئەودا ئایینی خۆتان جێهێشت و باوەڕتان پێیکردا، نەمانزانیوە کەس لە ئێوە گەمژەتربێت.

هەروەها ئەبوجەهل پێش کۆچکردنی پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) لە مەککەوە بۆ مەدینە، بیرۆکەی کوشتنی بۆ قورەیشیەکان داڕشت، پێیگوتن:

لە هەر تیرەیەك و هۆزێك گەنجێکی شکۆداری بەهێزو گونجاو هەڵبژێرن، هەریەکەیان شمشێرێکی تیژو بڕندەیان بدەنەدەست، هەموویان بەیەکەوە هێرش بکەنە سەر موحەممەد، بەیەك دەست لێیبدەن و بیکوژن، ئیتر ئەوکاتە خوێنەکەی دەکەوێتە ئەستۆی سەرجەم تیرەو هۆزەکان.

بەڵام خودا یارمەتی پێغەمبەرەکەی خۆیدا(درودی خودای لەسەربێت)، کۆچی کردو ڕزگاربوو، دوای کۆچەکە ئەبوجەهل لەگەڵ ئەم بڕە گەنجە بەرەو ماڵی ئەبوبەکر(خودا لێیڕازیبێت) چوو، ئەسمای کچی ئەبوبەکر هاتە بەر دەرگا پێیان گوت:

کچی ئەبوبەکر کوا باوکت لەکوێیە؟.

ئەسما گوتی:

بەخودا نازانم باوکم لەکوێیە.

ئەبوجەهلی دڵ ڕەق دەستی بڵند کرد دای لە بناگوێی ئەسمادا، گوارەکەی گوێی ئەسما لەگەڵ لێدانەکە پساو کەوتە خوارەوە.

هەروەها لە جەنگی بەدردا، هەردوو لەشکر لە ئامادەباشیدابوون بۆ جەنگ و کوشتار، قورەیشیەکان یەکێکیان بەنهێنی بە نیازی هەواڵگەری نارد، بەڵکو هەواڵ و باسوخواسی دوژمنیان بۆ بێنێتەوە، کاتێ گەڕایەوە پێیگوتن لەشکری ئیسلامەکان زۆر بەهێزن، جگە لەمەش پێگەو شوێنی گرنگیان لەژێر دەستدایە، حەکیمی کوڕی حەزامی کوڕی خوەیلد کە ئەمەی بیست چووەلای عوتبەی کوڕی ڕەبیعە، داوایلێکرد پاشەکشە بکەن و شەڕ نەکەن، لە سەرەتادا عوتبە خەریکبوو گوێڕایەڵی حەکیم



بێت و فەرمانی پاشەکشەکردن دەربکات، بەڵام دوایی داوای لە حەکیم کرد بچێتەلای ئەبولحەکەم و ئەم پێشنیارە ئاراستەی ئەو بکات، چونکە عوتبە دەیزانی لە ئەبوجەهل بەملاوە کەسێکی تر نیە لەناو لەشکرەکەدا سەرپێچی لە گەڕانەوەو پاشەکشێ بکات، بۆیە حەکیم چووەلای ئەبوجەهل و داوای لێکرد شەڕو کوشتار نەکەن و بگەڕێنەوە دواوە، بەڵام ئەبوجەهل لە وەڵامدا گوتی هەردەبێ شەڕ بکەین.

ئەبوجەهل یەکێبوو لەم حەوت کەسە تاوانبارانەی لە ڕۆژی بەدردا پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) داوای دەکردو لە خودای مەزن دەپاڕایەوە لەناویان بەرێت، هەروەها یاوەرەکانی هاندەداو ڕشتی دەکردن تا بەدوای ئەبوجەهلدا بچن و بیکوژن، لە ئەنجامدا ئەبوجەهل بە ئەفرەت لێکراوی و بە گاوری کوژرا، یاوەران سەریان بڕی و هێنایەنە بەردەم پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت)، ئەمیش بە لەناوچوونی ئەم گاورە سەر ڕەقە سوپاسی خودای باڵادەستی کرد، پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) وشترەکەی ئەبوجەهلی لای خۆی هێشتەوە، تەنانەت دوای چوار ساڵ پاش جەنگی بەدر بۆ مەبەستی (عومرە) هێنانەوە چوو بۆ مەککە، لە ڕۆژی (حودەیبییە) وشترەکەی کوشتەوەو کردیە قوربانی.

ئایا کچی ئەم پیاوە دەبێ ببێتە هەوێی فاتیمەی کچی پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت)؟.

پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) گرژی بە ڕوخساریەوە دیاربوو، بەسەر (مینبەر) کەوت و وتارێکی بۆ یاوەرەکانیدا فەرمووی:

بنەماڵەی هوشامی کوڕی موغەییرە داوایان لێکردووم تا ڕێگایان پێبدەم، کچەکەیان بدەنە عەلی کوڕی ئەبوتالیب، ڕێگایان پێنادەم، دووبارە ڕێگایان پێنادەم، لە کۆتاییدا ڕێگایان پێنادەم، ئەوەناڵێم مەگەر کوڕی ئەبوتالیب دەستبەرداری کچەکەی من بێت، ئەو کاتە با کچەکەی ئەوان بێنێت، چۆن کچەکەی من پارچەیەکە لەمن ئەوەی دڵخۆشی بخاتە دڵی ئەو، دڵخۆشی دەخاتە دڵی من، ئەوەی ئازاری بدات

ئازاری من دەدات ، من لەوە دەترسم ئایینەکەی لێ بشێوێنێ و تێکیبدات.

دوای ئەمە پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) باسی ئەبولعاسی زاوای خۆی کرد، چۆن لە بنەماڵەی عەبدوشەمسە وەك عەلی لە بنەماڵەی عەبدولموتەلیب نیە، بەڵام پیاوێکی چاکە، سوپاس و ستایشی کردو فەرمووی:

گفتوگۆی لەگەڵ کردم باوەڕی هێنا، پەیمانی پێدام وەفاداربوو، من نامەوێ ئەوەی حەڵاڵە حەرامی بکەم و ئەوەی حەرامیشە حەڵاڵی بکەم، بەڵام خودا هەرگیز کچی پێغەمبەری خۆی لەگەڵ کچی دوژمنی خۆی لەیەك ماڵدا کۆناکاتەوە.

ئەم فەرموودەیە پیرۆزە لەکتێبی شەش دایکەکان و کتێبی ئەحمەد کوڕی حەنبەلدا هاتووە، بەڵام هیچ مێژوونووسێك باسی کاریگەری ئەم فەرموودەیەی لەسەر موسڵماناندا نەکردووە، تەنانەت تا چ ڕادەیەك دەنگدانەوەی لە شاری مەدینەدا هەبووە.

بەڵکو ئەوێ شەوێ خەڵکی شاری مەدینە پێلوی چاوەکانیان لێکنەنا، چونکە هەمیشە بیریان لە فەرموودەکەی پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) دەکردەوە، چونکە هەرچەندە زادەی ژینگەیەکە کچی تێدا زیندەبەچاڵ دەکرێت و هیچ بەهایێکی بۆ دانادرێت،کەچی ئەو(درودی خودای لەسەربێت)باوکێکی زۆر بەزەیی‌و بەسۆزە، کچەکانی زۆر خۆشدەوێت.

عەلی کاتێ ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەرو خەزووری بیست، لە مزگەوت هاتەدەرەوە، بە دڵێکی پەست و بەهەنگاوی لەسەرخۆو هێمنانە ڕێگای ماڵەوەی گرتەبەر، سەرقاڵی بیرکردنەوەبوو، ئەرێ بەڕاستی ویستوویەتی ژن بەسەر فاتیمە بێنێت؟، ئایا ئەم ماوە دوورو درێژەو تێکۆشان و دلێریەی چەندساڵی ڕابردووی لە پێناو بانگەواز کردن بۆ ئایینی موحەممەد(درودی خودای لەسەربێت) هەمووی بە فیڕۆ بڕوات؟، چۆن توانی بەمجۆرە دڵی ئەو ئازیزەی کچی خۆشەویسترین کەسی پەست بکات و بڕەنجێنێت، تەنیا بۆ جێبەجێکردن و بەدیهێنانی هەستێکی مادی کە



پێیوایە ئەم هەستە لای فاتیمە بوونی نیە؟. تەنانەت بیری لە هاوسەرگیری پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) لەگەڵ هەر یەکێك لە هاوسەرەکانی دەکردەوە، چۆن هەر یەکێکیان هۆکارو مەبەست و تایبەتمەندی خۆی هەبووە، هەر یەکەو باردودۆخی تایبەتی خۆی هەبووە، ئەگینا بۆ پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) ماوەی بیستوپێنج ساڵ لەگەڵ خەدیجەخان بە هاوسەرێتی ژیانی بردەسەر، کەچی هیچ ژنێکی دیکەی نەهێنا، تەنانەت دوای مردنی خەدیجەش بیری لەژن هێنان نەدەکردەوە، کەچی تەمەنی ئەو کاتە پەنجا ساڵ بوو، هەمیشە سەرقاڵی ڕووداوی یەکجار مەزن بوو، سەرجەم کاتەکانی لە پێناو ئایینی نوێدا تەرخان کردبوو.

دوای بیرکردنەوەو بەخۆداچوونەوە،عەلی(خودا لێیڕازیبێت) پێیوابوو ئیتر سەرجەم هەوڵ و تێکۆشان و دلێری و لەخۆبوردەیی ڕابردووی بەفیڕۆدەچێت، هەروەها خەزوورایەتی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێت) بە ئەبوجەهلی کوڕی هوشام دەگۆڕێتەوە، کەواتە کچی ئەبوجەهل بۆ یەکێکی تر شیاوە نەك بۆ ئەو، چونکە بۆ عەلی نەهاتووە پێغەمبەری باوك و ئامۆزای خۆی لە میانەی خۆشەویسترین کچیەوە سەخڵەت بکات و ئازاری بدات، ئایا ئەبولعاصی کوڕی ئەلڕەبیع پێش موسڵمانبوونی زیاتر ڕێزی پێغەمبەری(درودی خودای لەسەربێت) گرتووەو ئەو لە عەلی چاکتربووە بۆ کچی ئامۆزاکەی.

ئیدی عەلی بەدەم بیرکردنەوە بەرەو ماڵ گەڕایەوە، بینی فاتیمە گوڵ بەتەنیا دانیشتووە، دەستی لەملی خەفەت و پەژارە کردووەو گۆش داماوە، نەیزانی چۆن بیدوێنێت، بۆیە بە کپ و بێدەنگی لە نزیك فاتیمە دانیشت، بەسیلەی چاوەکانی سەیری کرد، بینی فاتیمە دەگرێت، ئیتر عەلی خۆی بۆ نەگیرا، بە دەنگێکی پڕ لە سۆزو بەزەییەوە، بەوپەڕی هێمنیەوە گوتی:

فاتیمە بمبەخشە، من لە ئاست تۆدا هەڵەبووم، تۆش خاوەنی لێبوردن و بەخشندەیت.

فاتیمە بێدەنگبوو، تەنانەت بەشێکی شەو بەسەرچوو، ئینجا فاتیمە وەڵامی دایەوەو گوتی:

ئامۆزا خودا بتبەخشێت.

ئیتر عەلی باسی وتارەکەی مزگەوتی بۆ فاتیمە گێڕایەوە، هەروەها باسی هەست و نەستی خۆی کرد، چۆن دڵ پەست بوو کاتێ زانی ئامۆزاکەی بەهۆی ئازاردانی کچەکەیەوە پەست و نیگەرانە، باسی ڕێگا پێنەدانی خواستنی کچی ئەبوجەهلی کرد کەنابێ ببێتە هەوێی فاتیمە، تەنانەت سوێند خواردنی کە هەرگیز نابێ کچی پێغەمبەری خودا لەگەڵ کچی دوژمنی خودا لەماڵێکدا کۆببنەوە.

کاتێ فاتیمە ئەم هەواڵەی بیست فرمێسکی چاوەکانی قەتیس وەستابوون، چونکە دەیزانی باوکی(درودی خودای لەسەربێت) چ خۆشەویستییەکی بێ پایانی بۆ ئەو هەیە، سەرەڕای ئەم هەڵوێستە کاریگەرییەی نواندوویەتی، دوای ئەمە فاتیمە دەستی کرد بە شەونوێژکردن.

## چەند سەرنجێك سەبارەت بەکاتی ئەم ڕووداوە

پرسیارێك لە هزرو بیردا سەر هەڵدەدات، ئایا عەلی کەی ویستی ژن بەسەر فاتیمەی کچی پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) بێنێت؟.

مێژوونووسان و زانایانی بواری وتە پیرۆزەکانی پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت)، سەبارەت بە کاتی ئەم ڕووداوە بێدەنگن و ئاماژەیان بۆی نەکردوە، چونکە بە هەندیان هەڵنەگرتووەو بایەخیان بەکاتەکە نەداوە، وێڕای ئەمەش دەڵێین هەرچەندە ئێمە هیچ بەڵگەیەکمان نیە بۆ دڵنیابوون لە کاتی ئەم ڕووداوە، بەڵام پێمانوایە لە سەرەتاو دەستپێکی ژیانی هاوسەرگیریان بووە، چونکە بەپێی هەڵسەنگاندنە مێژووییەکان و هەڵوێستەکان وا دەردەکەوێت ئەم کاتە عەلی و

فاتیمە هیچ منداڵیان نەبووە، فاتیمە تەواو ئاشنا نەبووبو بـە تونـدیو زبـری عـەلی، لـە هـەمان کاتـدا عـەلیش نەیـدەزانی فاتیمـە هێشتا بـەدەم ئـازاری برینـی دابـڕان و کۆچـکردنی دایکـی دەتلێتـەوە، سـەرەڕای ڕانـەهاتنی لـە مـاڵ و ژیـانی نـوێی هاوسـەرگیریو دابڕانـی لـەماڵی بـاوکی، بۆیـە پێمانوایـە ڕووداوەکە لەساڵی دووەمـی کۆچی بووە، چونکە لەساڵی سێیەمی کۆچی ئەم دوو هاوسەرە بـەڕێزە یەکەم بـەری هاوسەرێتیان هاتە بەرهەم.

# بەختەوەری و نەوەنانەوە

پرشنگی ئاسۆی بەختەوەری و شادی لە ژێر هەوری ڕەشدا بەدەرکەوت و باڵی بەسـەر دڵ و دەروونـی فاتیمـەدا کێشا، ئـیتر ژیـانی ئـەم دوو هاوسـەرە گەڕایەوە بـۆ دۆخـی جـارانی پـێش تەنگژەکـە، ڕۆژ لـەدوای ڕۆژ خۆشەویـستی و هـەرەوەزی پەیوەنـدی نێوانیـانی تۆکمـەتر دەکـرد، خەفـەت و پـەژارەی فاتیمـە ڕووی لەکەمبوونەوە بـوو، بۆیـە توانـای خزمـەتکردنی هاوسـەرەکەی زیـاتر بـوو، هەروەها هاوسـەرەکەی هەسـتی دەکـرد فاتیمـە پێویـستی بـە یارمەتیدانـە لـە بـەڕێوەبردنی کاوباری ناوماڵدا، بۆیە هەمیشە یارمەتیدەدا بەتایبەتی لە کارە قورسـەکاندا، وێـڕای ئەمەش هەوڵیدەدا نەرمونیانی بنوێنێت و بەزەیی پێیدابێتەوە.

لەسـاڵی سـێیەمی کۆچـیدا خـودای مـەزن چـاوی فاتیمـەو خۆشەویـستەکانی بەکۆرپەلەیـەکی چـاوگەش ڕۆشـن کـردەوە، ئـیتر مزگێنـی لـەدایکبوونی(حەسـەن) گەیشتە پێغەمبەر(درودی خودای لەسـەربێت)، بـەم نۆبەرەیـە زۆر دڵخۆش بـوو، لـە خۆشیانا بەگورجی بەرەو ماڵی فاتیمەچوو، منداڵەکـەی خستەسەر هـەردوو دەسـتی پـیرۆزی، دوای ئەمـە لـە نـاو گوێیـدا بانگیـدا، بـەڵام هـەردوو کـوڕە مردووەکـەی خـۆی بیرکەوتەوە، بۆیە زۆر بەسۆزو بەپەرۆشەوە سەیری(حەسەن)ی دەکرد.

قژی حەسەنی بڕی دوایی خستیە پای تەرازووەوە، هێندەی کێشی قژەکـە زیـوی



بەسەر هەژاراندا دابەشکرد، ئیتر لە میانەی ئەم جگەرگۆشەیەوە سەیری ژیانی دەکردو ژیانی بەدی دەکرد، تەمەنی حەسەن بووە ساڵێك و چەند مانگێك، لە مانگی شەعبانی ساڵی چوارەمی کۆچیدا (حوسەین)ی برای لەدایکبوو.

پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت)کاتێ ئەم دوو نەوە ئازیزەی بەباوەشی فاتیمەی دایکیانەوە دەبینی زۆر شادو دڵخۆش دەبوو، ڕەچەڵەك و نەوەکانی خۆی بۆ بەردەوامی ژیان و نەپسانەوەی لە سەر ئەم زەویەو ئەم جیهانەدا لە خودی ئەم دوو نەومیەدا دەبینی، شنە بایێکی فێنکبوون بۆ دڵی پڕ لەسۆزی باوکایەتی و تێنووی منداڵ، چونکە لەدوای مردنی خەدیجەخانی هاوسەری(خودا لێیڕازیبێت) لە منداڵ بێ ئومێد بوو بوو.

کاتێ(حوسەین)لەدایکبوو،واتە لەساڵی چوارەمی کۆچیدا،حەڤدە ساڵبوو خەدیجە (خودا لێیڕازیبێت) کۆچی دوایی کردبوو، پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) تەمەنی نزیکەی پەنجاوحەفت ساڵ بوو، لەم ماوەیەدا پێنج ژنی هێنابوو(سەودەی کچی زەمعە بێوەژنێکی پیری بەساڵاچووبوو، عائیشەی کچی ئەبوبەکر کچێکی هەرزەکاربوو، حەفصەی کچی عومەر گەنجێکی لەباربوو، دایکی هەژاران زەینەبی کچی خوزەیمە، ئوم سەلەمە هیندی کچی ئەبوئومەییەی ئەلەخزومی(زادئەلرەکب) لە مانگی شەوالی ساڵی چوارەمی کۆچیدا گواستەوە،ئومسەلەمە بێوەژنبوو،لەعەبدوڵڵای کوڕی عەبدولئەسەدی کوڕی موغەییەرەی هاوسەری پێشووی، کە پوورزای پێغەمبەربوو، چۆن بەرەی کچی عەبدولموتەلیب دایکی بوو، چوار منداڵی هەبوو (سەلەمە، عەمر، دورە، زەینەب)، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) لە هیچ یەکێك لەم پێنج ژنانە منداڵی نەبوو، بۆیە وادیاربوو موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵا(درودی خودای لەسەربێت) تەنیا لە ڕێگای فاتیمەی کچیەوە نەوە دەنێتەوە، کەواتە هیچ سەیرو نامۆ نیە، ئەگەر پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) هەردوو نەوەکانی (حەسەن و حوسەین)ی تا ئەوپەڕی خۆشەویستی خۆشبوێت، پڕ بەدڵ سۆزو خۆشەویستی بۆیان هەبێت،

تەنانەت تامەزرۆیی بۆ منداڵ و نائومێدی لەم پێنج ژنە وێڕای سۆزو هەستی باوکایەتی هەمووی لەم دوو منداڵەدا دەردەبڕی.

هەمیشە دەیگوت کوڕەکانم، ئەنەسی کوڕی مالیك(خودا لێیڕازیبێت) دەڵێ:

پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) بەفاتیمەی دەگوت بانگی کوڕەکانم بکە، کاتێ دەهاتنەلای هەردووکیانی لەباوەش دەگرت و بۆنی دەکردن.

ترمذی (ڕەحمەتی خودای لێبێت) دەگێڕێتەوەو دەڵێ ئوسامەی کوڕی زەید(خودا لەخۆی و باوکی ڕازیبێت) گوتی:

بۆ هەندێ پێداویست لە دەرگای ماڵی پێغەمبەرمدا(درودی خودای لەسەربێت)، هاتە دەرەوە شتێکی لە ژێر کراسەکەی حەشاردابوو نەمزانی چیە، کاتێ کارەکەم تەواو بوو گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا(درودی خودای لەسەربێت) ئەمە چیە تۆ حەشارتداوە؟، پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) کراسەکەی لادا بینیم حەسەن و حوسەین بوون، فەرمووی: ئەوانە کوڕی منن و کوڕی کچەمن، خودایە من خۆشم دەوێن تۆش خۆشت بوێن، ئەوانەی خۆشیان دەوێن ئەوانیشت خۆشبوێن.

ئەم دوو کوڕە ناویان زۆر خۆشبوو لەسەر زاری باوکی زەهرادا(درودی خودای لەسەر بێت)، هەمیشە ناویان لەسەرزاری بوو، لە ناو هێنانیان بێزار نەدەبوو، چونکە وەچەو ڕەچەڵەکی بنەماڵەکەی خۆی لەم دوو کوڕەدا بەدی دەکرد.

بۆیە دەتوانین بڵێین خودای کاربەجێ بەخششێکی مەزنی لەگەڵ زەهرادا کردووە، چونکە بۆ پاراستنی، شکۆدارترین و پیرۆزدارترین ڕەچەڵەکی ئادەمیزاد، کە ڕەچەڵەك و نەوەکانی خۆشەویسترین پێغەمبەری خۆیەتی(درودی خودای لەسەربێت) لە نەوەکانی ئەودا گیرکردووەو داناوە، هەروەها ئەم ڕێزو بەخششە عەلیش(خودا لێیڕازیبێت) لێی بەدوور نیە، چونکە ئەم ڕەچەڵەکە پیرۆزە لەپشتی ئەوەوە دێتە کایەوەو نەوەکانی ئەو هەتاهەتایە پایەدارو ڕێزدارن.

لێرە دەڵێین ئەگەر موحەممەد(درودی خودای لەسەربێت) بەخواستی خۆی یەکێك لە کچەکان و زاواکانی خۆی هەڵبژاردبوایە تا هەڵگری ڕەچەڵەکی پاکی



ئەوبن و ببن بە دایك و باوكی نەوەكانی، ئەوا فاتیمەو عەلی هەڵدەبژارد، چونكە عەلی لە هەردوو زاواكانی دیكەی نزیكتربوو بۆی، زادەی یەك ڕەچەڵەك و یەك پشتبوون، لە خوێنی ڕەسەنی هاشم بوون، نەوەی عەبدولموتەلیب بوون، سەرەڕای ئەمە موحەممەد(درودی خودای لەسەر بێت) لە تەمەنی هەشت ساڵیەوە تا بیست و پێنج ساڵی، واتە تا بە هاوسەربوونی لەگەڵ خەدیجەخاندا لەماڵی ئەبوتالیب ژیاوەو وەك كوڕی ئەو ماڵە سەیركراوە، هەروەها دوای هاوسەرگیری و جیابوونەوەی لەماڵی ئەبوتالیبی مامی، عەلی بردەلای خۆی و وەك كوڕی خۆی سەیری دەكرد، بۆیە دەبینین هەردوو زاواكانی تر ئەبولعاصی كوڕی ئەلرەبیع و عوسمانی كوڕی عەففان وێڕای پلەو پایەو شكۆداریان لەناو ئیسلام و قوڕەیشدا، پلەی تێكەڵاوی و خزمایەتیەیان وەك عەلی نەبووە، هەرچەندە دەڵێین هەرگیز نابێت و ناكرێت ڕۆڵی عوسمانی كوڕی عەففان(خودا لێیڕازیبێت) لەناو ئیسلامدا لەبیربكرێت و فەرامۆش بكرێت.

عەلی(خودا لێیڕازیبێت) هەستی دەكرد لای پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) چەند خۆشەیستە، دەیزانی پلەو پایەی تایبەتی هەیە لای ئەو، تەنانەت جارێكیان هەستی بەسۆزێك و خۆشەویستیێكی تایبەتی پێغەمبەر كرد(درودی خودای لەسەربێت) بۆیە پرسیاری كردو گوتی:

كامیان خۆشەویسترە لای پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) فاتیمەی كچی، یان عەلی هاوسەری كچەكەی؟.

پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) فەرمووی:

فاتیمە لام خۆشەویست ترە لەتۆ، تۆش ئازیزتری لە ئەو.

پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) ئەوەندە فاتیمەو عەلی و كوڕەكانی خۆشویستوە، بۆیە هەر جارێك لە نزیك ماڵی عەلی تێپەڕبووبێت، ئەگەر كات ڕێگر نەبووبێت، نەیتوانیوە لانەدات و بە دیداریان شاد نەبێت و سۆزو خۆشەویستی خۆی بۆیان دەرنەبڕێت، تەنانەت جارێكیان بینی كچەكەی و عەلی خەوتوونە، حەسەنی

کوڕیان دەگری، باوکی بەسۆزو دڵسۆز لەدڵی نەهات ئەم دوو ئازیزە خەوتووانە بە ئاگابێنێت، بەڵکو بەخێرایی چوو ئەو مەڕەی لە ماڵەکیان بوو دۆشی، شیرەکەی دایە حەسەن تا تێربوو ئیدی ژیری کردەوە.

هەروەها ڕۆژێك لەبەردەم ماڵی عەلی تێپەڕبوو، کارێکی بەپەلەی هەبوو، گوێی لەدەنگی گریانی حوسەین بوو، خۆی بۆ نەگیرا چووە ژوورەوە، سەرکۆنەی کچەکەی خۆی کردو فەرمووی:

ئەی تۆ نازانیت گریانی ئەم کوڕە ئازارم دەدات؟.

خۆشەویستی پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) بۆ فاتیمە، کاریگەری زۆری کردبووە سەر ژیانی فاتیمە، ئەو کچە لە منداڵیەوە بەرەنگاری غەم و پەژارەو دەردەسەری و باری قورسی ژیان ببووبووەوە، بەڵام لەمیانەی ئەم خۆشەویستیەی باوکیدا چێژی لە بەختەوەری ژیاندا وەردەگرت، تەنانەت لە ژیانی هاوسەرگیریدا هەرچەندە هەژارو نەداربووبەڵام ئەم خۆشەویستیەی باوکی بۆی ببووبووە مایەی شادی و کامەرانی، هەروەها خۆشەویستی باوکی بۆ دووکوڕەکانی، ئاسوودەیی و بەختەوەری زیاتری پێدەبخشی، بۆیە هەمیشە سوپاسی خودای مەزنی دەکرد بۆ ئەم چاکەیەو بەخششەی بۆی هاتۆتەدی لە میانەی ئەم دوو جگەر گۆشەیەیدا، چۆن بوونەتە مایەی شادی و بەختەوەری بۆ باوکی(درودی خودای لەسەربێت).

هەروەها شادی و ئاسوودەیی عەلی لە فاتیمە کەمتر نەبوو، بەڵکو لە ئاکامی ئەم پەیوەندیە تۆکمەیەی لە نێوان ئامۆزاکەی و ئەودا هەبوو، زۆر شادو بەختەوەربوو، خوێنی لەگەڵ خوێنی پاکی پێغەمبەردا(درودی خودای لەسەربێت) تێکەڵاو بووە، لەرەچەڵەك و نەوەی ئەودا سەرومرترین نەوەی عەرەب دێتەدی، نەوەکانی فاتیمە جیا لە هەموو خەڵکێکی دیکە، بە نەوەو بنەماڵەی پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) داندراوون دەژمێردرێن.



# خۆشەویستی پێغەمبەر بۆ نەوەکانی

دوای حەسەن و حوسەین، فاتیمە گوڵ لە ساڵی پێنجەمی کۆچیدا کچێکی بوو، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێت) ناوینا(زەینەب)، تا یادی کچە کۆچکردوەکەی هەمیشە بە زیندوێتی بمێنێتەوە، چونکە خۆی و فاتیمە هەرگیز زەینەبیان لەبیر نەکردبوو.

دوو ساڵ دوای زەینەب، فاتیمە کچی دووەمی بوو، باوکی(درودی خودای لەسەربێت) ناوینا(ئومکەلسوم)، چۆن وا هەست بکات ئومکەلسومی کچی دووساڵ دوای زەینەب کۆچی دوایی کردبێت، ئیتر فاتیمە لەمیانەی ئەم دوو کچەیدا توانی یادی هەردوو خوشکەکانی زەینەب و ئومکەلسوم بە زیندوویی ڕابگرێت، هەروەکو پێشتر خودای مەزن کردبوویە خاوەنی هەردوو کوڕەکانی پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت)، کاتێ هیچ منداڵی نەبوو، خودای مەزن و کاربەجێ دڵی بەم دوو منداڵە خۆش و شادکرد، تەنانەت تا گەیشتە خودای مەزن، کارەساتی جگەرسووتان و مردنی فاتیمەو منداڵەکانی بەچاوی خۆی نەبینی.

بێگومان هەردوو کوڕەکانی پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) قاسم و عەبدوڵلا زوو سەریان نایەوەو مردن، دوای ئەوانیش لەتەمەنی پیری و بەساڵاچووندا خودای مەزن لەمانگی (ذی الحجة)ی ساڵی هەشتەمی کۆچی چاوەکانی باوکی فاتیمە بە(ئیبراهیم)ی کوڕی سێیەمی ڕۆشن کردەوە، بەڵام خۆشی و شادیەکەی زۆری نەخایاند، مانگی هیواو ڕۆشنکەرەوەی زوو ئاوابوو، بە ئاگری مردنی کوڕی سێیەمی، کە هێشتا مۆمی دووەمی تەمەنی دانەگیرساندبوو، دیسان جگەری سووتایەوە، ئەو کاتە تەمەنی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێت) لە شەست ساڵ زیاتر بوو.

هەروەها سێ کچەکەی زەینەب و ڕوقییە و ئومکەلسوم، لە هـەرەتی گەنجیەتیـدا مردن، باوکی جگەرسووتاویان یەك لەدوای یەك هەرسێ کچەکەی بـەخاکی مەدینـە سپارد، ئـەو خاکەی لەمـەوپێش تـەرمی عەبـدوڵڵای بـاوکی گرتبـووە خـۆی، ئەوسا موحەممـەد(درودی خـودای لەسـەربێت) کۆرپەڵەیـەك بـوو لـە سکی ئامینـەی کچی وەهەبی دایکیدا.

ئیتر لە فاتیمەو منداڵەکانی بەملاوە کەسێکی تـر نـەمابوو شوێنی کۆچکردوان بگرێتەوەو شادی و ئـارامی بـە پێغەمبـەر (درودی خـودای لەسـەربێت) ببەخـشێت و تێنوەتی سۆزی باوکی جگەرسووتاو بشکێنێت، ڕەنگە خودای کاربەجێ، بۆیە تەمەنی فاتیمەی درێـژتر کردبێت لـە خوشکەکانی، تـا یـەکێك هـەبێت بـە پێغەمبـەر بڵێت باوکە تا لە ژیانـدا مابێت، هـەروەها کوڕەکانیـشی بۆیـە ژیـان، تـا پێغەمبـەری مـرۆڤ (درودی خودای لەسەربێت) بە درکانـدنی وشـەی کوڕەکـەم بەختـەوەربێت، هـەروەها هـەردوو کـچەکەی فاتیمـەش زەینـەب و ئومکەلـسوم ئـەم دوو ناوەیـان گەڕانـدەوە سەرزاری باپیرەیان، دوای ئەوەی ماوەیەك بوو ئەم ناوانەی بەسەر زاردا نەهاتبوو.

مێـژووی مرۆڤایـەتی لێکۆڵینـەوەی زۆری لەسـەر باوکایـەتی ئـەم پێغەمبـەرە مرۆڤـە(درودی خـودای لەسـەربێت) ئەنجامـداوە، بەتایبـەتی سـەبارەت بـەم سـۆزو خۆشەویستیە سازگارو بێ گەردەی لە دڵ و دەروونی ئەم مرۆڤە بەرزەدا هـەڵقوڵاوە، مرۆڤایـەتی لـە هـەموو کون و کەلەبـەرێکی تایبـەت بـە خۆشەویـستی ئـەم مەزنـەی کۆڵیتەوەو هەموو ڕەفتارێکی بە هەند وەرگرتووە، بێگومان ئەمەش بەڵگەی ئاشکراو ڕوونـە لەسـەر گـەورەو مـەزنی ئـەم پیـاوە پـیرۆزە، کەواتـە بۆیـە لـە ئاسمانـەوە هەڵبژێردراوە بۆ گەیاندنی پەیامی پیرۆزی خودای مەزن و کاربەجێ.

بۆ سەرجەم مرۆڤایـەتی ئەسـتەمە ئـەم هەڵوێـستەی پێغەمبـەر(درودی خـودای لەسەربێت) لەبیربکەن، بگـرە هەتاهەتایـە ئـەم بەسـەرهاتە شکۆدارە هەمیـشە دێتـە وروژان و هەرگیز لەبیر ناکرێت، چۆن کاتێ پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) لە



بازاڕی مەدینەدا دەڕۆیشت، یەکێك لەنەوەکانی لەسەر شانی خۆی دانابوو، تەنانەت ئەو گەیشتە لای مزگەوت بانگدرا بۆ نوێژکردن، ئیتر زۆر بە هێمنی نەوەکەی لە تەنیشت خۆی داناو پێشنوێژی بۆ موسڵمانان کرد، بەڵام لەناکاو خەڵکەکە سەرسامبوون کە بۆچی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێت) سەری لە کڕنووش(سەجدە) بەرز ناکاتەوە و ماوەکەی درێژکردەوە، ئیدی کاتێ نوێژەکەیان تەواو کرد، گوتیان:

ئەی پێغەمبەری خودا(درودی خودای لەسەربێت) تۆ کڕنووشێکت درێژ کردەوە تەنانەت پێمانوابوو شتێك ڕوویداوە یان(وەحیت) بۆ هاتووە، فەرمووی:

ئەوانە هیچیان نەبوو، بەڵکو کوڕەکەم خۆی خستە سەر پشتم، منیش حەزم نەکرد لایبەرم هەتا خۆی هاتە خوارەوە.

یان ڕۆژێکیان پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) لە مزگەوت خەریکی وتاردانبوو بۆ موسڵمانان، حەسەن و حوسەین کراسێکی سووریان لەبەردابوو هاتنە ژوورێ، لەبەر بچووکیان دەڕۆیشتن و دەکەوتنە خوارەوە، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێت) لە (مینبەرەکەی) هاتە خوارەوە، لەباوەشی خۆی گرتن، لەپێش خۆی داینان، گەڕایەوە سەر وتارە پیرۆزەکەی، بەڵام لە پێشدا فەرمووی:

خودا ڕاستی فەرمووە: ماڵ و منداڵتان مایەی تاقیکردنەوەن بۆ ئێوە، سەیری ئەم دوو منداڵەمکرد دەڕۆیشتن و دەکەوتنە خوارەوە،ئارامم نەما تەنانەت وتارەکەی خۆمم بڕی، ئەوانم بەرزکردەوە.

هەروەها ئەم وێنەیە هەرگیز لەیاد ناکرێت، کاتێ پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) هەردوو شانی حوسەینی گرتبوو، پێیەکانیشی خستبووە سەر پێیەکانی خۆی، سەمای پێدەکردو دەیفەرموو: ترق،ترق،حوسەینیش بەرز دەبووەوە تا پێیەکانی دەگەیشتە سەرسنگی باپیرەی، ئیدی ئەو کاتە دەیفەرموو: دەمت بکەرەوە، حوسەینیش دەمی دەکردەوە، باپیرەی ناو دەمی ماچ دەکرد، دەیفەرموو: خودایە من

خۆشمەوێ تۆش خۆشتبوێت، ئەوەی خۆشیدەوێت خۆشت بوێت.

هەروەها ئاخۆ مرۆڤایەتی چۆن ئەم هەڵوێستە لەبیر دەکات، کاتێ پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) لەگەڵ یەکێك لە یاوەرەکانی بانگێهێشتی سەر خوانێك کرابوون، لە ڕێگادا بینی حوسەین لەگەڵ چەند منداڵێکی هاوتەمەنی خۆی یاری دەکات، بۆلای حوسەین چوو، بەڵام حوسەین بە پێکەنینەوە ڕایکرد، ئیتر باپیرەی(درودی خودای لەسەربێت) لێرەو لەوێ بەدوای ئەودا ڕایکرد، تەنانەت دواجار گرتی، دەستێکی خستە ژێر ملیەوە، دەستەکەی تری خستە ژێر چەناگەی، پاشان ماچی کردو فەرمووی: حوسەین لەمنەو من لە حوسەینم، خودایە ئەوەی حوسەینی خۆشبوێت خۆشتبوێت. ئەو خەڵکەی لەوێ وەستابوون بەچاوی ڕێزو گەورەییەوە سەیریان دەکرد، یەکێك گوتی:

دەبینم پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) بەمجۆرە لەگەڵ نەوەکەی یاری دەکات، بەخودا من کوڕێکم هەیە هەرگیز ماچم نەکردووە.

پێغەمبەری مرۆڤ(درودی خودای لەسەربێت) ئەم دڵڕەقیەی پیاوەکە بە پەسند نازانێت و دەفەرموێت:

ئەو کەسەی بەبەزەیی نەبێت، بەزەیی لەگەڵدا نانوێنرێت.

# سەرکەوتنی مەزن

فاتیمە بەچاوی خۆی بینی چۆن زۆربەی ناوچەکانی نیمچە دوورگەی عەرەبی بە ڕووناکی ئایینی نوێ ڕۆشن بۆتەوە، ئیدی خەریکە موسڵمانان لەسەرکەوتنی یەکجارەکی نزیك دەبنەوە، ئەو سەرکەوتنەی خودای مەزن بەڵێنی پێداون، ئیدی کەوتە خۆ ئامادەکردن و خۆ سازدان، چونکە بەم نزیکانە دەگەڕێتەوە بۆ نیشتمانەکەی، بۆ شاری مەککە شوێنی لە دایکبوونی، کە هەشت ساڵە لێی دابڕاوە،

شەوێکیان فاتیمە لەگەڵ هاوسەرەکەی خەو لە چاوەکانیان زڕابوو، یادەوەریەکانی ڕابردووی سەردەمی منداڵیان دەهاتەوە یاد، تەنانەت تا ئەو کاتەی کۆچیان کردبوو لە مەککە، دوایی دەیانگوت ئاخۆ شاری مەککە دوای ئەم هەموو ساڵەی جێیانهێشتووە وەك خۆی ماوەن یان گۆڕاوە؟، ئاخۆ خانووەکان و شوێنی لە دایکبوونیان دەبێ وەکو خۆی مابێتەوە؟، یان دوژمنان وێران و خاپووریان کردووە، ئێستا کەلاوەو وێرانگەیە؟.

ئەی(کەعبە)ی پیرۆز، ئاخۆ وەك جاران کۆترە سپیە جوانەکان بە دەوریدا باڵە فرکێ دەکەن و لە سایەیدا بەو پەڕی سەربەستی و ئازادی دەژین، یان لەترسی بت پەرستیو نەزانی و گومڕاییدا خەمۆکین و بە کزوماتی سەریان لەژێر باڵەکانیاننناوە.

ئاخۆ شوێنی یاریەکان، کەندو دۆڵ و شیوەکان، ڕێگاو بان و ڕەوەزە شاخەکان، یادی خۆشەویستانیان بیرماوە، یان بە تێپەڕبوونی ئەم چەند ساڵە لەبیریان کردوون و ئێستا نایاناسنەوەو وەڵامیان نادەنەوە.

ئەی هەوارگەی خەدیجە، گۆڕی ئەبوتالیب و خزم و ئازیزانی تر، دەبێ ئێستا لاشەی مردووە ڕێزدارەکانی تێدا مابێت، یان گاورە ستەمکارەکان گلکۆکانیان تاڵا کردۆتەوەو ئێسك و پروسکەکانیان پەرت و بڵاوکردوون؟.

ئیتر درەنگی شەوبوو هەردوو هاوسەر لەناو دەریای یادەکاندا مەلەیان دەکرد، لەپڕ لەدەرگای ماڵەکەیاندرا، عەلی(خودا لێیڕازیبێت) چوو دەرگاکە بکاتەوە، فاتیمەش چاوەکانی هێشتا لێل و مەستی یادەکانبوو، دەرگاکەیان کردەوە، بینیان سەرکردەی گاورانی قوڕەیش ئەبوسوفیانی کوڕی حەرب هاوسەری جگەر خۆری شەهیدانی ئوحود لەبەردەمیان وەستاوە، ئەو پیاوە قین لەدڵەی هەمیشە قوڕەیشیەکانی هاندەدا، تا ئێسك و پروسکی ئامینەخانی دایکی پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت)فڕێبدەنە دەرەوە بەڵکو نەختێك برینەکانیان سارێژبێت و تۆزێك ڕقەکانیان دامرکێتەوە.

ئەبوسوفیان دوای ئەوەی هاتە ژوورەوە گوتی:

بیستوومانە موحەممەد خۆی ئامادەکردوەو هێزی گەورەی پێکهێناوە دەیەوێت شاری مەککە داگیر بکات، منیش بۆ ئەوە هاتوومەتە لاتان بەڵکو بتوانن خەڵك لەپەنای خۆتان بنێن و داڵدەمان بدەن و بمانپارێزن، بۆ ئەم مەبەستەش چوومەتەلای (ڕەملە)ی کچم، واتە(ئوم حەبیبە)ی هاوسەری موحەممەد، بەڵام کاتێ ویستم دابنیشم ئوم حەبیبە ڕایەخەکەی لەژێر دەرهێنام، پێیگوتم تۆ گاوری نابێ لەسەر ئەم ڕایەخەی پێغەمبەر دابنیشیت، ئیتر بەدڵێکی پڕ خەفەتەوە چوومە لای موحەممەد، بەڵام ئەویش هیچ وەڵامی نەدامەوە، بۆیە ناچاربووم چوومەلای ئەبوبەکر ئەویش بەهەمان شێوە، پاشان چوومەلای عومەر بەڵکو ئەو بتوانێت ئەم داوایەم بۆ لە موحەممەد بکات، بەڵام عومەر گوتی:

دەتەوێ من پاکانەت لەلای پێغەمبەر بۆ بکەم؟سوێندم بەخودا گەر تەنیا ئەسپەکەم بمێنێت ئەوا من لەگەڵ ئێوە هەر دەجەنگێم!.

ئەبوسوفیان نەختێ بێدەنگبوو، دوایی هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشاو گوتی:

کوڕی ئەبوتالیب، من دەزانم تۆ بۆمن لە هەموویان دڵسۆزتری، من بۆ ئەم کارە پێویستە هاتوومەتەلات و نابێ بمگەڕێنیتەوە دواوە، وەکو ئەوانەی تر نائومێدم مەکە، دەبێ لای موحەممەد پاکانەم بۆ بکەیت.

عەلی(خودا لێیڕازیبێت) گوتی:

ئەبوسوفیان، کاتێ پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) بیەوێت کارێك ئەنجام بدات، بەخودا ئێمە ناتوانین داوای لێبکەین ئەنجامی نەدات.

حەسەن لەگەڵ دەنگە دەنگی ئەوان لەخەو هەستابوو، لە پێش دایکی گاگۆڵەی دەکرد، دایکیشی بە بێ دەنگی لەوێ وەستابوو، ئەبوسوفیان سەیری فاتیمەی زەهرای کردو گوتی:

کچی مەحەممەد، تۆ دەتوانی بەم کوڕە بچکۆڵەیەت بڵێیت خەڵك لە پەنای



خۆی دالّدە بدات، بەڵکو بۆ هەتاهەتایە بۆی ببێتە مایەی سەروەری، ئیدی بەم کارەی دەبێتە سەروەری عەرەبەکان.

فاتیمە بەهێمنی گوتی:

بەخودا کوڕەکەی من نەگەیشتۆتە ئەم ڕادەیە بتوانێت یارمەتی کەس بدات و لەپەنای خۆی دالّدەیان بدات، بەڵام ئەوەش بزانە یارمەتی هیچ کەسێك نادرێت و پەنا نادرێت کە دژی پێغەمبەر بێت(درودی خودای لەسەربێت).

ئیتر ئەبوسوفیان بە دڵشکاوی هەستا ڕۆیشت، بەڵام لەبەردەرگا تۆزێك وەستاو گوتی:

باوکی حەسەن، وابزانم دەرەنجامێکی توندو دژوار چاوڕوانمانە، بۆیە ئامۆژگاریم بکە چیبکەم؟!.

عەلی(خودا لێیڕازیبێت) گوتی:

بەخودا نازانم چی بڵێم، نازانم چ ڕێگایەکت پی بڵێم سودی بۆتۆ هەبێت ، بەڵام تۆ سەرکردەو سەروەری تیرەی کەنانەی، بچۆ داوای یارمەتی و پەنادان لە خەڵك بکە، ئینجا بگەڕێرەوە وڵاتی خۆت.

ئەبوسوفیان گوتی:

جا پێتوایە ئەم کارە هیچ کەڵك و سوودی هەیە بۆم؟!.

عەلی(خودا لێیڕازیبێت) بێدەنگبوو، دوایی گوتی:

نا بەخودا، پێموایە هەمووی بێ سوودە، بەڵام لەوە زیاتر هیچی ترم پێناکرێت بۆتۆ.

ئیدی ئەبوسوفیان ڕۆیشت بەو هیوایەی ئامۆژگاریەکەی عەلی جێبەجێ بکات، عەلیو فاتیمەش دوای داخستنی دەرگاکە سەبارەت بە ژیان و ڕۆژگار کەوتنە گفتوگۆ، ئەم هاتنەی ئەبوسوفیانیان زۆر بەلاوە سەیربوو، بۆیە دەیانگوت ڕۆژگار چۆن دەڕوات و چۆن تێپەڕدەبێت، تەنانەت بەشێکی شەو تێپەڕبوو، ئینجا خەو

پێڵوی چاوەکانی گرتن، ئیتر بەهیوای خەو ببینین و گەڕانەوە بۆ مەککەو کەعبەی پیرۆزو مەڵبەندو هەوارگەی قورەیشیەکان خەوتن.

پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) لەگەڵ دەهەزار موسڵمانی چەکدار، لەشاری مەدینەوە بەرەو شاری مەککە بەڕێکەوت، ئەو شارەی هەشت ساڵ لەمەوبەر بە تەنیا خۆی و خەزووره ڕاستگۆکەی، یاوەری خۆشەویست و ڕێزدار، تەنیا بۆ ڕزگارکردن و پاراستنی ئایین و گیانیان بە نهێنی لە تاریکی شەودا کۆچیان تێیدا کردو جێیانهێشت.

فاتیمەش بەیاوەرێتی چەند هاوسەرێکی پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت)، بە هیوای بینینی گەڕانەوەی سەرکەوتوانە و سەرکەوتنی مەزنی چاوەڕوان کراو، لەگەڵ لەشکرەکە دەرچوو، لەڕێگادا کاتێ چاوی بەم شوێنە کەوتەوە کە چۆن خۆی و ئومکەلسومی خوشکی خەریکبوو لەکاتی کۆچکردنیان بۆ شاری مەدینە لەوێ بفەوتێن، بەم یادەوەریەوە کەوتە ناو سەرجەم یادەوەریەکانی ڕابردووی، ئیدی خەفەت و پەژارە لەدەرگای یادەکانیدا چوونە ناو بیرو هەستیەوە، ڕوقیەو زەینەبی بیرکەوتەوە، چۆن ئەوانیش وەکو ئەو لە مەککەوە کۆچیان کردبوو، بەڵام ئەوان جارێکی دیکە نەگەڕانەوە باوەشی ئەم شوێنەی تێیدا لەدایکبوون و پەروەردەبوون، ئەوان ئێستا لە مەدینە ژێرخاك کراون، ئیدی بە درێژایی ڕێگاکە تارمایی و وێنای ئەم دوو خوشکەی، هەمیشە هۆگرو هاودەمی بوون، تەنانەت لە مەککە نزیك کەوتنەوە گەیشتنە ناوچەی(مر الظهران)،

پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) لەشکرەکەی لەم شوێنە ئۆردوبەز کرد، چاوەڕوانی شەڕێکی یەکلاکەرەوە بوو، بۆیە لەم شوێنە کەوتە چاودێری چڕ و ڕێکخستنی لەشکرەکە.

خۆر زەردەی مابوو هێشتا تەواو ئاوانەبووبوو، لەناکاو ئەبوسوفیانی کوڕی حەرب، هەڵگری ئاڵای لەشکری قورەیش، ئەم شەوە هات لە دەرگای چادری



پێغەمبەر(درودی خودای لێبێت) وەستا، چاوەڕوانی وەڵامێك بوو سەبارەت بە خەڵکی مەککە، بەڵام بەیانی لەگەڵ کازیوە چووەلای موحەممەد(درودی خودای لەسەربێت) موسڵمانبوونی خۆی ڕاگەیاند، دوای ئەوە گەڕایەوە کاتێ گەیشتەوە شاری مەککە، لە شوێنێك وەستاو گوتی:

ئەی کۆمەڵانی قوڕەیش، ئەوا موحەممەد بە جۆرێك هات بۆلاتان، ئێوە تواناتان نیە لە بەرامبەریدا بوەستن، جا ئەوەی بێتە ماڵی ئەبوسوفیان با لەخۆی نەترسێت، ئەوەی دەرگای ماڵەکەی خۆی لەسەرخۆی دابخات با لەخۆی نەترسێت، ئەوەی چووە ناو بەیت با لەخۆی نەترسێت.

ئیدی خەڵکەکە پەرت و بڵاوبوون، ئەوەی چووە ماڵی خۆی و ئەوەی چووە ناو مزگەوتی پیرۆز.

پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) لە ئەسپەکەی سواربوو، لە ناوچەی(ذی طوی) لە نێوان گەورە یاوەرانی وەستابوو، ملی خۆی کەچ کردبوو بۆخودای مەزن، چۆن بەمجۆرە ڕێزی گرتووەو ئەم کارە مەزنەی بۆ ڕەخساندووە، بەڕادەیەکی ئەوتۆ ملی بۆ خودای کاربەجێ چەماندبووەوە، تەنانەت مووی ڕیشی پیرۆزی خەریکبوو بگاتە پشتی ئەسپەکەی.

بۆ چوونە ناو شار دووبارە لەشکرەکەی ڕێکخستەوە، هەریەك لە گەورە یاوەرانی کردە سەرکردەی تیپێك، ئاڵای لەشکرەکەی لە دەست یاوەری ڕێزدار سەعدی کوڕی عوبادە بوو (خودا لێیڕازیبێت)، پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) فەرمووی: عەلی، بچۆ ئاڵاکە لە سەعد وەربگرە، تۆ بە ئاڵاوە برۆ ژوورەوە.

(دەبێ ئەوە بزانین عەلی ـ خودا لێیڕازیبێت ـ لە شەڕی خەیبەردا هەڵگری ئاڵای ـ باز ـ بووە کە یەکەم ئاڵای پێغەمبەر بووە ـ درودی خودای لەسەربێت ـ ، هەروەها لە شەڕی بەنوقورەیزەدا، لە شەڕی ئوحد هەڵگری ئاڵای کۆچبەران بووە).

# ڕزگارکردنی شاری مەککە

سەرتاپای شاری مەککە ڕزگار کرا، پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) چووە ناو شارەکە، لە نزیک گڵکۆی خەدیجە(خودا لێیڕازیبێت) چادرێکی گەورەیان بۆ خانەوادەی پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) هەڵدا، فاتیمەش چووە ناو ئەم چادرە گەورەیە، لە خۆشی و شادیا سەرجەم خەمو پەژارەکانی لەبیر چووبووەوە،بگرە لەم کاتەوە خەفەت و پەژارەکانی بەلاوەنا کاتێ بەم شوێنەدا تێپەڕبوو کە(حویرس) وڵاخەکەی لەکاتی کۆچکردندا خستە خوارەوەو فاتیمەی فڕێدایە سەرزەوی.

باوکی زەهرا(درودی خودای لەسەربێت) ئەم ڕووداوەو کارەساتەی لەبیر نەکردبوو، فەرمانی بە سەرکردەکان کرد: شەڕ نەکەن تەنیا لەگەڵ ئەوانە نەبێت بەرەنگاریان دەبنەوە، بەڵام ناوی چەند تاوانبارێکی جیاکردەوەو فەرمانی کوشتنی دان، فەرمووی دەبێ بکوژرێن، تەنانەت ئەگەر لەژێر سایەی دیواری کەعبەی پیرۆزیشدابن، یەکێك لەم تاوانبارانە حویرس کوڕی مونقیز بوو بەدەستی عەلی هاوسەری زەهرا کوژرا.

لە ڕۆژی ڕزگارکردنی مەککەدا چیاکانی دەوروبەری هاتبوونە هەژان لەئاست شکۆمەندی و مەزنی موسڵماناندا، کاتێ هەموویان دەهەزار کەس بەیەك دەنگ، پڕ بەدەم هاواریان دەکردو دەیانگوت:

(الله أكبر الله أكبر، لاإله إلاالله وحده، نصر عبده، وأعز جنده، وهزم الاحزاب وحده، لاإله إلاالله والله أكبر). واتە:(خودا گەورەترین و مەزنترینە، هیچ خودایێك نیە تەنیا یەك خودا نەبێت، یارمەتی بەندەی خۆی داوە، سەربازەکانی خۆی بەهێزکرد، بەتەنیا بوو هاوپەیمانانی تێکشکاند، هیچ خودایێکی تر نیە تەنیا خودا نەبێت، خودا گەورەترین و مەزنترینە).



دوای ڕزگارکردنی شارەکە، پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) چووەلای چادرەکەی زەهرای کچی تیایدا چاوەڕوانی بوو، ئوم هانی کچی ئەبوتالیب هاوسەری هبیرەی کوڕی ئەبو وەهەبی ئەلەخزومی بوو، دەڵێ:

کاتێ پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) چووە سەرووی شاری مەککە، لەوێ دابەزی، دوو پیاوی بنەماڵەی مەخزومیەکان ڕایانکردبوو، خۆیانکرد بەماڵی ئێمەداو هانایان بۆ من هێنا تا لەپەنای خۆم داڵدەیان بدەم، (ئیبن هوشام لە کتێبەکەی خۆیدا ئاماژە بۆ ئەم دوو پیاوە دەکات و دەڵێ ـ الحارث کوڕی هوشام و زوهەیر کوڕی ئومەییە کوڕی ئەلوغەییەرە بوون)، ئومهانی گوتی: عەلی برام هاتە ژوورەوە، چاوی بەم دوو پیاوە کەوت، گوتی بەخودا دەیانکوژم، منیش دەرگای ماڵەکەم لەسەر دووپیاوەکە داخست و چوومەلای پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) شوێنەکەی لە سەرووی مەککەبوو، کاتێ چوومە ژوورەوە بینیم فاتیمەی کچی ڕاوەستابوو، کراسەکەی باوکی کردبووە پەردە و داپۆشیبوو دیاربوو باوکی خۆی دەشووشت، دوای خۆ شووشتنەکەی باوکی کراسەکەی لە فاتیمە وەرگرت و کردیە بەرخۆی، پاشان هەشت(ڕەکەعات) چێشتە نوێژی کرد، دوای ئەوە هاتەلای من و فەرمووی:

بەخێربێیت ئەی ئومهانی، بۆچی هاتوویت؟.

منیش باسی دوو پیاوەکەو عەلیم بۆی گێڕایەوە، فەرمووی:

ئەوەی تۆ پەناتداوە ئێمەش پەنای دەدەین، ئەوەی تۆ ئەمینت کردوە ئێمەش ئەمینی دەکەین، بۆیە نایانکوژێت ـ مەبەستی عەلی بوو.

پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) پشووێکی کەمی کردو لەژێر چادرەکەی خۆی مایەوە، بۆ ئەوەی شەپۆلی ڕزگاریخوازی هەڵقولاو ئۆقرەو ئارام بێتەوەو خەڵکەکە هەست بە سرەوتن و ئارامی و دڵنەوایی بکەن، دوای ئەم پشووە کورتە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێت) بەرەو ماڵی پیرۆزی خودا چوو، لەناو ئاپۆرەی

خەڵکدا بەسەر پشتی وشترەکەیەوە حەوت جار بە چواردەوری کەعبەی پیرۆزدا سووڕایەوە، پاشان فەرمووی دەرگای کەعبە بکەنەوە، چوو لەناو دەرگاکە وەستا، بەبۆنەی ڕزگارکردنی شاری مەککە وتارێکی بۆ خەڵکەکەدا، لە کۆتایی وتارەکەیدا فەرمووی:

ئەی کۆمەڵانی قورەیش، پێیتانوایە من چیتان لێدەکەم؟.

گوتیان:

چاکەمان لەگەڵ دەکەیت، برایێکی چاك و برازاییێکی چاکی.

فەرمووی:

بڕۆن ئێوە ئازادن.

ڕۆژی ڕزگارکردنی شاری مەککە ئاووهەوا زۆر گەرم بوو، بەڵام دوای خۆرئاوابوون شنە بایێکی فێنك هەڵیکرد، شاری مەککەی پیرۆزیش باوەشی بۆ کۆچبەرە گەڕاوەکان و سەرجەم موسڵمانان و یاوەران کردبووەوە، خەڵکێکی زۆری گرتبوەخۆی‌و جموجۆڵی پێوە دیاربوو، ئاسمان پارێزگاری ئەم ژمارە زۆرەی خەڵکی دەکرد، هەرگیز نەبینرابوو پێغەمبەرێکی سەرکردە بەم شێوەیە خەڵك بەدەوریدا کۆببێتەوە، فریشتەکان باڵەفڕیان بوو، پیرۆزباییان لە لایەنگرانی خودای مەزن دەکرد بەبۆنەی سەرکەوتنیان بەسەر لایەنگرانی شەیتان.

فاتیمە(خودا لێیڕازیبێت) جێگاکەی نزیکبوو لەجێگای باوکی(درودی خودای لەسەربێت)، گەرچی لەناو پێخەفەکەیدا ڕاکشابوو، بەڵام ئەمشەوە خەو نەچووە چاوانی و نەخەوت، چونکە خەدیجەخانی دایکی کەوتەوە یاد، چۆن ئێستا لە بەرزایی ئاسمانەوە سەیری هاوسەرە خۆشەویستەکەی دەکات، ئەم حەزو ئاواتەو شادی و سەرومریەی بردە ژێر گڵ، ڕزگارکردنی شاری مەککەی بەچاو نەبینی، دوو خوشکە کۆچکردووەکەی بیر کەوتەوە، چۆن لە مەدینە نێژراون و هەرگیز نەگەڕانەوە بۆ مەککە، بەڵام ئێستا گیانیان باڵندە ئاسا بەسەر شاری مەککەداو

بـەدەوری خۆشەویـستان و کەسـوکاریاندا دەخولێنـەوەو دێـن و دەچـن، بەشـداری خۆشیو شادی ئەم سەرکەوتنە مەزنەیان کردووە.

فاتیمـە زۆر خەفەتبارو نیگەرانبوو بـۆ دایـك و خوشکەکانیسـەردەمی منـداڵی بیرکەوتەوە، چۆن بە بەختەوەری و کامـەرانی ژیانیـان لـە سایەی خێزانێکـی پـڕ لـە ئاسوودەیی و بەختەوەردا دەبردەسەر.

فاتیمە ویستی ئەم شەوە پێلوی چاوەکانی لـە یـەك نـەنێت و نەخـەوێت، هەتا گوێی بەدەنگی زوڵاڵی بیلال دەزرنگێتەوە، کاتێ بۆ یەکەم جار لە مێژووی ئیسلامدا، لەسەر پیرۆزترین مزگەوت سەرتاپای گەردوون دێنێتە هەژان و بانگی نوێژی بەیانی دەدات، موسڵمانانیش بۆیەکەم جار نوێـژی بـەیانی لـە ماڵی هەرە دێرینـی خودای کاربەجێدا دەکەن، ئەو ماڵەی لە دوێنێوە لە بتەکان پاك کراوەتەوە.

عـەلی(خـودا لێیڕازیبێـت) خـەریکی خـۆ ئامـادەکردن بـوو تـا بـۆ نوێـژی بـەیانی بچێت، گوتی:

دایکی حەسەن ئەوە تۆ تا ئێستا نەخەوتوویت!؟.

لە وەڵامەکەیدا کاریگەری شەونخوونی و نەخەوتنی پێوە دیاربوو، گوتی:

ویـستم تـام و چێـژی گەڕانـەوەم بـۆ مەککـەو ئـەم سـەرکەوتنە مەزنـە بـچێژم، چونکە پێموابوو ئەگەر بێتو بخەوم ڕەنگە بـە خـەون ئـەم تـامو چێژە بکەم، بۆیـە ویستم لەگەڵیدا بژیم و هەستی پێبکەم.

ئـیتر دوای ئەمـە فاتیمـە هەسـتا نوێـژی بـەیانی کـرد، دوای ئـەوە سـەرخەوێکی شکاندو نەختێ چاوەکانی گەرم کرد دوای ئەوەی بە درێژایی ئەم شەوە نەخەوتبوو.

فاتیمـە ئاواتـەخوازبوو جـارێکی تـر چـاوی بـەم خـانووە بکەوێتـەوە تێیـدا لـە دایکبووبـوو تەمـەنی منداڵیـەتی تێیـدا بردبووەسـەر، شـوێنی پـەروەردکردن و یاریـەکانی بـوو، هـەروەها عـەلی هاوسەریـشی لـەم خـانووەدا ژیـانی منداڵیـەتی بردبووەسەر، چونکە پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) بـەخێوی کردبـوو، بـەڵام



خانووەکەیان لەدوای کۆچکردنیان، عوقەیلی کوڕی ئەبوتالیب چووبووە ناوی و کردبوویە خانووی خۆی.

ئەم ڕۆژە لە پێغەمبەریان(درودی خودای لەسەربێت) پرسیار کرد، ئایا ناچیتەوە ناو خانووەکەی خۆت؟.

لە وەڵامدا فەرمووی:

بۆ عوقەیل خانووەکەی بۆ ئێمە جێهێشتووە؟!.

زەهرا لە دڵی خۆیدا دەیگوت، ئاخۆ باوکم چ خانووێک دەکاتە هەوارگەی خۆمان؟.

هەروەها لایەنگران و پارمەتیدەرانی خەڵکی مەدینە، پێیانوابوو پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت)، دوای ڕزگارکردنی شاری مەککە ئیدی ناگەڕێتەوە شاری مەدینەو لە مەککە نیشتەجێ دەبێت، چونکە هەستیان کرد پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) بە موسڵمانبوونی قوڕەیشیەکان زۆر شادو کامەرانە، تۆڵەی ئەشکەنجەدان و دەربەدەری لێ نەسەندنەوە، بەڵکو دەستی ئاشتی و برایەتی خستە ناو دەستیانەوە، هەروەها زۆر ئاسوودەو کامەرانە بە هاتنەوەی بۆ شاری مەککە، تەنانەت یەکێکی خەڵکی مەدینە گوتی:

بەخودا پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) گەیشتەوە ناو هۆزەکەی خۆی!.

هەروەها حەسانی کوڕی سابت شاعیرێکی شاری مەدینە بوو، لە شیعرێکیدا گلەیی دەکرد سەبارەت بە دابەشکردنی دەسکەوتی جەنگ، کە زیاتر دراوە بە قوڕەیشیەکان گوتی:

وأت الرسول وقل یاخیر مؤتمن — قدام قوم أووا وهم نصروا

علام تدعی سلیماً وهي نازحة — للمؤمنین اذا ماعدل البشر



سماهم الله أنصاراً بنصرهم دين الهدى وعوان الحروب تستعر[1]

فاتیمەش وەك سەرجەم خەڵكی مەككە ئاسا ئەم شیعرەی حەسانی بیست، گوتی:

ئەم شیعرەی حەسان ئەنجامێكی لێدەكەوێتەوە.

ئەم هەڵوێستەی حەسانی بەلاوە ناخۆشبوو، بەڵام دڵنیابوو باوكی(درودی خودای لەسەربێت) چارەی ئەم گلەییە دەكات و دڵی لایەنگران ڕازی دەكات،بەلم فاتیمە نەیدەزانی باوكی چ جۆرە چارەیەكی بۆ ئەم گلەییە داناوەو داڕشتووە،تەنانەت ئەو كاتەی سەعدی كوڕی عوببادە هاتەلای باوكی، سكالاو گلەیی لایەنگرانی مەدینەی بۆ باسكرد، باوكی فەرمووی:

سەعد تۆ هەڵوێستت چۆنە؟.

سەعد(خودا لێیڕازیبێت) گوتی:

ئەی پێغەمبەری خودا(درودی خودای لەسەربێت) من لەگەڵ میللەتەكەی خۆمم.

پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) لەم هەڵوێستەی سەعد هیچ نیگەرانی و زویربوونی پێوە دیارنەبوو،بەڵكو خۆشەویستی بۆ نواند،داوای لێكرد میللەتەكەی خۆی كۆبكاتەوە، دوای ئەوەی سەعد سەرجەم خەڵكی مەدینەی كۆكردەوە، پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) چووەلایان، پاش ستایش و سوپاس كردنی خودای مەزن و پڕتوانا، فەرمووی:

ئەی كۆمەڵانی لایەنگر، ئەوەی ئێوە گوتووتانە پێم گەیشتووە، سەبارەت بەمن بیرو ڕایەك و سەرنجێكتان لەدڵدا هەیە؟، ئەی ئێوە نەبوون گومڕابوون، من

---

([1]) ابن هشام: ٢/٤٩٧ والبداية والنهاية: ٤/٣٠٣.

هاتمەلاتان خودا ئێوەی کردە موسڵمان؟، هەژاربوون خودا دەوڵەمەندی کردن، دوژمنی یەکتربوون خودا دڵەکانی بەیەکەوە سازاندو کۆیکردنەوە.

لە وەڵامدا گوتیان:

بەڵێ خوداو پێغەمبەر باوەڕپێکراو و چاکترن.

فەرمووی:

لایەنگران بۆ وەڵامم نادەنەوە؟!.

بە پەرۆشەوە گوتیان:

چ وەڵامێکت بدەینەوە ئەی پێغەمبەری خودا(درودی خودات لەسەربێت)، هەموو چاکەیەك و بەخششێك لەلایەن خوداو پێغەمبەرەکەیەتی(درودی خودای لەسەربێت).

ئیتر لایەنگران لەمە زیاتریان نەگوت، پێغەمبەری دڵفراوان(درودی خودای لەسەربێت) فەرمووی:

بەخودا گەر بتانەوێت دەتوانن بڵێن و ڕاست دەکەن، خەڵکیش قسەکانتان بەڕاست دەزانن، ئەگەر بێتو بڵێن: کاتێ تۆ هاتیتەلامان بەدرۆیان خستبوویتەوە کەچی ئێمە باوەڕمان پێتکرد، تۆ بەمل کەچی هاتیتەلامان ئێمە لایەنگریمان کردی، تۆ دەربەدەر کرابوویت ئێمە تۆمان وەرگرتەوە، ڕووت و هەژاربوویت پۆشتەمان کردی، ئەی کۆمەڵانی لایەنگران لەخودی خۆتان سەیربکەن بزانن هێندەی چڵەگیایێك توانیوتانە دڵی هۆزێك بۆ ئیسلام ڕابکێشن.کەچی ئیسلامیش بەئێوە سپێردراوە؟، ئەرێ کۆمەڵانی لایەنگران ئێوە بەوە قایل نابن گەر خەڵك مەڕو ووشتر بەرنەوە، ئێوەش پێغەمبەر لەگەڵ خۆتان بەرنەوە؟، سوێندم بەوەی خودی موحەممەدی لەژێر دەستدایە گەر کۆچکردن نەبوایە ئەوا من یەکێکبووم لە لایەنگران، ئەگەر خەڵك هەمووی بەرەو دۆڵێك بچوونایە منیش بەرەو دۆڵێك بچوومایە ئەوا دۆڵی لایەنگرانم دەگرتەبەر، خودایە بەزەییت(ڕەحمەت) بێتەوە بە

لایەنگران و کوڕانی لایەنگران و نەوەکانی لایەنگران.

ئیتر خەڵکەکە ئەوەندە گریان تەنانەت ڕیشیان تەڕبووبوو، هەموویان بەدەنگێکی پڕ لە باوەڕەوە هاواریان کردو گوتیان:

بە پێغەمبەری خودا قایلین بەخت و بەشی ئێمەبێت.

خەڵکی مەککە کاتێ زانیان پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) دەگەڕێتەوە شاری مەدینەی کۆچبەران و ئەوێی بۆخۆی هەڵبژاردوە ئەوانیش وێڕای خەڵکی مەدینە گریان.

ئیتر فاتیمە گوڵ خەریکە شوێنی منداڵی جێدەهێڵێت، پێش ئەوەی کۆچ بکات سەردانی گۆڕی دایکی کرد، فاتیمە سێ مانگ لە مەککە مایەوە، لە مانگی ڕەمەزانی ساڵی هەشتی کۆچی هاتە مەککە، لە کۆتایی مانگی (ذی الحجة)ی هەمان ساڵ لەگەڵ باوکی گەڕایەوە شاری مەدینەی لایەنگران، فاتیمە چۆن لەبیرکەم شەوی ڕزگارکردنی مەککەدا گوتی وەك خەوبینین دێتە بەرچاوم، بێگومان بۆ ئەو ئەم ماوە کورتە وەك خەون وابوو.

بەڵام ئەم خەونە خۆشەی فاتیمە تا نزیکەی دووساڵ درێژەی خایاند، لەم ماوەیەدا بەیانیان و ئێواران چاوەکانی بە دیدەنی باوکی ڕۆشن دەبووەوە، هەمیشە لە سایەی سۆزو خۆشەویستی ئەودا خۆی و منداڵەکانی لە ژیانێکی ئاسوودەو پڕ لە کامەرانیدا دەژیان، تەنانەت لەم ماوەیەدا قەرەبووی ساڵانی پڕ لە جەورو جەفای ڕابردووی کردەوە، نەختێك هێزو تینی هاتەوەبەرعەلی(خودا لێیڕازیبێت)هەندێ دەستکەوتی لە ڕزگارکردنی مەککەدا بەرکەوتبوو، توانی کارکەرێکی بۆ بەکرێ بگرێت، ئیتر فاتیمە کاروباری ماڵەکەی بە کارکەرەکەی سپارد، خۆیشی خەریکی بەخێوکردن و پەروەردەکردنی منداڵەکانی بوو.

# کۆستی گەورە

بەڵام لە کۆتاییدا فاتیمە بەترس و خەفەت و پەژارەوە لەم خەوە شیرینە بە ئاگاهات، چونکە کۆتایی مانگی سەفەری ساڵی یازدەی کۆچی بوو، باوکی(درودی خودای لەسەر بێت) لەناکاو تووشی نەخۆشیێك بوو، بەدەست ئازاری نەخۆشیەکەوە دەیناڵاند، بەڵام سەرجەم موسڵمانان و کەسوکاری پێیانوابوو نەخۆشیێکی سادەیە، تەنیا تەندروستی تۆزێك ناڵەبارەو زۆر ناخایەنێت نەخۆشیەکەی نامێنێت و چاك دەبێتەوە، ئیتر کەس گومانی مردنیان نەدەکرد، بگرە کەس توانای پەی بردنی بۆ ئەم گومانە نەبوو.

فاتیمە هەرگیز گوێی لە باوکی نەبوو (درودی خودای لەسەربێت) ساکاڵاو قسەیەك سەبارەت بە نەخۆشیەکەی بدرکێنێت، بەڵام لەپڕ نهێنییێکی بیر کەوتەوە ئیدی ڕاچڵەکی چۆن ئاگر کەوتبێتە گیانیەوە، بیری کەوتەوە، چەند ڕۆژێك لەمەوبەر کاتێ بەسەردان هاتەلای باوکی(درودی خودای لەسەربێت)، ئەو کاتە باوکی لای عائیشەخان بوو(خودا لێیڕازیبێت)، چاوی بە فاتیمە کەوت کە لەهەموو کەس زیاتر شێوەی لەباوکی دەکرد، هەروەکو عائیشەخان باسی کردوە، باوکی بە هاتنی کچەکەی زۆر شادو دڵخۆشبوو، فەرمووی:

بەخێربێیت کچەکەم، ماچی کردو لەلای ڕاستەی خۆی داینا، بە نهێنی و بە چپەوە پێی فەرموو پێیوایە کاتی هاتووە، فاتیمە گریا، باوکی هێورو ژیری کردەوە، دڵنەوایی کرد دوایی بە نهێنی پێی فەرموو:

تۆ یەکەم کەسی بەدوای منداڍێیت.

هەروەها فەرمووی:

بەوە قایل نابیت تۆ ببیتە سەروەری ژنانی ئەم نەتەوەیە؟.

فاتیمە کاتێ ئەمەی بیست لە خۆشیا پێکەنی.

عائیشەخان(خودا لێیڕازیبێت) لەم کارە سەری سوڕما گوتی:

شتی وەك ئەمڕۆم نەبینیووە، شادی و خەفەت لە یەکتر نزیکبن!.

ئیتر دوای ئەوەی هەلی بۆ ڕەخسا سەبارەت بەم نهێنیە لە فاتیمەی پرسیارکرد ئاخۆ دەربارەی چیبوو؟.

فاتیمە گوتی:

نهێنیەکانی پێغەمبەری خودا(درودی خودای لەسەربێت) ئادرکێنم.

ئەو ڕۆژە فاتیمە بە دڵنیاییەوە گەڕایەوە ماڵەوە، چونکە هەستی کرد باوکی تەندروستی بەرەو چاکتر دەچێت، بەڵام دوای چەند ڕۆژێك بیستی ئێش و ئازاری باوکی ڕووی لە زیادبوونەو باری تەندروستی جێگیرنیە، ئیتر ترساو پەشۆکا، ڕووی لەماڵی باوکی کردو خێرا چوو بۆ ئەوێ، هەستی کرد دڵ و جگەری لەم شوێنە جێماوە کە هەواڵەکەی تێیدا بیست.

سەیری کرد باوکی(درودی خودای لەسەربێت) سەرەڕای ئەم ئێش و ئازارەی هەیەتی، ئارام گرەو دان بەخۆیەوە دەگرێت، تەنانەت وەکو پێشوو بەسەر ژووری هاوسەرەکانیدا دەسوڕێتەوەو مافی هیچ یەکێکیان نافەوتێنێت، تەنانەت گەیشتە ژووری دایکی موسڵمانان (مەیمونەی کچی حارسی هیلالیە ـ خودا لێیڕازیبێت) ژان و ئێشی جەستەی یەکجار کاریگەرو بەهێزبوو، بۆیە داوای لە سەرجەم هاوسەرەکانی کرد، بەڵکو ڕێگای پێ بدەن لە ژووری عائیشەخان(خودا لێیڕازیبێت) بمێنێتەوە.

فاتیمە لەلای باوکی مایەوە، خزمەتی دەکردو شەو بەدیاریەوە شەونخوونی دەکردو نەدەخەوت، زۆر بەسۆزو بەپەرۆش بوو بۆی، کچێکی ئارامگربوو هەمیشە دەمی لەنزاو پاڕانەوە جیانەدەبووەوە، بەڵام کاتێ بینی باوکی(درودی خودای لەسەربێت) ئازارو ژانی توندتر بووە، تەنانەت بەدەستی پیرۆزی خۆی ئاو بەسەری خۆی دادەکات تا فێنکی بکاتەوەو دەفەرمووێت:ئای لەم ئازارو ژانە.

ئیدی فاتیمە ئارامی نەماو بەدەم هەنسکەوە دەیگوت:

خۆزگە ئەم ئازارانەی تۆ بۆمن دەبوو باوکە گیان، خۆمن بۆتۆ دڵ پڕ لە ئازارم.

باوکی(درودی خودای لەسەربێت) بەچاوێکی پڕ لەسۆزو بەزەییەوە سەیری

کچەکەی کردو فەرمووی:

دوای ئەمڕۆ باوکت چیتر ئازار ناچێژێت!.

ئیتر دوای ئەمە فەرمان وکاری خودای مەزن وابوو موحەممەد(درودی خودای لەسەربێت) بگاتە خوداو پەروەردگار، فاتیمەی بێ باوك و بە غەمباری جێهێشت، ئیتر چۆن دڵی پڕ لە پەژارەی ئارام بگرێت و بسرەوێت.

ئەم کارەساتە مەزنە دڵتەزێنە، فاتیمەی بێ هۆش کردو بووراییەوە، تەنانەت دوای دوو شەو و دوو ڕۆژ هاتەوە هۆش خۆی، ئەو کاتە سەرجەم یاوەران لە (سەقیفە) پەیمانیان دابوو بەیاوەری ڕێزدار ئەبوبەکری صدیق(خودا لێیڕازیبێت) تا ببێتە جێنشینی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێت)، فاتیمە دوای بە هۆش هاتنەوەی هەوڵیداو هەموو هێزو توانای خۆی کۆکردەوە هەستا بەرەو گۆڕی پیرۆزی باوکی(درودی خودای لەسەربێت) چوو، ئەژنۆکانی توانای خۆ ڕاگرتنیان نەبوو، بەڵام هەرچۆنێك بێت گەیشتە سەر گڵكۆی پیرۆزی باوکی(درودی خودای لەسەربێت)،چنگی لەخۆڵی گۆڕەکە گرت و نزیکی کردەوە لە چاوە ئاوساوەکانی بەهۆی گریانەوە، تێر تێر بۆنی کردو بە دڵێکی پڕ لە ژان و تاسەو ئاواتەوە دەیگوت:

چۆنەبێ ئەو کەسەی خۆڵی ئەحمەدی بۆن کرد
ئایا بەدرێژایی ڕۆژگار نەهامەتی بۆن ناکات
کارەساتی وام بەسەرهاتووە گەر بەسەر
ڕۆژگار بهاتایە دەبوون بەشەوگار

ئیتر قوڵپی گریانی سەریکردو لە پرمەی گریانیدا، ئەو خەڵکەی دەوروبەری کاتێ بینیان خۆڵەکە لەناو پەنجەکانیدا بە نائومێدی دەڕژێتە خوارەوە خۆیان بۆ نەگیراو هەموویان بۆی گریان، پاشان سەیری ناو لەپی خۆی کرد بینی خۆڵەکەی تێدا نەماوە، ئیتر هەستا بە نائومێدی گەڕایەوەماڵەوە، خەڵك بەچاوی پڕ لە ئەسرین و بە دڵێکی پڕ لە خەفەت و پەژارەوە بەدوای ڕۆیشتن تا دەرگای

ماڵەکەیان.

ئەنەسی کوڕی مالیك(خودا لێیڕازیبێت) داوای چوونە ژوورەوەو چاو پێکەوتنی کرد، ڕێگای پێدرا، چووەلای ئامۆژگاری کردو داوای لێی کرد ئارام بگرێت و ئەوەندە خۆی هەراسان نەکات، بەڵام فاتیمە بە گلەییەوە وەڵامی دایەوە گوتی:

تۆ چۆن لەدڵت هات جەستەی پێغەمبەری خودا(درودی خودای لەسەربێت) بخەیتە ژێر خاکەوە.

ئەنەس خۆی بۆ نەگیرا لە پرمەی گریانیدا، ئیتر نە ئەو و نەکەسێکی تر لە توانایدا نەبوو دڵنەوایی و سەرەخۆشی لە فاتیمە بکەن، داوای لێبکەن لەئاست ئەم کارەساتە جەرگ بڕەدا ئارامگرو خۆڕاگربێت.

# کۆچی دوایی

دوای کۆچی دوایی باوکی(درودی خودای لەسەربێت)، فاتیمە غەمبارو چاو بەگریان بوو، هیچ هیوایەکی بە ژیان نەمابوو، ئەم فەرموودەیەی باوکی(درودی خودای لەسەربێت) هەمیشە لەیاد بوو، کاتێ پێش کۆچکردنی فەرمووی:

تۆ یەکەم کەسی لەدوای من دەگەیتەلام.

لەبەر ئەوەی ئەوەندە بێزارو بێ ئومێد بوو لە ژیاندا، بۆیە حەزیدەکرد بە زووترین کات بگاتەلای باوکی، تەنانەت ئارامی نەمابوو خۆیدابووە دەست شەپۆلەکانی دەریای غەم و پەژارەوە، زۆر زوو گەیشتە لای باوکی(درودی خودای لەسەربێت).

ڕۆژی دووشەممەی دووی ڕەمەزانی ساڵی یازدەی کۆچی، فاتیمە لە خەو هەستا، منداڵەکان و کەسوکار خۆی یەکەیەکە ماچ کردو تێر سەیری کردن، دوای ئەمە بە دەنگێکی کزو لاواز داوای لە (ئوم رافع)ی کارکەری ماڵی باوکی کردو گوتی: دایە

بمشۆ، ئیتر زۆر جوان خۆی شووشت، کراسێکی نوێی هەبوو لەبەر پرسەی باوکی بەلاومینابوو هیچ لەبەرخۆی نەدەکرد، بەڵام ئەمجارە هێنای لەبەرخۆی کرد، پاشان بە (ئوم رافع)ی گوت:

جێگاکەم لەناوەڕاستی ماڵەکەم بۆ ڕابخە!.

ئوم رافع جێگاکەی بەپێی خواستی ئەو بۆی ڕاخست، فاتیمە چووە سەر جێگاکە، ڕووەو (قیبلە) واتە ڕووی لە مەککە کردو ڕاکشا!، خۆی ئامادەکرد بۆ گەیشتن بە خودای مەزن و کاربەجێ و بە باوکی خۆشەویستی(درودی خودای لەسەربێت)، دوای ئەمە چاوەکانی لەیەکترناو گیانی خۆی بەخوا سپارد!!.

عەلی(خودا لێیڕازیبێت) بە گریانەوە تەرمی فاتیمەی هەڵگرت، لە گۆڕستانی(بەقیع) ناشتی، پاشان ماڵئاوایی لێ کردو بە دڵێکی پڕ لە تاسەو پەژارەو غەمەوە گەڕایەوە لای منداڵە بچکۆڵەکانی، گەڕایەوە بۆ ماڵێکی چۆڵ و خامۆش، ماڵێکی بێ فاتیمەی زەهرا.

موسڵمانان هەموویان بۆ مردنی دواترین کچی پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) زۆر پەرێشان و خەفەتباربوون، چونکە هێشتا برینیان تەڕبوو، هەتا شەش مانگ تێپەڕ نەبوو بوو بەسەر مردنی باوکی(درودی خودای لەسەربێت)، کاتێ فاتیمەی زەهرا(خودا لێیڕازیبێت) کۆچی دوایی کرد.

# ناوەڕۆك

